# مختصر صحيح البخاري

المسمى بـ:

# التجريد الصريح

دانراوی: أبی العباس زين الدين الزبيدی

به كوردی كردن و ليكۆلينه‌وه‌ی

نوری فارس حمه خان

به‌گوێره‌ی ته‌خريجی (د. مصطفی ديب البغا) ته‌خريج كراوه

محمود أحمد محمد

پێیدا چۆته‌وه‌و سه‌رپه‌رشتی له‌ چاپدانی كردووه

دار المعرفة
بيروت - لبنان

بسم الله الرحمن الرحيم

***************************************************

📖 ناوی کتێب: مختصر صحيح البخاری المسمی بـ( التجريد الصريح ).

📖 دانراوی: ابي العباس زين الدين الزبيدي.

📖 وەرگێرانی: نوری فارس حەمەخان.

📖 تیراژ ( ٢٥٠٠ ) دووهەزارو پێنج سەد دانـە.

📖 ژمارەی سپاردن: ( ٢٤٦٤ سالی ٢٠٠٩ ).

📖 سالی چاپ: ٢٠١٠ ز ١٤٣١ ك

📖 کۆمپیوتەرو هەڵە چنین: ( روبار حسین/کۆمپیوتەری شانیا )

# مُخْتَصَر صَحِيحْ الْبُخَارِي

المُسَمّى

# بِالتَّجْرِيد الصَّرِيحْ

دانراوى: أبى العباس زين الدين الزبيدى

به كوردى كردن و ليكۆلينه‌وه‌ى

نورى فارس حمه خان

به‌گوێره‌ى ته‌خريجى (د. مصطفى ديب البغا) ته‌خريج كراوه

محمود أحمد محمد

پێیدا چۆته‌وه‌و سه‌رپه‌رشتى له چاپدانى كردووه

2010 ز

1431 ك

به‌رگى دووه‌م

بسم الله الرحمن الرحيم

## باسی گەورەیی نوێژ لە مزگەوتی مەککەو مەدینەدا

٥٨٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ ، عَنِ النَبيّ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قالَ: (لاَ تُشَدُّ الرِّحَالُ إلاَّ إلى ثَلاَثَةِ مَساجِد: المَسْجِد الحَرامِ، وَمَسْجِد الرَّسُولِ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَمَسْجِد الأَقْصى). (الحَدِيث ١١٨٩)[1].

لە ئەبوهورەیرەوە (رەزای خوای لێ بێ) لەپێغەمبەرەوە -درودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: (تەنیا بۆ ئەم سێ مزگەوتە سەفەر دەکرێ: بۆ مەسجیدولحەرام لەمەککەو، بۆ مزگەوتی پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- لە مەدینەو، بۆ مەسجیدولئەقصا لەشاری قودس لە فەلەستین).

٥٨٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَة رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ : اَنَّ النَبِيّ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (صَلاَةٌ فِي مَسْجِدِي هَذا خَيْرٌ مِنِ أَلْفِ صَلاةٍ فِيما سِواهُ، إلاَّ المَسجِدالحَرامَ). (الحديث ١١٩٠)[2]

ئەبو هورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە -درودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: تەنیا مەسجیدول حەرامی لێ دەرچێ، یەك نوێژ لەم مزگەوتەی مندا لە هەزار نوێژ لەشوێنانی تردا خێرترە.

لە تاجول ئوصولا دەفەرموێ: بوخاری و موسلیم و تەرمەزی و ئیبنو ماجەیش ئەم فەرموودەیەیان گێڕاوەتەوە، ئیبنوماجە ئەمەیشی لێ پتركردووە: (وە یەك نوێژ لە مەسجیدولحەرامدا خێرترە لە سەدهەزار نوێژی شوێنانی تر). (بڕوانە: تاج/١ ل/٣٥٠ ز/١١٥).

---

(١) أخرَجَهُ مُسلِم في الحَج. باب: لا تشدّ الرحالُ إلاّ إلي ثلاثةِ مَساجد. رقم: ١٣٩٧.

(٢) أخرَجَهُ مُسلِم في الحَج. باب: فضل الصَّلاة بمَسجدَي مَكّة وَالمدِينَة. رقم: ١٣٩٤

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

مامۆستای عەسقەلانی -ڕەحمەتی خودای لێ بێ- لە فەتحولباری‌دا دەفەرموێ: (مەبەست لەمەسجیدولحەرام هەموو حەرەمی مەککەیە، تەنانەت نوێژکردن لەناو هەموو خانووەکان و بەشەکانی تری خاکی حەرەمدا، لەبارەی چەند بارەوەبوونی پاداشتەوە، دەق وەك نوێژکردن لەناو مەسجیدولحەرامدا وایە.. وە سەفەرکردن بۆ سەردانی گۆڕی پیرۆزی پێغەمبەر لەمەدینە بەرئەم نەهیە ناکەوێ، بەڵکوو شتێوا پیرۆز لەوکردەوە فرەباشانەیە کەدەبن بەمایەی شاد بوون بەرەزای خودای گەورەو مەزن، وەڕەوایی ئەوە بەبێ کێشەوبەرە ئیجماعی لەسەرە..) وەگلەیی لە ئیبو تەیمیە لەم مەسئەلەیەدا دەکا.

وەدەیش فەرموێ: (ئەمە بەس لەپاداشا وایە، بەلام بۆ گێڕانەوەو بریتی کەوتن و شتێوا، وانییە، چونکە کەسێ دوو نوێژی لەسەربێ، لەیەکێ لەم دوو مزگەوتەدا نوێژێ بکا هەربرێتی یەکێکیان دەکەوێ.. وەئەم چەند بارەوەبوونی پاداشە جگە لەهی جەماعەتە، کەئەویش بیست و حەوت پلەی پترە..). (بڕ: فەتح شەرحی فەرموودەی ژمارە: ١١٩٠، باسی گەورەیی مزگەوتی مەککەو مەدینە). لەژمارە (٩)دا گوترا: ئەبوهورەیرە لە بوخاری دا (٤١٨) فەرموودەی هەیە لە موقەددمەی فەتحولباری دا دەڵێ: لە بوخاریدا (٤٤٦) هەیە.

## باسی مزگەوتی قوباء

٥٨٨ - (عَنْ ابْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ كَانَ لاَيُصَلِّي مِنْ الضُّحَى إِلاَّ فِي يَوْمَيْنِ يَوْمَ يَقْدَمُ بِمَكَّةَ فَإِنَّهُ كَانَ يَقْدَمُهَا ضُحًى فَيَطُوفُ بِالْبَيْتِ ثُمَّ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ خَلْفَ الْمَقَامِ وَيَوْمَ يَأْتِي مَسْجِدَ قُبَاءٍ فَإِنَّهُ كَانَ يَأْتِيهِ كُلَّ سَبْتٍ فَإِذَا دَخَلَ

الْمَسْجِدَ كَرِهَ أَنْ يَخْرُجَ مِنْهُ حَتَّى يُصَلِّيَ فِيهِ قَالَ وَكَانَ يُحَدِّثُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَزُورُهُ رَاكِبًا وَمَاشِيًا) (الحديث ١١٩١– أطرافه في:١١٩٣، ١١٩٤، ٧٣٢٦)[٣].

قَالَ: وَكَانَ يَقُولُ: (إِنَّمَا أَصْنَعُ كَمَا رَأَيْتُ أَصْحَابِي يَصْنَعُونَ وَلَا أَمْنَعُ أَحَدًا أَنْ يُصَلِّيَ فِي أَيِّ سَاعَةٍ شَاءَ مِنْ لَيْلٍ أَوْ نَهَارٍ غَيْرَ أَنْ لَا تَتَحَرَّوْا طُلُوعَ الشَّمْسِ وَلَا غُرُوبَهَا). (الحديث ١١٩٢):

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر، کە ناسراوە بە ئیبنوعومەر (رەزای خوای لێ بێ) دەستووری وابوو تەنها لەم دوو ڕۆژەدا، لەکاتی چێشتەنگاودا نوێژی سوننەتی دەکرد: ئەو ڕۆژەی کەدەڕۆیشتنە ناوشاری مەککە، لەکاتی چێشتەنگاودا دەچووە ناوشار، جا لەپێشا دەچوو تەوافی بەیتی دەکرد، ئەوجا لەپشتی مەقامی ئیبراهیمەوە دوو ڕکات نوێژی سوننەتی دەکرد.

هەروا ئەو ڕۆژەیش کە دەچوو بۆ سەردانی مزگەوتی قوباو دیسان لەکاتی چێشتەنگاودا نوێژی سوننەتی دەکرد، چونکو ئیبنوعومەر (رەزای خوایان لێ بێ) هەموو شەممەیێ دەڕۆیشت بۆسەردانی مزگەوتی قوباو، جاکاتێ دەچووە ناو مزگەوتەکەوە حەزی نەدەکرد لێی دەرچێ، هەتا دووڕکات نوێژی سوننەتی تێدا نەکردایێ، فەرمووی: ئیبنوعومەر (رەزای خوای لێ بێ) دەیفەرموو: (جاران پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێ) هەموو شەممەیێ بە پێ، یا بەسواریی ولاخ دەچوو بۆسەردانی مزگەوتەکەی قوباو).

فەرمووی: ئیبنو عومەر (رەزای خوای لێ بێ) دەشی فەرموو: (ئەی نافیع ! ئەمەی من دەیکەم تەنیا ئەوەیە کە لەهاوڕێکانی خۆمم دیوە کردوویانەو

(٣) أخرجَهُ مُسلِم في الحَج. باب فضل مسجد قُباء وفضل الصلاة فيه وزيارته. رقم/١٣٩٩. وانظر مسلم: صلاة المسافرين وقصرها. رقم/ ٨٢٨.

بەس، وەرێگەی نوێژکردنی سوننەتیش لەکەس ناگرم، لەهەر کاتێکی شەودا، یا لەهەرکاتێکی ڕۆژدا، بۆ خۆی نوێژی سوننەت بکا، بەلاَم بەمەرجێ لەکاتی خۆرکەوتن و خۆر ئاوابووندا نەبێ).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

عەسقەلانی ڕەحمەتی خودای لێ بێ دەفەرموێ: (.. ئەوەی کە دەفەرموێ:.. لەکاتی چێشتەنگاودا ئیبنوعومەر نوێژی سوونںەتی دەکرد، هەڵدەگرێ کەمەبەست نوێژی سوونںەتی تەواف بێ، یامەبەست نوێژی سوونںەتی تەواف و سوونںەتی چێشتەنگاوبێ پێکەوە، چونکە کردنی ئەو نوێژە بەتایبەتی لەو کاتەدا بەلگەی ئەوەیە کەمەبەستی کردنی نوێژی چێشتەنگاو بێ. (بڕ: فەتح، فەرموودەی ژمارە ١١٧٦).

## باسی کەورەیی نێوانی گۆڕی پیرۆزی پێغەمبەرو مینبەرەکەی

٥٨٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، أَنَّ النَبِيّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (مابَيْنَ بَيْتِي وَ مِنبَري رَوْضَةٌ مِنْ رِياضِ الجَنَّةِ، وَمِنْبَرِي عَلَى حَوْضِي). (الحديث ١١٩٦ – أطرافُهُ في: ١٨٨٨، ٦٥٨٨، ٧٢٣٥).[٤]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) لەپێغەمبەرەوە -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: (لەنێوانی گۆڕەکەم و مینبەرەکەمدا، باخێکە لە باخەکانی بەهەشت، بارانی ڕەحمەتی لێ دەبارێت، خۆشی لەو کەسەی کەلەم شوێنە پیرۆزەی مزگەوتەکەما بەتایبەتی، خوداپەرستی جوان دەکا، وەئەم مینبەرەی ئێستاکەیشم، لەسەر حەوزی کەوسەرم، کەوا لە بەهەشتا، وەك خۆی

(٤) أخرجَهُ مُسلِم في الحَج.باب: مابينَ القَبرِ والمِنبَرِ رَوضَةٌ من رِياضِ الجَنةِ، رقم: ١٣٩١.

دادەنرێتەوە بۆم و، لە بەهەشتیشا وەك ئێستا لەسەری دادەنیشم و، پێشوازی لەهاتووانی ئۆمەتم دەکەم، کە بۆ نۆشین لەئاوی کەوسەر دێن بۆ سەری). (بڕ: تاج /١/٣٥٠).

## پایانی: خاتمة

مامۆستای عەسقەلانی - ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێ بێ - لە پایانی ئەم باسەدا دەفەرموێ:

(باسەکانی نوێژی تەطەووع و بابەتەکانی تەکی، سیی و چوار فەرموودەی بەرزەوە بوو (مەرفووع)ی لەخۆ گرتوە، دەیان بێڕشتە (معلق)ن و، ئەوانی تریان پەیوەستن، واتە مەوصوولن، لەم سیی و چوارە بیست و دوویان دووبارەن، پاڵفتەکەیان کەدووبارە نەبن دوازدەن. موسلمیش ڕەحمەتی خودای لێ بێ گشتیانی گێڕاوەتەوە، تەنیا ئەم سیانە نەبێ:

١. فەرموودەی ئیبنو عومەر: (قلتُ لآبن عُمَر أتُصلّي الضُّحى ؟ قالَ لا..) ژ/١١٧٥ ف.

٢. ٢ـ فەرموودەی عبدالله المزنی: (صَلّوا قَبْلَ صَلاةِ المَغرِب..) ژ/١١٨٣ ف

٣. ٣ـ فەلاموودەی عقبەی کوڕی عامر: (أتَيتُ عُقبَةَ بِن عامِر الجُهني..) ژ/١١٨٤.

٤. هەروا دەفەرموێ: یازدە بیستراویشی واتیادا.

### ڕاڤەو شیکردنەوە:

لەبەرئەوەی کەخوێنەری ئازیز بزانێ کەسەرچاوەی دیاریکردنی ژمارەی فەرموودەکانی هەر صەحابەیێ لەصەحیحی بوخاریدا کوێیە دەڵێم: وابەباش دەزانم کە موقەددیمەی فەتحولباری بکەین بەسەرچاوەی

ئەم بابەتە، چونکە بەئاسانی لەوێدا ژمارەکە دەدۆزێتەوە بۆکەسی خۆی، تەنانەت لێرەدا ئاماژە بۆ ئەو ناوانەیش دەکەین کە لەبەرگی یەکەمدا رۆیشتوون، بەپشتی خوا لەمەودوا بەپێی موقەدیمەی فتح الباری و بەپێی عەینی ژمارەکان تۆماردەکەین جا دەڵێین:

ئەم دوو هێمایە واتایان وایە:

(ع/١/٣٨-٢٢٨ = عومدەتولقاری، بەرگی یەکەم، لاپەرە- ٣٨، ژمارەی فەرموودەی ئەوکەسە (٢٢٨) فەرموودەیە بەپێی عەینی).

(م — ٢٤٢ = موقەددیمەی فەتحولباری، ژمارەی فەرموودەی ئەوکەسە بەپێی موقەددیمەی فەتحولباری (٢٤٢) فەرموودەیە. وەهەروەها. واتە (ع = عەینی = عومدەتولقاری) (م = موقەددیمەی فەتحولباری):

ژ -٣- عائیشە (ع/١/٣٨-٢٢٨). (م-٢٤٢).

ژ -٤- جابیری کوری عەبدوڵڵای ئەنصاری (ع/١/٦٥-٨٤). (م-٩٠).

ژ -٥- ئیبنو عەبباس (ع/١/٧٠-٢١٥. (م — ٢١٧).

ژ -٨- ابن عمر (ع/١١٦-٢٥١). (م—٢٧٠).

ژ -١٠- عەبدوڵڵای کوری عەمر (ع/١/١٣١-٢٥). (م-٣٦).

ژ -١١- ئەبو مووسای ئەشعەری (ع/١/١٣٥-٥٤). (م—٥٧).

ژ -١٣- ئەنەسی کوری مالیك (ع/١/١٤٠-٢٥١). (م-٢٦٨).

ژ -١٨- عوبادەی کوری صامیت (ع/١/١٥٣— ٨). (م—٩).

ژ -١٩- ئەبو سەعیدی خودری (ع/١/١٦١-٦٢). (م—٦٦).

ژ -٢٨-٣٠/ ئەبوذەری غیفاری (ع/١/٢٠٥-١٤). (م-١٤).

ژ -٢٩- ئەبوبەکرە (ع/١/٢٤٢-٣٧). (م-١٤).

ژ -٣٠- ئیبنو مەسعوود (ع/١/١١٥—٨٥). (م-٨٥).

ژ -٣٨- بەرائی کوڕی عازیب (ع/١/٢٤٢—٣٧). (م— ٣٨).

ژ -٤٣- طلحەی کوڕی عوبەیدوڵلا (ع/١/٢٦٥—٤). (م—٤).

ژ -٤٨- نوعمانی کوڕی بەشیر (ع/١/٢٩٦-٠). (م—٦).

ژ -٥١- ئەبو مەسعوود (ع/١/٣١٧—١٠). (م—١١).

ژ -٥٢- جەریری کوڕی عەبدوڵلا (ع/١/٣٢٣-١٠). (م-١٠).

ژ -٥٩- ئەبو واقدیدی لەیثی (ع/٢/٣٢-١). (م—١).

ژ -٦٣- معاوییه (ع/٢/٤٩-٨). (م-٨).

ژ -٦٨- مەحموودی کوڕی ڕەبیع (ع/٢/٧١-٠). (م—١).

ژ -٧٥- ئەسمائی کچی ئەبوبەکر (ع/٢/٩٣— ١٨). (م—١٦).

ژ -٧٦- عوقبەی کوڕی حاریث (ع/٢/١٠١-٣). (م-٣).

ژ -٧٩- زەیدی کوڕی خالید (ع/٢/١٠٨—٥). (م-٥).

ژ -٨٨- ئەبو شورەیح (ع/٢/١٣٩—٣). (م-٣).

ژ -٩٠- سەلەمەی کوڕی ئەکوەع (ع/٢/١٥٣—٢١). (م-٢٠).

ژ -١١٥/٩٤- ئوم سەلەمە (ع/٢/١٧٣-١٣). (م-١٦).

ژ -١٣٧/١١١- عەبدوڵلای کوڕی زەیدی ئەنصاری (ع/٢/٢٥١-٨). (م-٩).

ژ -١٣٩/١١٣- ئوسامەی کوڕی زەید (ع/٢/٢٥٨-١٧). (م—١٧).

ژ -١٤٤/١١٧- ئەبو ئەییوبی ئەنصاری (ع/٢/٢٧٦-٨). (م—٧).

ژ -١٥٣/١٢١- ئەبو قەتادە (ع/٢/٢٩٤-١٣). (م—١٣).

ژ -١٥٩/١٢٦- عثمان بن عفان (ع/٣/٥-١١). (م—٩).

ژ -١٨٢/١٣٧- مغير بن شعبه (ع/١/٣٢٤ + ع/٣/٦٢—٠). (م-١١).

ژ -١٨٧/١٤٠- ئەبو جوحەيفه (بڕوانه: ژماره -٢٤٠).

ژ -١٩٠/١٤١- سائيبى كەوڕى يەزيد (ع/٣/٧٧—٥). (م-٦).

ژ -٢٠٢/١٤٩- سەعدى كوڕى ئەبو وەقاص (ع/١/١٩٢—٢٠). (م-٢٠).

ژ -٢٠٤/١٥٠- عەمرى كوڕى ئومەييەى كوڕى ضەمرى (ع/٣/١٠٠-٢٠). (م-٢).

ژ -٢٠٩/١٥٣- سووەيدى كوڕى نوعمان (ع/٣/١٠٦—١). (م—١).

ژ -٢١٠/١٥٤- مەيموونەى كچى حاريث (ع/٣/١٠٧ + ٢/١٧٩- ؟). (م—٧).

ژ -٢٢٣/١٦٢- ئوم قەيسى كچى ميحصەن (ع/٣/١٣٢—٢). (م—٢).

ژ -٢٢٤/١٦٣- حوذەيفەى كوڕى يەمان (ع/٢/١٢-٢٠). (م—٢٢).

ژ -٢٤٣/١٧٤- سەهلى كوڕى ئەل— ساعيدى (ع/٣/١٨٣—٣٩). (م—٤١).

ژ -٢٥٤/١٨٤- جوبەيرى كوڕى موطعيم (ع/٣/٢٠٠-٩). (م—٩).

ژ -٢٨٠/١٩٤- ئوممو هانى كچى ئەبو طاليب (ع/٣/٢٣٣—٠). (م—٢).

ژ -٣١٣/٢٠٥- ئوممو عەطييه (ع/٣/٢٨١—٠). (م—٥).

ژ -٣٣٢/٢١٤- سەمموورەى كوڕى جوندوب (ع/٣/٣١٦—٤). (م—٣).

ژ -٣٣٧/٢١٨- ئەبوجوهەيمى كوڕى حاريثى صيممەى ئەنصارى (ع/٤/١٤—٢). (م—٢).

ژ -٣٣٨/٢١٩- عەبدورەحمانى كوڕى ئەبزا (ع/٤/١٧—١). (م-١).

ژ -٣٤٤/٢٢٠- عيمرانى كوڕى حوصەين (ع/٤/٢٦-١٢). (م—١٢).

ژ -٣٧٥/٢٣٩- عوقبەى كوڕى عاميرى جوهەينى (ع/٤/٩٧-٨). (م—٩).

ژ -٣٧٦/٢٤٠- ئەبوجوحەيفه (ع/٢/١٥٩ + ع/٤/٩٩-٤). (م-٧).

ژ -٣٩٠/٢٤٨- عەبدوڵلاى كوڕى ماليكى كوڕى بوجەينه(ع/٤/١٢٢-٠). (م—٤).

ژ -٤٥٣/٢٧٧- حەسانی کوڕی ثابت (ع/٤/٢١٧-١). (م-١).

ژ -٤٥٧/٢٧٩- کەعبی کوڕی مالیك (ع/٤/٢٢٨-٤). (م-٤).

ژ -٤٧٥/٢٩٠- عەبدوڵلای کوڕی زەیدی ئەنصاری (ع/٢/٢٥١-). (م-٩).

ژ -٥٤١/٣١٨- ئەبو بەرزە (ع/٥/٢٧-٤). (م-٤).

ژ -٥٥٣/٣٢٤- بورەیدەی کوڕی حوصەیب (ع/٥/٣٩-٣). (م-٣).

ژ -٥٥٩/٣٢٩- ڕافیعی کوڕی خەدیج (ع). (م-٤).

ژ -٥٦٣/٣٣١- عەبدوڵلای کوڕی موغەففەل (ع/٥/٥٩-٥). (م-٨).

ژ -٦٠٢/٣٤٩- عەبدورەحمانی کوڕی ئەبوبەکری صەدیق (ع/٥/٩٩-). (م-٣).

ژ -٦١٨/٣٥٩- حەفصەی کچی عومەری کوڕی خەطاب (ع/ ). (م-٥).

ژ -٦٢٨/٣٦٢- مالیکی کوڕی حووەیریث (ع/٥/١٤٢- ). (م-٤).

ژ -٧٣١/٤٠١- زەیدی کوڕی ثابیت (ع/٥/٢٦٥- ). (م-٨).

ژ -٧٤٦/٤٠٧- خەببابی کوڕی ئەرەتت (ع/٥/٣٠٤-٥). (م-٥) + (ژ/٦١٦).

ژ -٧٥٥/٤١٠- جابیری کوڕی سەمووره (ع/٦/٥-٢). (م-٢).

ژ -٧٩٩/٤٣٤- ریفاعەی کوڕی ڕافیعی ئەل- زورەقی (ع/٦/٧٤-٣). (م-٣).

ژ -٨٢٨/٤٤٤- ئەبوحومەیدی ئەل- ساعیدی (ع/٦/١٠٣-). (م-٤).

ژ -٨٣٤/٤٤٨- ئەبوبەکری صەدیق (ع/٦/١١٨- ). (م-٢٢).

ژ -٨٣٨/٤٥١- عیتبانی کوڕی مالیك (ع/٦/١٢٥-١). (م-١).

ژ -٩٠٧/٤٧٩- ئەبوعەبس عەبدورەحمانی کوڕی جەبره (ع/٦/٢٠٥-١). (م-١).

ژ -٩٢٣/٤٨٧- عەمری کوڕی تەغلیب (ع/٦/٢٢٦-٢). (م-٢).

ژ -١٠٨٣/٥٤٧- حاریثەی کوڕی وەهب (ع/٧/١٢١- ). (م-٤).

ژ -١١٠٤/٥٥٤- عاميرى كورِى رەبيعە (ع/١٤٨/٧-٤). (م- ).

ژ -١١٢٤/٥٦٠- جوندوبى كورِى عەبدوڵلا (ع /١٧١/٧). (م — ٨).

ژ -١٢٠٠/٥٩٠- زەيدى كورِى ئەرقەم (م-٦).

ژ -١٢٠٧/٥٩١- موعەيقيبى كورِى ئەبو فاطيمة (م-١).

ژ - ١٢٣٣/٥٩٧- عەبدورِرِەحمانى كورِى ئەزهەر (م-٠).

ژ -١٢٤٣/٦٠١- عوسمانى كورِى مەظمون (م-٠) + ئوم عەلاى ئەنصارييە (م/١).

ژ -١٢٦٩/٦٠٩- عەبدوڵلاى كورِى عەبدوڵلاى كورِى سەلوول.

ژ -١٢٧٦/٦١١- خەبابى كورِى ئەرەت (م-١٥) + موصعەبى كورِى عومەير.

ژ -١٢٨١/٦١٤- ئوم حەبيبە (م-٢).

ژ -١٤٩٧/٧٢٠- عەبدوڵلاى كورِى ئەبو ئەوفا (م-١٥). (ع/٩/٩٤-١٥).

ژ -١٤٩٠/٧١٦- عومەرى كورِى خەطاب (م-٦٠).

ژ -١٦٥٨/٧٨٨- ئوممەل فەضل، لوبابەى كچى حاريث (م-٢).

ژ -١٦٩٤/٧٩٩- ميسوەرى كورِى مەخرەمە (م-٨).

ژ -١٦٩٥/٧٩٩- مەروانى كورِى حەكەم (م-٢).

ژ -١٨١٥/٨٣٧- كەعبى كورِى عوجرە (م-٢).

بسم الله الرحمن الرحيم

## ٢٧- باسەکانی کارکردن لەناو نوێژدا

## باسی ئەوەی کە لەناو نوێژدا نەیی لێ دەکرێ

٥٩٠- عَنِ إبْنِ مَسعُودٍ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ قال: كُنا نُسَلِمُ علىالنَبِيِّ وَهُوَ في الصَّلاة، فَيَرُدُ عَلَينا، فَلَمّا رَجَعْنا مِنْ عِنْدِ النَّجاشيِّ، سَلّمْنا عَلَيْه فَلَمْ يَرُدَّ عَلَينا، وَقالَ: (إنَّ في الصَّلاةِ شغُلاً) الحَديث ١١٩٩- طَرَفاهُ في:١٢١٦، ٣٨٧٥ [٥]:

عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود، کەناسراوە بە ئیبنومەسعوود (رەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: (لەپێشدا لەناو نوێژدا سڵاومان لەپێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- دەکرد، ئەویش سڵاوەکەی وەڵام دەدایەوە، تا ئەوکاتەی کە لەلای نەجاشی پادشای حەبەشە گەڕاینەوە، ئیتر کە لەناو نوێژدا سڵاومان لێ دەکرد وەڵامی سڵاوەکەمانی نەئەدایەوە، جا عەرزیمان کرد: ئەی پێغەمبەری خودا ! جاران کە لەناو نوێژدا سڵاومان لێ دەکردیت، وەرامی سڵاوەکەت دەدایەوە، کەچی ئێستا وەڵامی نادەیتەوە، هۆی ئەمە چییە؟ فەرمووی -درودی خوای لەسەر بێ- : (بەڕاستی نوێژ خەریکبوونی گەرەکە، کەواتە: نوێژکەر لەناو نوێژەکەیدا دەبێ هەردڵی لای نوێژەکەی بێو بەس). (تاج/١/٢٢٠).

وَفِي رِواية عَن زَيْدِ بنْ أَرْقَمَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ قال: إنْ كُنَّا لَنَتَكَلَمُ في الصَّلاةِ، علَى عَهْدِ النَبّي صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُكَلِمُ أَحَدُنا صاحِبَهُ بِحاجَتِهِ، حتىَّ نَزلَتْ: (حَافِظُوا على الصَّلواتِ) الآيَة فَأُمِرْنا بِالسُّكُوتِ). (الحَديث١٢٠٠- طَرَفُهُ في: ٤٥٣٤):

---

(٥) أخرجَهُ مُسلِم في المَساجد ومَواضِع الصَّلاةِ، باب: تحريم الكَلام في الصَّلاة رَقم: ٥٣٨، ٥٣٩.

لەگێڕانەوەیەکا، لەزەیدی کوڕی ئەرقەمەوە (رەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: ئێمە لەپێشدا لەناو نوێژدا قسەمان لەگەڵ یەکتریدا دەکرد، هەتا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە کە دەفەرموێ: ﴿حَافِظُواْ عَلَى الصَّلَوَاتِ والصَّلاَةِ الْوُسْطَى وَقُومُواْ لِلّهِ قَانِتِينَ. البقرة /٢/٢٣٨﴾

واتە: بەباشی ئاگاداری هەموو نوێژە فەرزەکانتان بکەن، بەتایبەتی نوێژی ناسراو بە(الصَّلاة الوُسْطى) کە نوێژی عەصرە، وەلەناو نوێژدا بە سەرکزی و ملکەچی ڕاوەستن و، دەم بە زیکرو یادی خودا بن و لەکاری دنیایی و قسەی ئاسایی بەدوور بن).

ئیتر بەپێی ئەم ئایەتە فەرمانمان پێکرا بە بێدەنگی و خامۆشی لە نوێژاو، قسەکردنی ئاساییمان لێ قەدەغەکرا (تاج/١/٢١٩–ش/د/ت/ن).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

زەیدی کوڕی ئەرقەمی قەیسی ئەنصارییە خەزرەجییە، ماڵی ئەرقەمی باوکی، لەسەرەتای ئیسلامەوە بووبوو بەخانەی کۆبوونەوەی نهێنی موسوڵمانەکان، لە ڕۆژی غەزای ئوحوددا ویستی هاوبەشی ئەو جەنگە بکا، بەلاّم پێغەمبەر (رەزای خوای لێ بێ) ڕێگەی نەدا لەبەر ئەوەی کە بەمێردمناڵی دانا، یەکەم شەڕگە کە ئامادەی بووە خەندەق بووە، لەخزمەت حەزرەتدا حەڤدە غەزای کردووە، فەرموودەی زۆری پێغەمبەری گێڕاوەتەوە، بەتایبەتی لەئیمامی عەلیەوە، بەڵکو دادەنرێت بە یەکێك لە خۆشەویستەکانی عەلی.

ئەم زاتانە فەقێ بوون، فەرموودەیان لێیەوە گێڕاوەتەوە: ئەبو طوفەیل و ئەبو عوسمانی ئەل– نهدی و ئیبنو ئەبی لەیلاو طاووس و کەسانی تریش.

لەصەحیحی سوننەتدا داستانێکی هەیە سەبارەت بەسوورەتی (المنافقون). لەگەڵ ئیمامی عەلیدا (رەزای خوای لێ بێ) ئامادەی ڕووداوی (صەفین) بوو، ساڵی (٦٦) یان (٦٨) ك، لەسەردەمی (المختار) دا لە (کووفە) مردووە.

جارێ گوێی لێ دەبێ عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی هەڕەشە لە پێغەمبەرو موسوڵمانان دەکاو دەڵێ: (ئەگەر گەڕاینەوە بۆ مەدینە، دەستەی من و دەستەی موحەممەد، کاممان ئازاترو تواناتر بوو، دەستەی داماو لەمەدینە وەدەردەنێ!) جا ئەمە دەگێڕێتەوە بۆ پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- پێغەمبەریش -درودی خوای لەسەر بێ- لەعەبدوڵڵا دەپرسێ کە شتی وای گوتووە ؟ ئەویش سوێندی خوارد کەشتی وای نەگوتووە، پێغەمبەریش باوەڕی پێ دەکاو باوەڕ بەقسەکەی زەید ناکا، تا لەئەنجامدا خودا ئایەتی ناردە خوارەوە ڕاستی قسەی زەیدی چەسپاندو قسەی ئیبنوسەلوولی بەدرۆخستەوە (بڕوانە: تاج/٧ ل/ ١٩٨ ف/١).

## باسی تەخت کردنی چەوو شتی وا لەجێگەی کوڕنووش دا

٥٩١- عَنْ مُعَيْقِب رَضِي اللَّهُ عَنْهُ، أنَّ النَّبي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: فى الرَّجُلِ يُسَوِّى التُراب، حَيثُ يَسْجُدُ، قَالَ: (إنْ كُنْتَ فاعِلاً فَواحِدَةً) (الحديث ١٢٠٧)[٦].

موعەقیب (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەپێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- پرسیارکرا: لەناو نوێژدا، ئەگەر کەسێ، لەجێگە سوژدەکەیدا، چەوو خۆڵ ڕێك بخاو، بەدەستی، خۆڵ و چەوی شوێن کوڕنووشەکەی تەخت بکا، دروستە یان نا ؟ فەرمووی -درودی خوای لەسەر بێ-: (ئەگەر شتی واتکرد، یەکجار بیکەو بەس) واتە: بەیەکجار دەست پیاداهێنان چەوەکە ڕێك بخە.

(٦) أخرَجَهُ مُسلِم في المساجد وَمَواضِع الصَلاة، باب: كراهة مَسحِ الحَصي وَتسوِيَة التراب، رقم: ٥٤٦.

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

١- وەك لەشەرحەكانی فەرموودەكەوە دەردەكەوێ، لەم جۆرە شوێنانەدا، جیاوازی ژن و پیاو نییە، ناوهێنانی پیاو لەم جۆرە شوێن و پرسیارانەدا، لەبەر زۆرینەییە، واتە: تغلبیە، دەنا هەم بۆ پیاوو هەم بۆ ژن دروستە كە لەناو نوێژدا، نارێكی كورنووشگاكەی رێك بكا، ئەگەر بەهۆی خۆڵ و زیخ و چەوەوە بەرزو نزمی تیادابوو.

٢- موعەقیبی كوڕی ئەبو فاطیمی دەوسی، لەموسوڵمانە هەرە پێشینەكانە، لەمەككە موسوڵمان بووە، لەوێوە كۆچی دووەمی كردووە بۆ حەبەشە، لەوێ مایەوە هەتا پێغەمبەر ـدروودی خوای لەسەر بێـ كۆچی فەرموو بۆ مەدینەی نازدار، جا ئەویش لەحەبەشەوە تەشریفی برد بۆلای پێغەمبەر ـدروودی خوای لەسەر بێـ ئامادەی پەیمانی بەیعەتو ڕیضوان بوو، هەروا هەموو مەشاهیدو مەڵبەندەكانی تری پاش ئەو، چاودێری سەر ئەموستیلەكەی پێغەمبەر بوو، فەرموودەی كەم گێڕاوەتەوە، لە سەردەمی جێنیشنی ئەبوبەكرو عومەردا ـرەزای خوایان لێ بێـ موعەقیب سەركاری سەر بەیتولمال بوو. ئەو ئەموستیلەیەی پێغەمبەر ـدروودی خوای لەسەر بێـ كەكەوتە لای ئیمامی عوسمان و ئیمامی عوسمان زۆرزۆر تەباروكی پێوەی دەكرد، بەدەست ئەمەوەبوو، كەكەوتە ناوبیری ئەریسەوە، كە عوسمان ئەمەی لەلا زۆر ناخۆش و زەحمەت بوو، وەهەوڵ و تەقەلایەكی بێ ماندوو بوونیدا، بۆ دۆزینەوەی، بەلاَم ڕەشەڕا هات و نەدۆزرایەوە، ئیتر بەرەبەرە دوو بەرەكی و ناكۆكی و ناتەبایی سەری هەڵدا، وەهەتا ئەمرۆكەیش بەردەوامە. خوای گەورە پەنامان بدا، لە ئاخرو ئۆخری جێنشینیی پێشەوا عوسماندا مەرگ بوو بەمیوانی و فەرمانی هەقی بەجێ هێنا (رەزای خوای لێ بێ) ئامین.

## باسی: ئەگەر وڵاخەکەی لەناو نوێژەکەیدا خۆی ڕادەپسکان چی بکا؟

٥٩٢- عَن شُعْبَة -رَحِمَه اللّه تَعالى- قالَ: حَدَّثَنا الأَزْرَقُ بْنُ قَيْس قال: كنا بالأهواز نُقاتِل الحَرُورِيَة، فَبَيْنما أنا على جُرُف نَهْر، إذا رَجُلٌ يُصَلِّي، وَإذا لِجامُ دابَّته بِيَدِهِ، فَجَعَلَتِ الدابَّةُ تُنازِعُهُ، وَجَعَلَ يَتْبَعُها، قالَ شُعْبَةُ: هُوَ أبو بَرزَةَ الأسْلَمِيُّ، فَجَعَلَ رَجُلٌ مِنَ الخَوارِج يَقُولُ: اللَّهُمّ افْعَلْ بِهذا الشَّيْخ، فَلَمَّا انْصَرَفَ الشَّيْخ قالَ: إنِّي سَمِعْتُ قَوْلَكُم، وَإنِّي غَزَوْتُ مَعَ رَسُولِ اللّه صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سِتَّ غَزَواتٍ أو ثَمانَ، وَشَهِدْتُ تَيْسِيرَهُ، وَإنِّي إنْ كُنْتُ أَن أُراجِعَ مَعَ دابَّتِي، أَحَبُّ إِلَيّ مِنْ أَنْ أدَعَها تَرْجِعُ إلى مَألَفِها، فَيَشُقُّ عَلَيّ. (الحديث ١٢١١ - طَرَفُهُ في: ٦١٢٧):

شوعبە (رەزای خوای لێ بێ): ئەزرەقی کوڕی قەیس گێڕایەوە بۆمان فەرمووی: لە وڵاتی ئەهواز بووین، لەگەڵ خەواریجەکان دا دەجەنگاین، جارێ لەسەر ڕووباری کەنارێ بووم، لەو دەمەدا دیم کەوا پیاوێك نوێژ دەکاو، لغاوی وڵاخەکەی وابەدەستیەوە، وڵاخەکەیشی هەر بۆلای خۆی ڕای دەکێشاو، ڕاکێش ڕاکێشی بوو لەگەڵیدا، ئەویش ناوبەناو کەمێ خۆی بۆ شل دەکردو دەرۆیشت لەگەڵی، شوعبە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: (ئەم نوێژخوێنە ئەبو بەرزەی ئەسلەمی بوو، کەهاوەڵی پێغەمبەرە).

کابرایەکی خەواریجیش دەستی کرد بەقسە پێکردنی و گوتی: نوێژ چۆن وادەبێ، دەی خودایە واوای لێ بکەی !

جا کەپیرەمێرد لەنوێژەکەی بۆوە فەرمووی: (گوێم لەقسەو ڕەخنەکانت بوو، بەلاّم من خۆم شەش غەزا، یاهەشت غەزام لەگەڵ پێغەمبەر خۆیدا (رەزای خوای لێ بێ) کردووەو، خۆم بەچاوی خۆم دیومە کەتا چی ڕادەیێ کاری بۆمان ئاسان دەکرد، نەك گران، بەتایبەتی لەحاڵی وادا.)

ئەوجا فەرمووی: (دەی من ئەوەم پێ باشترە کە کەمە کەمە ولاخەکەم بەکێشم بکاو لەناو نوێژەکەدا کەمێ لەگەڵیدا بڕۆم، هەتا ئەوەی کە بەرەلای بکەم و بگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە خۆم تووشی سەخڵەتی بکەم).

٥٩٣ – عَنْ عائِشةَ رَضِي اللّٰهُ عَنْها قالَتْ: خَسَفَت الشَّمْسُ، فَقَامَ النَبِيّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فقرَاَ سُورَةً طَوِيلَةً، ثُمَ رَكَعَ فَاَطَالَ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ، ثُمَّ إستَفْتَحَ بِسُوْرَةٍ أُخرى، ثُمَّ رَكَعَ حِينَ قَضَاها، وَسَجَدَ، ثُمَّ فَعَلَ ذلِكَ في الثانِيَةِ ثُمَ قالَ: (إنَّهُما آيتان مِنْ آياتِ اللّٰهِ، فَإذا رأيْتُمْ ذلِكَ فَصَلُّوا، حَتَّى يُفرَجَ عَنْكُم، لَقَدْ رَأَيْتُ في مَقامِي هذا كُلَّ شَيْءٍ وُعِدْتُهُ، حَتَّى لَقَد رَاَيْتُنى أُريدُ أَنْ آخُذَ قِطْفاً مِنَ الجَنَّةِ، حِيْنَ رَاَيْتُمُوني جَعَلْتُ أَتَقَدَّمُ، وَلَقَدْ رَأَيْتُ جَهَنَّمَ يَحْطُمُ بَعْضُها بَعْضاً، حِينَ رَاَيتُمُوني تَاَخَرْتُ، وَرَاَيتُ فِيها عَمْرو بْنَ لُحيّ، وَهُوَ الذّى سَيَّبَ السَّوائِبَ). (الحديث ١٢١٢ )[٧]:

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەسەرینێی پێغەمبەر -درووودی خوای لەسەر بێ- خۆر گیرا، پێغەمبەر -درووودی خوای لەسەر بێ- هەڵسایەوە، دوو ڕکات نوێژی خۆرگیرانی کرد لەسەر ئەم شێوەیە: لەپێشدا لەدوای فاتیحە، لەڕکاتی یەکەمدا سوورەتێکی درێژی خوێند، ئەوجا چوو بۆ چەمینەوەو لەچەمینەوەشدا زۆرمایەوەو نزاو ویردی زۆری لە رکوعدا خوێند، ئەوجا سەری بەرزەوە کردو ڕێك ڕاوەستایەوەو دەستی کردەوە بە خوێندنی سوورەتێکی تر، جا کە رکاتەکەی تەواوکرد چوو بۆ چەمینەوەو ئەوجا کوڕنووشی برد، ئەوجا لە ڕکاتی دووەمیشدا هەمان شتی کردەوە، لەپاشدا وتارێکی داو تیادا فەرمووی:

(٧) أخرجه مسلم في كتاب الكسوف في الصلاة، بوُجُوهٍ مُختلِفَةٍ انظر صحيح مسلِم بشرح النووي ج/٦ ص ١١٩ – ٢١٨.   -المترجم-

(لەڕاستیدا ئەم خۆرو مانگە دوو نیشانەی گەورەن، لەنیشانە گەورەکانی خودا، کە دەبن بەبەلگە لەسەر یەکێتی و تەوانایی بێسنووری پەروەردگار، هەر وەك دەبن بەبەلگەو نیشانەی چاوترسێنەر بۆ بەندەکان، جا ئەگەر دیتان شتی وا ڕوویدا، ئەوا لەخودا بپاڕێنەوەو نوێژ بکەن، خێرو خێرات بکەن، هەتا دەرووتان بۆ دەکرێتەوەو خۆرەکە یان مانگەکە بەردەبێ، لەڕاستیدا لەم مەقامەمدا، هەموو ئەو بەڵێنانەی کە پێم دراون بینیمن، ئەو کاتەی کە منتان بینی خەریکبوو بچمە پێشەوە، ئەوە وابەهەشتیان پێ نیشاندام ووالێیان نزیك کردمەوە، تەنانەت قرمم لێ خۆش کردو دەستم برد کە بۆلێ ترێ ی لێ بهێنم ! ئەو کاتەیش کە دیتان وامن پاشەو پاش دێمە دواوە، ئەوە دۆزەخیان پێ نیشاندام، وا تاوی سەندبوو، بەشەکانی لەناو خۆیانا یەکیان دەخواردو یەکتریيان دەپلیشانەوە ! لەناویدا عەمری کوڕی لوحەییم بینی، بەناو ئاگرەکەدا ریخۆڵەی خۆی بەکێش دەکرد، چونکە ئەو یەکەم کەس بووکە وشترە مەرەخەسی داهێنا).

## راڤە و شیکرنەوە:

بەپێی شەرحەکان ئەم بەهرانە لەم فەرموودەیە وەردەگرین:

١. کاری کەم لەناو نوێژا پوچی ناکاتەوە.

٢. بەهەشت و دۆزەخ حاڵی حازر دروستکراون و هەن، بگرە هەندێ لە تاوانباران وان لەناو دۆزەخ دا سزا دەدرێن.

٣. لەپێش هاتنی ئیسلامدا، هەندێ کەس دەیانگوت: ئەگەر لەم نەخۆشیە چاك بومەوە، یا لەم سەفەرە بەساغ و سەلامەتی گەڕامەوە، یا ئەو مرازەم هاتەدی، ئەوا ئەو وشترەم مەرەخەس بێ، ئیتر بەم

جۆرە وشترەیان دەگوت (سائبە) کە جەمعەکەی (سوائب)ە، ئیتر ئەو وشترە بۆ خۆی بەڕەڵا دەبوو، نە باریان لێ دەنا، نە سواری یان پێ دەکرد، بۆ ئاو و لەوەڕیش مەرەخەس بوو، هیچیان لێ قەدەغە نەدەکرد.

## لەناو نوێژدا وەڵامی سڵاو نادرێتەوە

٥٩٤ – عَنْ جابِرِ بن عَبدِاللهِ رضي الله عنهما قالَ: بَعَثَني رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ في حَاجَةٍ لَهُ، فَانْطَلَقْتُ، ثُمَّ رَجَعْتُ وَقَد قَضَيْتُها، فَأَتَيْتُ النَبيَّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَسَلَمْتُ عَلَيْهِ فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيَّ، فَوَقَعَ في قَلْبِي ما اللهُ اعلَمُ بِهِ، فَقُلْتُ في نَفْسِي: لَعَلَّ رَسُولَ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَجَدَ عَلَيَّ اَنِّي اَبْطَأتُ عَلَيْه ؟ ثُمَّ سَلَّمْتُ عَلَيهِ فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيَّ، فَوَقَعَ في قَلْبِي أَشَدُ مِنَ المَرَّةِ الأُولى، ثُمَّ سَلَّمْتُ عَلَيهِ فَرَدَّ عَلَّي، فقَالَ: (إنَّما مَنَعَني أَنْ أَرُدَّ عَلَيْكَ أَنّي كُنْتُ أُصَلِّي). وَكَانَ عَلى رَاحِلَتِهِ، مُتَوَجِهاً إِلى غَيْرِ القِبْلَةِ (الحَديث ١٢١٧): [٨]

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- ناردمی بۆ کارێکی خۆی، منیش چووم کردم و هاتمەوە بۆ لای پێغەمبەرو سڵاوم لێکرد، بە دەستی ئاوایەکی کرد، بەڵام بەگوتن وەڵامی نەدامەوە، منیش لەبەرئەوەی لە ئاماژەکەی پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- حاڵی نەبووم، ئەوەی کە هەر خوا خۆی باشتر ئاگای لێیەتی هات بە دڵما، جا لەدڵی خۆما گوتم: ڕەنگە پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- لەسەر ئەوە لێم زوێر بووبێ چونکە دڕەنگ هاتمەوە بۆ خزمەتی ؟ دیسان سڵاوم لێ کردەوە، دیسانەوە سڵاوی نەدامەوە، ئەمجارەیان لە جاری یەکەم زیاتر خەم

(٨) اخرجَهُ مُسلِم في المَساجد ومَواضِع الصَلاة، باب: تحريم الكَلام في الصَلاة، رقم: ٥٤٠.

دایگرتم و دڵم سەخڵەت بوو، لەجاری سێیەما کەسڵاوم لێکرد، وەڵامی دامەوەو فەرمووشی: (ئەوە مەشغووڵی نوێژ بووم، بۆیە وەڵامی سڵاوەکەتم نەدایەوە).

جابیر فەرمووی: لەو کاتەدا بەڕێوە بوو، بەسواری وڵاخەکەی بوو، لەو کاتەدا ڕووشی لە ڕووگە (قیبلە) نەبوو.

## نەهی کراوە لە دەست گرتن بە کەلەکەوە لەناو نوێژدا

٥٩٥- عَنْ أَبي هُرَيرَة رَضِي اللَّهُ عَنْهُ قال: نُهِيَ اَنْ يُصَلِّيَ الرَّجُلُ مُخْتَصِراً (الحديث ١٢٢٠ – طَرَفُهُ في ١٢١٩)[٩]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) نەهی کردووە لەوە، کە مرۆڤ، چ پیاوو، چ ژن، لەناو نوێژا، دەست بگرێ بە هەردوو کەلەکەیەوە.

### ڕاڤە و شیکرنەوە:

دەست گرتن بەکەلەکەوە ئەوەیە کە مرۆڤ هەردوو دەستی لەسەر هەردوولا کەلەکەی و ئانیشکەکانی لەلا قەبرغەی دووربخاتەوە، لەسەر شێوەی نیوە بازنەیی. ئەم کارەیش بۆیە ناباشە چونکە ڕەفتاری دەعیە زلەکانە، گەڵێ جار ماتەمدارو خەمبارەکانیش وادەکەن. دەڵێن: جوولەکەیش زۆر وادەکەن.

---

(٩) أخرجَهُ مسلِم فِي المساجد وَمَواضِعِ الصَّلاة، باب كراهة الإختصار في الصلاة، رقم: ٥٤٥.

بسم الله الرحمن الرحيم

# ٢٨ـ باسەكانی هەڵەی ناو نوێژ (أبْوابُ السَّهْو)

## باسی ئەوە: ئەگەر نوێژ خوێن بەهەڵە پێنج ڕكاتی كرد

٥٩٦- عَنْ عَبْدِاللّهِ بِنْ مَسْعُودٍ رَضِي اللّهُ عَنْهُ: أَنَّ رَسُولَ اللّهِ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ صَلّى الظّهْرَ خَمْسَاً، فَقِيْلَ لَهُ: أَزِيدَ في الصَّلاةِ؟ فَقالَ: (وَمَا ذَاك ؟) ؟ قَالَ: صَلّيْتَ خَمْسَاً، فَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ بَعْدَ مَا سَلّمَ (الحَديث ١٢٢٦ )[10]:

عەبدوڵڵای كوڕی مەسعوود (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- وێژی نیومڕۆی بەجەماعەت بۆ یارانیكرد، لەجیاتی چوارڕكات پێنج ڕكاتی كرد، عەرزی كرا: ئەی پێغەمبەری خوا ! خێربوو وا پێنج ڕكاتت كرد، ئایا نوێژی نیومڕۆ ركاتێكی لێ زیادكراوە ؟ فەرمووی: (كوا شتی وابووە) پرسیاركەرەكە گوتی: تۆ ئێستا لەباتی چوارڕكات پێنج ڕكاتت كرد، ئەوجا پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- لەپاش سڵاودانەوە دوو كوڕنووشی هەڵەی برد، نوێژكەرەكانی تریش لەگەڵیدا ئەو دوو كوڕنووشەیان برد.

## ئەگەر نوێژ خوێن قسەی لەگەڵدا كراو گوێی لەقسە گرتو بەدەست ئاماژەی كرد: كە نوێژ دەكەم، نوێژەكەی پووچ نابێتەوە !

٥٩٧- عَنْ كَرَيْبٍ رَحِمَهُ اللّهِ تَعالى: أَنَّ ابْـنَ عَبَّـاسٍ وَالِمسْوَرَ بْـنَ مَخْرَمَـةَ وَعَبْدَالرَّحْمنِ بْنَ ازهَرَ، رَضِي اللّهُ عَنْـهُ، ارسَلُوهُ إِلى عائِشة، رَضِـي اللّـهُ عَنْـهُ فَقَالُوا، إِقْرَأْ عَلَيْهَا السَّلامَ مِنَّا جَمِيعَاً، وَسَلْها عِنِ الـرَّكْعَتَينِ بَعْـدَ صَـلاةِ العَـصْرِ، وَقُلْ لَهَا: إِنَّا أُخبِرْنا أَنَّكِ تُصَلّيْنَّهما، وَقَدْ بَلَغَنَا أَنَّ النبيَّ صَـلّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلّمَ

---

(١٠) أخرجَهُ مُسلِم في الصَلاة، انظر (العيني /٣١٥/٧، فتح /١٣٠/٣- خاتمة، صحيح مسلم بشرح النووي ج/٦ ص١١٩ مبحث الأوقات التي نهي عن الصَلاة فيها، دار إحياء التراث العربي. بيروت. لبنان). —المترجم-

نَهى عَنْها، وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: وكُنْتُ أضْرِبُ النَّاسَ مَعَ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ عَنْهَا، فَقَالَ كُرَيبٌ: فدخلت على عائشة رَضِي اللّهُ عَنْها، فَبَلَّغْتُهَا ما أَرْسَلُونى، فَقالَتْ: سَلْ أُمَّ سَلَمَةَ، فَخَرَجْتُ إِلَيْهِمْ، فَأَخْبَرْتُهُمْ بِقَوْلِها، فَرَدُّونِى إِلى أُمِّ سَلَمَةَ بِمِثْلِ ما أَرْسَلُونى بِهِ إِلَى عائِشَةَ. فَقَالَتْ أُمُّ سَلَمَةَ رَضِي اللّهُ عَنْها: سَمِعْتُ النَّبِىَّ صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَنْهَى عَنْها، ثُمَّ رَئَيْتُهُ يُصَلِّيهِما حِيْنَ صَلَّى العَصْرَ، ثُمَّ دَخَلَ وَعِندِى نِسْوَةٌ مِنْ بَنِى حَرَام مِنَ الأنصَارِ، فَأَرْسَلَتُ إِلَيْهِ الجَارِيَةَ، فَقُلْتُ: قُومى بَجَنْبِهِ، قُولِى لَهُ: تَقُولُ لَكَ أُمُّ سَلَمَةَ: يارَسُولَ اللّهِ، سَمِعْتُكَ تَنهْى عَنْ هَاتَيْنِ، وَأَراكَ تُصَلّيهِمَا؟ فَإِنْ أَشَارَ بِيَدِهِ فَاستَأخِرى عَنْه، فَفَعَلْتِ الجارِيَةُ، فَأَشَارَ بِيَدِه، فَاستَأْخَرَتْ عَنْهُ، فَلَمَّا أنصَرَفَ، قَالَ: (يَابِنْتَ أَبِى أُمَيَّةَ، سَأَلْتِ عَنِ الرَّكْعَتَيْنِ بَعْدَ العَصْرِ، وَ إِنَّهُ أَتَانِى نَاسٌ مِنْ عَبْدِالقَيْسِ، فَشَغَلُونِى عَنِ الرَّكعَتَينِ اللَّتَيْنِ بَعْدَ الظُّهْرِ فَهُما هاتان). ( الحديث ١٢٣٣ - طَرَفُهُ في: ٤٣٧٠)[١١]:

کورەیب (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئیبنوعەباس و میسوەری کوڕی مەخرەمەو عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەزهەر، ئەم سێ هاوڕێیەی پێغەمبەر درودی خوای لەسەر بێ منیان نارد بۆلای عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر درودی خوای لەسەر بێ فەرموویان بچۆ بۆ خزمەتی، سلاوی هەموومانی عەرز بکە، وە لەبارەی کردنی دووڕکات نوێژی سوونەت لەپاش فەرزی عەصرەوە پرسیاری لێ بکە، عەرزی بکە لەزمانی ئێمەوە، کە ئێمە هەواڵمان پێ دراوە، کە تۆ ئەو دووڕکاتە سونەتە دەکەی، وەلحاڵ ئێمە پێمان گەیشتۆتەوە کەپێغەمبەر درودی خوای لەسەر بێ نەیی لەم نوێژە کردووە، سەرەڕای ئەمەیش ئیبنو عەباس (رەزای خوای لێ بێ) فەرموی: وەمن خۆم لەگەڵ ئیمامی عومەردا، لەسەرکردنی ئەم نوێژە لەپاش عەصر، لەخەڵکم دەدا، جا کورەیب فەرمووی: جا چووم بۆماڵی عائشە (رەزای خوای لێ بێ) پەیامەکەی ئەوانم پێ ڕاگەیاند، فەرمووی: لە ئوم سەلەمەی

(١١) أخرجه مسلم في الصلاة المسافرين وقصرها، باب: معرفة الركعتين اللتين كان يصليهما... رقم: ٨٣٤

هاوسەری پێغەمبەر لەم بارەیەوە بپرسە، هەواڵی تەواو لای ئەوە، منیش چوومەوە بۆ خزمەتی ئەوان و قسەکەی عائیشەم پێگوتن، جا لەسەرهەمان شێوەی کە ناردمیان بۆلای عائیشە، ناردمیشیان بۆ خزمەتی ئوم سەلەمە، ئوم سەلەمە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەپێغەمبەر خۆیم دەبیست کەنەهی دەکرد لەم نوێژە، کەچی ڕۆژی دیتم کاتێ لەکردنی نوێژی عەصر بۆوە تەشریفی هات بۆماڵەوە لەماڵەوە دووڕکات نوێژی لەپاشیەوە کرد، لەو کاتەدا کۆمەڵێ ئافرەتی ئەنصاریم لەلا بوون، کە لەخێڵی بەنی حەرام بوون، لەبەرئەوە خۆم لێیم نەپرسی، بەڵکوو کارەکەرەکەم نارد بۆ خزمەتی و پێم گوت: لەتەنیشتیەوە ڕابوەستەو عەرزی بکە: کە ئوم سەلەمە عەرزت دەکا: ئەی پێغەمبەری خوا ! من لەخۆتم بیستووە کە نەیی دەکەی لەکردنی ئەم دوو ڕکاتە لەم کاتەدا، کەچی ئەوەتا خۆت دەیانکەی ؟ بە کەنیزەکەم گوت: جا ئەگەر بەدەستی ئاماژەی بۆ کردی کەکاتی ئەوە نییە، بچۆرە دواوەو وازی لێ بهێنە، کەنیزەکەکەش ڕێك وایکردو ئەویش لەناو نوێژەکەدا، کە لە پرسیارەکە حاڵی بوو بەدەستی ئاماژەی کرد، ئیتر کارەکەرەکە ڕۆیشتە دواوەو پێغەمبەری بەجێ هێشت، کاتێ لە نوێژەکەی بۆوە، فەرمووی درودی خوای لەسەر بێ: (ئەی کچی ئەبو ئومەییە ! لەم دوو ڕکاتە نوێژە سوننەتە دەپرسیت، کە ئێستا لەپاش نوێژی عەسرەوە من کردمن، ئەمە دوو ڕکاتە سوننەتەکەی دوا نوێژی نیوەڕۆ بوو ئێستا گێڕامنەوە، چونکە لەکاتی خۆیاندا نەم پەرژا کە بیانکەم، بەهۆی خەریکبوونم لەگەڵ وەفدەکەی هۆزی عەبدول قەیسی دا کە هاتبوون ئیسلام ببن و ببن بە نوێنەری هۆزەکەیان).

## ڕاڤە و شیکرنەوە:

عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەزهەر برازای عبدالرحمنی کوڕی عەوفە، لە صەحابە گەنجەکانە، لە ساڵی فەتحدا، ڕەسیدە بوو، لەگەڵ پێغەمبەردا ئامادەی غەزای حونەین بوو.

بسم الله الرحمن الرحيم

# ٢٩ـ نامەی تەرم: كتابُ الجَنائز

## باسی ئەو کەسەی لە سەرەمەرگدا دوا وشەی ﴿لا إله إلاّ الله﴾ بێ

(بڕوانە: تاج/١/٥١٦ ز/١٩١ تا — ٢٢٩ - باسی تەرم)

٥٩٨— عَنْ اَبي ذَرّ رَضِيِ اللّٰهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ صَلّٰى اللّٰـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ: (اَتاني آتٍ منْ رَبِّي فَأَخْبَرَني، أَو قَالَ: بَشَّرَني، أَنَـهُ مَـنْ مـاتَ مِـنْ أُمَّـتي لايُشْرِك بِاللهِ شيئاً دَخَلَ الجَنَّة). قُلْتُ: وَ إِنْ زَنَى وَ إِنْ سَـرَق؟ قَـالَ (وَ إِنْ زَنَـى وَإِنْ سَـرَق).(الحَـديث ١٢٣٧— أطرافُـهُ في ١٤٠٨، ٢٣٨٨، ٣٢٢٢، ٥٨٢٧، ٦٢٦٨، ٦٤٤٣، ٦٤٤٤، ٧٤٨٧ )[١٢]

ئـەبوذەر (رەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فـەرمووی: (لەتەرەفی پەروەردگارمەوە، لـە خـەودا، جوبرائیـل تەشـریفی هـات بـۆلام، ئەم موژدە خۆشەی داپێم: هەرکەسێ لەگەڵی ئیسلامی من لەسـەر ئیمـان و باوەڕ بەخودا بمرێ و هیچ هاوبەش بۆ خودا دانەنێ، دەچێتە بەهەشت).

ئەبوذەر فەرمووی: عەرزی حەزرەتم کرد: باحیزی و دزیشی کردبێ ؟

فەرمووی -دروودی خوای لەسەر بێ- : (باحیزی و دزیشی کردبێ).

### ڕاڤەو شیکردنەوە:

لە فەتحولباریدا دەفەرموێ: لـەکاتی سـەرەمەرگدا، دەیانـەوێ، وشـەی پـیرۆزی ﴿لا إِلَـهَ إِلاّ الله﴾ بخەنـە سـەر زمـانی مامۆسـتای فـەرموودەزانی مـەزن ئـەبو زورعـەو بـەم وشـە پـیرۆزە تـەلقینی بکـەن، جـا لەخزمەتیدا

---

(١٢) اخرجه مسلم في الأيمان، باب مات لايشرك بالله شيئا دَخَلَ الجَنّة، رقم/ ٩٤.

بڕوانە: ریاض الصالحین، بەرگی دووەم لاپەڕە / ٣٣٧ ز/١٤٤ تا ز/١٦١. —وەرگێڕ-

باسی فەرموودەکەی موعاز دەکەن کەپێغەمبەر ـدروودی خوای لەسەر بێـ دەفەرموێ: (هەرکەسێ دواقسەی وشەی پیرۆزی ﴿لا إِلَـهَ إلاّ اللهُ﴾ بێ دەچێتە بەهەشت) جا ئەبو زورعە بە ڕشتەی خۆی هەتا سەر پێغەمبەر ـدروودی خوای لەسەر بێـ ئەم فەرموودەیەیان بۆ دەگێڕێتەوەو لەگەڵ گوتنی ﴿لا إِلَهَ إلاّ اللهُ﴾ دا، گیانی پاکی دەردەچێ ! فەرمایشتی مامۆستای عەسقەلانی تەواو.

خودایە ! لە سەرەمەرگدا گوتنی ئەم وشە پیرۆزەمان بەنسیب بفەرمووی و خۆت و فریشتەکانت تەلقینمان بکەن پێی. ئامین.

٥٩٩- عَنْ عبداللّه رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُوُل اللّهِ صَـلّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ: (مَنْ ماتَ يَشرِكُ بِاللّهِ شَيئاً دَخَلَ النَّارَ). وَقُلْتُ أَنـا: مَـنْ مَـاتَ لايُـشْرِكُ بِاللّهِ شَيئاً دَخَلَ الجَنَّة. (الحديث ١٢٣٨ – طرفاهُ في ٤٤٩٧، ٦٦٨٣) [١٣]:

عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود ـرەزای خوایان لێ بێـ فەرمووی: خۆشەویست ـدروودی خوای لەسەر بێـ فەرموویەتی: (هەرکەسێ لەسەر ئیمان و باوەڕی ساغ بە خودا نەمرێ، بەڵکو بە موشریکی بمرێ دەچێتە ناو دۆزەخەوەو ئەوجۆرە کەسە دۆزەخین).

منیش بەپێی موفتەزای ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر ـدروودی خوای لەسەر بێـ دەڵێم: (هەر کەسێ لەسەر ئیمان و باوەڕ بەخودا بمرێ و هیچ هاوبەش بۆ خودا بڕیار نەدا دەچێتە بەهەشت و ئەوە بەهەشتییە).

## فەرمان کراوە بەشوێن کەوتنی تەرمی مردوو

٦٠٠- عَنِ البَراءِ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ قَالَ: أَمَرَنا النبيّ صَلّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ بِسَبْعٍ وَنَهانا عَنْ سَبْعٍ: أَمَرَنا بإتباعِ الجَنائِزِ، وَعِيادَةِ المَـرِيضِ، وَ إجابَـةِ الـداعيّ، وَنَصْرِ المَظْلُومِ، وَإبرارِ القَسَمِ، وَرَدِّ السَّلامِ، وَتَشْمِيتِ العاطِسِ، وَنَهانا عَنْ آنِيَـةِ

(١٣) أخرجه مسلم في الإيمان (العيني /٥/٨ حديث رقم /٢٢). -المترجم-

الفِضَةِ، وَخاتَمِ الـذَّهَبِ، والحَرِيرِ، والـدِّياجِ، والقِسِّيِّ والإستَبْرَقَ. (الحديث ١٢٣٩، أطرافُـهُ في: ٢٤٤٥، ٥١٧٥، ٥٦٣٥، ٥٦٥٠، ٥٨٣٨، ٥٨٤٩، ٥٨٦٣، ٦٢٢٢، ٦٦٥٤) [١٤]:

بەڕای کوڕی عازیب (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- فەرمانی پێکردین بە حەوت شت، وەجڵەوگیری لێکردین لە حەوت شت، فەرمانی پێ کردین بە شوێنکەوتنی تەرم و بەسەردانی نەخۆش و چوون بۆ سەر دەعوەت و یاریدەی ستەمبارو بەجێهێنانی سوێندو وەڵامدانەوەی سڵاوونرا بۆ پژمیو. جڵەوگیریشی لێ کردین لەم حەوتە: لە حاجەتی زیوو ئەنگوستیلەی زێڕو لە ئاوریشم و لە دیباج و لە کاڵاو مشکی و هەوری و پووشینی تێکەڵ لە ئاوریشم و شتی ترو لە ئیستەبرەق.

## چوونە ژوورەوە بۆ لای مردوو لە پاش کفن کردنی

٦٠١- عَنْ أُمِّ الْعَلَاءِ رَضِي اللّٰهُ عَنْها امْرَأَةً مِنْ الْأَنْصَارِ بَايَعَتِ النَّبِيَّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَخْبَرَتْهُ أَنَّهُ اقْتَسَمَ الْمُهَاجِرُونَ قُرْعَةً فَطَارَ لَنَا عُثْمَانُ بْنُ مَظْعُونٍ فَأَنْزَلْنَاهُ فِي أَبْيَاتِنَا فَوَجِعَ وَجَعَهُ الَّذِي تُوُفِّيَ فِيهِ فَلَمَّا تُوُفِّيَ وَغُسِّلَ وَكُفِّنَ فِي أَثْوَابِهِ دَخَلَ رَسُولُ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقُلْتُ رَحْمَةُ اللّٰهِ عَلَيْكَ أَبَا السَّائِبِ فَشَهَادَتِي عَلَيْكَ لَقَدْ أَكْرَمَكَ اللّٰهُ فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (وَمَا يُدْرِيكِ أَنَّ اللّٰهَ قَدْ أَكْرَمَهُ). فَقُلْتُ بِأَبِي أَنْتَ يَارَسُولَ اللّٰهِ فَمَنْ يُكْرِمُهُ اللّٰهُ؟ فَقَالَ: (أَمَّا هُوَ فَقَدْ جَاءَهُ الْيَقِينُ وَاللّٰهِ إِنِّي لَأَرْجُو لَهُ الْخَيْرَ وَاللّٰهِ مَا أَدْرِي وَأَنَا رَسُولُ اللّٰهِ، مَا يُفْعَلُ بِي). قَالَتْ فَوَاللّٰهِ لَا أُزَكِّي أَحَدًا بَعْدَهُ أَبَدًا.

---

(١٤) أخرجه مسلم في كتاب اللباس والزينة، باب: تحريم الذهب والحرير علي الرجل وإباحته للنساء (شرح النووي علي مسلم ج/١٤ص٣١). -المترجم-

(الحـــــديث١٢٤٣- أطرافـــــه في: ٢٦٨٧، ٣٩٢٩، ٧٠٠٣، ٧٠٠٤، ٧٠١٨)[١٥]:

ئوم عـەلاء (رەزای خوای لێ بێ) کـە ژنێـك بـوو لـە یاریـدەدەران (ئەنـصار) وە یـەکێکیش بـوو، لـەو ئافرەتانـەی کـە پـەیمانیان بەپێغەمبـەر دابـوو — فەرمووی: کاتێ کۆچکاران (موهاجیرین) کۆچیان کرد بۆ مەدینـە، نـەداراو هـەژار بـوون، مـاڵ و سـامانیان هـەموو لێ بـەجێ مـابوو، لەبەرئـەوە موهاجیرەکـان بەتیروپـشك دابـەش کـران بەسـەر ماڵـە یاریدەدەرەکانـدا، عوسمانی کوڕی مەظموون بەرئێمە کەوت و ئێمەیش بردمانـەوە بـۆ مـاڵی خۆمان و جێگەو ڕێگەی شایانمان لە ماڵەوە بۆ دابین کـرد، بـەڵام خواستی خوا وابوو نەخۆشکەوت و لەو نەخۆشیەدا مرد، جاکـاتێ مـردو شۆردراو لەجلەکانی خۆیـدا کفن کـرا، پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسەر بێ) هاتـە ژوورەوە بـۆ سەرتەرمەکەی.

منیش گوتم: ڕەحمەتی خودات لێ بێ، ئەی ئەبوسائیب !

- ئەبوسائیب کەسناوی (کنیـە)ی عوسمـانی کـوڕی مـەظموونـە — مـن شایەتیت بۆ ئەدەم کە خودا ڕێزداری کردووی.

پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فـەرمووی: (چـووزانیت کـە خـوا ڕێـزی لێ گرتووە؟).

منـیش گـوتم: بـە بـاوك و دایکمـەوە بـەقوربانت بم، پـێم بفـەرموو ئەگەر خودا ڕێز لەم زاتە پاك و پیرۆزە نەگرێ، ئـەی ڕێـز لـەکێ دەگـرێ ؟ ئەویش فەرمووی: (هەرچی وەکوو عوسمانە وامردو ڕۆیشت بەڕێی هـەقی

---

(١٥) لم يخرجه مسلم، كما ذكر العسقلاني، انظر (فـتح البـاري ج/٣ ص/٣٠٦ - خاتمـة كتابِ الجنائز). -المترجم-

خۆیەوە، بە خودا من ئومێد دەکەم کەخێر بێتە ڕێگەی، بەڵام بۆ کەسانێ تر، ئەنجامی کار نادیارە، تەنانەت خۆم کە پێغەمبەری خواشم، سوێندم بەخودا نازانم چێم لێ دەکرێ و لە قیامەتدا چیم بەسەر دێ !.)

ئوم عەلا (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: کەواتە سوێندم بەخودا جارێکی تر، لەسەر ئەم داستانی عوسمانەدا، لە خۆمەوە، کەسێ بە پاك و پیرۆزو بەهەشتی دانەنێم، مەگەر خوداو پێغەمبەری خودا بڕیاری ئەوەیان دابێ.

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

١ـ ئەوەی کە پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: (.. نازانم.. لە قیامەتدا چیم بەسەر دێ) ئەمە پێشهاتنی ئایەتەکەی سوورەتی فەتح بووە کە دەفەرموێ: ﴿لِيَغْفِرَ لَكَ اللَّهُ مَاتَقَدَّمَ مِن ذَنبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ﴾ ـ واتە: هەتا خودا لەگوناهی پێشین و پاشینت خۆش ببێ ئەی موحەممەد !) وە بەپێی ئەم ئایەتەی ترە کە دەفەرموێ: ﴿قُلْ ماكُنْتُ بِدْعَاً مِنَ الرُسُلِ، وَمَا أَدْرِي ما يُفْعَلُ بِي وَلا بِكُمْ﴾.

ئەوەی کە گومانی تێدا نییە کە پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- لەم بارەیەوە فەرمووی: (من یەکەم کەسم کە دەچمە ناو بەهەشت).

٢ـ لەم فەرموودەیەدا ناوی دووان لەهاوڕێیانی پێغەمبەر هاتووە، یەکەمیان عوسمانی کوڕی مەظعوونە، لەمەککە ئیسلام بوو، لەپاش سیانزە پیاو، لەکۆچی یەکەما خۆی و سائیبی کوڕی کۆچیان کرد بۆ حەبەشە، یەکەم کەس بوو لەکۆچکاران (موهاجیرین) کە لە مەدینە مردووەو، لە گۆڕستانی بەقیع نێژراوە، پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- بە مردوویی ماچی کرد، وەبۆی دەگری، کاتێ ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەر -

درودی خوای لەسەر بێ دەمرێ، پێغەمبەر درودی خوای لەسەر بێ دەفەرموێ: (بچۆ بۆلای پێشینی باشی خۆمان عوسمانی کوڕی مەظعوون).

عوسمانی کوڕی مەظعوون برای شیری پێغەمبەر بووە، پێغەمبەر درودی خوای لەسەر بێ گۆڕەکەی بەکێلێ نیشانە کردبوو زۆرجار سەری دەدا لەگۆڕەکەی، لە سەردەمی نەزانیشدا عوسمان مەی و بادەی لەخۆی حەرام کردبوو، لەساڵی دووەمی کۆچیدا لەمەدینە مرد (رەزای خوای لێ بێ) بڕوانە: (تاج/١ ل/٥٧٤ ف/٦ ز/٢٢١).

دووەم هاوڕێی ئوم عەلایە لەو ژنانەیە کە پەیمانیانداوە بەپێغەمبەر درودی خوای لەسەر بێ ئەنصارییە، لە خەویدا دەبینێت: (عوسمانی کوڕی مەظعوون جۆگەیەك ئاوی ڕوونی ڕەوانی هەیە، کە دەیگێڕێتەوە بۆ پێغەمبەر درودی خوای لەسەر بێ دەفەرموێت: (ئەوە کردەوەی باشیەتی، پاداشتی باشی هەر بەردەوامە بۆی).

نەخۆش دەبێت پێغەمبەر درودی خوای لەسەر بێ دەچێت بۆ سەردان و هەواڵ پرسینی، فەرموودەی لە بوخاری و موسلیمدا هەیە.

٦٠٢- عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ – قَالَ: لَمَّا قُتِلَ أَبِي، جَعَلْتُ أَكْشِفُ الثَّوْبَ عَنْ وَجْهِهِ، أَبْكِي وَيَنْهَوْنِنِي عَنْهُ، وَالنَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لاَيَنْهَانِي، فَجَعَلَتْ عَمَّتِي فَاطِمَةُ تَبْكِي، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (تَبْكِينَ أَوْ لاَ تَبْكِينَ، مَا زَالَتْ الْمَلاَئِكَةُ تُظِلُّهُ بِأَجْنِحَتِهَا حَتَّى رَفَعْتُمُوهُ). (الحديث ١٢٤٤- أطرافُهُ في: ١٢٩٣، ٢٨١٦، ٤٠٨٠).

جابر (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: (لە ڕۆژی غەزای ئوحوددا باوکم شەهیدکرا، کە لاشەکەیان هێنا بۆ لای پێغەمبەر درودی خوای لەسەر بێ لووت و گوێیان کردبوو منیش چووم سەریم هەڵدایەوەو دەستم کرد بەگریان

بۆی! خزمان نەیاندەهێشت بۆی بگریم، بەلاّم پێغەمبەر گەرچی ئاگای لێم بوو قەدەغەی لیٚ نەکردم، تا فاتیمەی کچی عەمر، کە خوشکی باوکم بوو، وە پووری من بوو هاتوو دەستی کرد بەگریان بۆی، ئەوسا پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێ فەرمووی: (بۆی بگریت و بۆی نەگریت چوونیەکە بۆ ئەو، چونکە ئەو بەپایەی شەهیدی گەیشتووە، ئەو فریشتە بەباڵیان سێبەریان بۆی کردبوو، تا لە خۆرەتاوەکە بی پارێزن و تا لاشەی تێك نەچێت، وەگیانی پاك و پیرۆزی بەرزەوە بکەن بۆ ئاسمان، ئەمە حاڵیان بوو هەتا ئەو کاتەی کە لەسەر تاتە شۆرەکە هەڵتانگرت). (بڕوانە: تاج/١٨٢/٥ ف/١ + تاج /١٨١/٥- باسی/٥٠).

## دروستە لەسەر شێوەیەکی ڕەوا مردنی مردوو ڕابگەیەنریٚ

٦٠٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (نَعَى النَّجَاشِيَّ فِي الْيَوْمِ الَّذِي مَاتَ فِيهِ، خَرَجَ إِلَى الْمُصَلَّى فَصَفَّ بِهِمْ وَكَبَّرَ أَرْبَعًا (الحديث ١٢٤٥ – اطرافه في: ١٣١٨، ١٣٢٧، ١٣٢٨، ١٣٣٣، ٣٨٨٠، ٣٨٨١).[١٦]

ئەبو هوریرە (ڕەزای خوای لیٚ بیٚ) فەرمووی: لەو ڕۆژەدا کە نەجاشی تیا مرد، کە ووشەی نەجاشی نازناوی پادشایانی حەبەشییەکانە، وەك چۆن ڕۆم بە پادشای خۆیان دەڵێن قەیسەرو ئێرانیان بەپادشای خۆیان دەڵێن کیسرا، حەبەشیش بەپادشای خۆیان دەڵێن نەجاشی، وە پادشایەکی باش بوو، پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێ پەیامی مردنی ئەوی بەیارانی ڕاگەیاند، فەرمووی: ئەصحەمە کە بەندەیەکی باشی خودا بوو ئەمڕۆ مرد. جا

(١٦) أخرجه مسلم في الجنائز، با: في التكبير علي الجنازة، رقم: ٩٥١

حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) لەگەڵ هاوڕێیانیدا دەرچوو، ڕۆیشتن بۆ نوێژگاکە، لەوێ لەپشت خۆیەوە ڕیزی کردن و نوێژی نادیار (صلاة الغائب)ی بە کۆمەڵی لەسەر کرد، لەنوێژەکەدا وەك نوێژی مردووی ئاسایی چوار الله اکبری کرد. (تاج / ٢/٥٥١/١ + ل/٥٦٠ ف — ٢).

٦٠٤– عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَخَذَ الرَّايَةَ زَيْدٌ فَأُصِيبَ، ثُمَّ أَخَذَهَا جَعْفَرٌ فَأُصِيبَ، ثُمَّ أَخَذَهَا عَبْدُ اللّٰهِ بْنُ رَوَاحَةَ فَأُصِيبَ، وَإِنَّ عَيْنَيْ رَسُولِ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَتَذْرِفَانِ ثُمَّ أَخَذَهَا خَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ مِنْ غَيْرِ إِمْرَةٍ فَفُتِحَ لَهُ). (الحديث ١٢٤٦– اطرافه في: ٣٠٦٣،٣٦٣٠، ٢٧٩٨، ٣٧٥٧، ٦٢٤٢):[١٧]

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) هەواڵی مەرگی زەیدو جەعفەرو عەبدوڵای کوڕی ڕەواحەی ڕاگەیاند بەموسوڵمانان، لەغەزای مۆتەدا لەشام شەهیدکران پێش ئەوەی هەواڵیان بەشێوەیەکی ئاسایی بگاتە مەدینە فەرمووی (دروودی خوای لەسەر بێ): (زەید ئاڵاکەی هەڵگرت و پێکرا، ئەوجا جەعفەر هەڵیگرت و ئەویش پێکرا، ئینجا عەبدوڵایکوڕی ڕەواحە هەڵیگرت و ئەویش پێکرا) لەم کاتەدا هۆن هۆن فرمێسك بەچاوەکانی پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەر بێ) دەهاتە خوارێ. فەرمووی (دروودی خوای لەسەر بێ): (ئیتر ئاڵاکە خالیدی کوڕی وەلید - کە شمشێرێکە لە شمشێرەکانی خودا - هەڵیگرت و داینەنا هەتا خودای گەورە سەری خستن، خالید خودسەر لەخۆوە ئاڵاکەی هەڵگرت و خۆی کرد بەسەرکردەی سوپاکە بە بێئەوەی کەسێك ئەو ئەرکەی پێ بسپێرێت). (تاج /٥/ ١/١٤٣).

---

(١٧) لم يوافقه مسلم علي تخريجه (فتح الباري ج / ٣ ص ٣٠٦ ـ خاتمة). —المترجم

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

ئەم بەهرانە لەم باسە وەردەگیرێن:

راگەیاندنی پەیامی مردنی کەسێ لەسەر شێوەیەکی ڕەوا دروستە، لەبابەتی ئەو (نهی)ە نییە کە شەرع نەهی لێکردووە، وەك ئێستا باوە لە ڕادیۆو تەلەفزیۆن و ڕۆژنامەدا مەرگی کەسێك بلاّودەکەنەوە، تا خەڵك بچن بۆ بەرێکردنی تەرمەکەی و بۆ پرسەو سەرەخۆشی کردن لە کەس و کاری.

# نوێژی مردوو لەسەر مردووی نادیار دروستە

بۆ باسی فەزڵی جەعفەرو زەید بڕوانە (تاج /١/١٠٥/٥ +٢+ ٣+ ٤+٥) و (تاج/ ١٢٢/٥ز—٢٢+ل /١٢٣ ز-٢٣ + ل /١٢٥ ز — ٢٤)

# پاداشتی منالّ مردن

٦٠٥- عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَا مِنْ النَّاسِ مِنْ مُسْلِمٍ، يُتَوَفَّى لَهُ ثَلَاثٌ لَمْ يَبْلُغُوا الْحِنْثَ، إِلَّا أَدْخَلَهُ اللَّهُ الْجَنَّةَ بِفَضْلِ رَحْمَتِهِ إِيَّاهُمْ). (الحديث ١٢٤٨- طرفه في: ١٣٨١):[18]

پێشەوا ئەنەس (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (هەر موسوڵمانێك سێ منالّی نابالّقی بمرن، کە ڕەسیدە نەبووبن، بێگومان کەخودا لەبەر خاتری ئەو مندالاّنە دەیباتە بەهەشت) (تاج/١/٥٣٥/١+٢، تاکۆتایی باسەکە).

(١٨) لم یوافقه مسلم علي تخریجه (فتح /٣/٣٠٦/١٣٩٤- خاتمة) انظر رقم (٨٦) وصحیح مسلم /١٦/١٨٠/ - باب فضل من یموت لهُ وَلد فیَحتسبهَ. -المترجم-

# شۆردنی مردووو دەستنوێژگرتن بۆی بە ئاوو بەمۆرد

٦٠٦- عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ الْأَنْصَارِيَّةِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْها قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حِينَ تُوُفِّيَتْ ابْنَتُهُ، فَقَالَ: (اغْسِلْنَهَا ثَلَاثًا، أَوْ خَمْسًا، أَوْ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ إِنْ رَأَيْتُنَّ ذَلِكَ، بِمَاءٍ وَسِدْرٍ وَاجْعَلْنَ فِي الْآخِرَةِ كَافُورًا أَوْ شَيْئًا مِنْ كَافُورٍ فَإِذَا فَرَغْتُنَّ فَآذِنَّنِي). فَلَمَّا فَرَغْنَا آذَنَّاهُ، فَأَعْطَانَا حِقْوَهُ فَقَالَ: (أَشْعِرْنَهَا إِيَّاهُ) تَعْنِي إِزَارَهُ. (الحديث ١٢٥٣):[١٩]

ئوم عەتیّ (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خەریکبووین تەرمی زەینەبی کچی پێغەبەرمان دەشۆرد، پێغەمبەر خۆی (درودی خوای لەسەر بێ) هاتە ژورەوە بۆلامان، فەرمووی: (بە ئاوو مۆرد سێجار، یاپێنج جار بیشۆن، یازیاتریش ئەگەر زیاترتان بە پێویست زانی، وە لەدواترین دەستا کافووریشی تێ بکەن، کاتێکیش لێبوونەوە لە شۆردنەکەی ئاگادارم بکەن). جا کەلێبووینەوە پێمان گووت. جا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) کراس (ئیزار)ەکەی خۆی هەڵدا بۆمان و فەرمووی: (بیکەن بەژێرکراس بۆی). واتە: لەسەر گۆشتەوە بیکەنە بەری. (تاج /٥٤٦/١ ز – ٢٠٣).

وَفِي رِوايَةٍ أخرى: أَنَّهُ قَالَ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (ابْدَأْنَ بِمَيَامِنِهَا وَمَوَاضِعِ الْوُضُوءِ مِنْهَا). قَالَتْ: (وَمَشَطْنَاهَا ثَلَاثَةَ قُرُونٍ). (الحديث ١٢٥٤):

لەگێڕانەوەیەکی تردا: ئوم عەتییە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر - درودی خوای لەسەر بێ- بۆ شۆردنی تەرمی زەینەبی کچی فەرمووی پێمان: (لەئەندامە ڕاستەکانیەوە و لەئەندامەکانی دەستنوێژیەوە دەست بکەن بەشۆردنی). ئوم عەتییە فەرمووشی: قژەکەیشیمان شانەکردوو کردمان بەسێ پەلك و بەپشتیا شۆڕمان کردەوە.

(١٩) أخرجه مسلم في الجنائز، باب غسل الميت، رقم: ٩٣٩

## بەرگی سپی بۆ کفن باشە، باسی کفن

٦٠٧- عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كُفِّنَ فِي ثَلَاثَةِ أَثْوَابٍ يَمَانِيَةٍ بِيضٍ سَحُولِيَّةٍ مِنْ كُرْسُفٍ لَيْسَ فِيهِنَّ قَمِيصٌ وَلَا عِمَامَةٌ (الحديث ١٢٦٤- اطرفه فى: ١٢٧١، ١٢٧٢،١٢٧٣، ١٣٨٧):[20]

**عایشه** (رەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** درودی خوای لەسەر بێ **لە سێ لۆ جلی یەمەنی سپی خاوێنی لۆکەدا کفن کرا، نەکراس و نەمێزەریان تیانەبوو (تاج/٥/٥٤٥/٤)**

٦٠٨- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: بَيْنَمَا رَجُلٌ وَاقِفٌ بِعَرَفَةَ، إِذْ وَقَعَ عَنْ رَاحِلَتِهِ فَوَقَصَتْهُ. أَوْ قَالَ فَأَوْقَصَتْهُ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (اغْسِلُوهُ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ، وَكَفِّنُوهُ فِي ثَوْبَيْنِ، وَلَا تُحَنِّطُوهُ، وَلَا تُخَمِّرُوا رَأْسَهُ، فَإِنَّهُ يُبْعَثُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مُلَبِّيًا). (الحديث ١٢٦٥اطرافه فى: ١٢٦٦، ١٢٦٧، ١٢٦٨، ١٨٣٩، ١٨٥١):[21]

**ئیبنو عەبباس** (رەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پیاوێ لەحەجی مالآوایی‌دا، بەبەرگی ئیحرامەوە، لەکێوی عەرەفە، لەخزمەتی پێغەمبەردا بوو، لە وشترەکەی کەوتە خوارەوەو ئەستۆی شکاو مرد، ئێمەش لەخزمەتی پێغەمبەردا بووین، پێغەمبەر خۆشی** درودی خوای لەسەر بێ **لە ئیحرامدا بوو، فەرمووی** درودی خوای لەسەر بێ **: (بەئاوو مۆرد بیشۆرن و لەدوو لۆ جلا کفنی بکەن بەلام حەنووط و بۆنی خۆشی لێ مەدەن و سەریشی دامەپۆشن، چونکە رۆژی قیامەت کە خودا زیندووی دەکاتەوە بە بەرگی ئیحرامەوە زیندووی دەکاتەوەو وەك حاجییان لەبیبەیکە دەکات). (تاج /١/٥٤٩/ ١-ش/د/ت/ن).**

---

(٢٠) أخرجه مسلم في الجنائز، باب كفن الميت، رقم: ٩٤١

(٢١) أخرجه مسلم في الحج، باب: ما يفعل بالمحرم إذا مات، رقم: ١٢٠٦

٦٠٩- عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ: أَنَّ عَبْدَ اللّٰهِ بْنَ أُبَيّ لَمَّا تُوُفِّيَ جَاءَ ابْنُهُ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللّٰهِ: أَعْطِنِي قَمِيصَكَ أُكَفِّنْهُ فِيهِ وَصَلِّ عَلَيْهِ وَاسْتَغْفِرْ لَهُ، فَأَعْطَاهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَمِيصَهُ، فَقَالَ (آذِنِّي أُصَلِّي عَلَيْهِ) فَآذَنَهُ فَلَمَّا أَرَادَ أَنْ يُصَلِّيَ عَلَيْهِ جَذَبَهُ عُمَرُ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ فَقَالَ: أَلَيْسَ اللّٰهُ نَهَاكَ أَنْ تُصَلِّيَ عَلَى الْمُنَافِقِينَ ؟ فَقَالَ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَنَا بَيْنَ خِيَرَتَيْنِ، قَالَ: (اسْتَغْفِرْلَهُمْ أَوْلاَ تَسْتَغْفِرْلَهُمْ إِنْ تَسْتَغْفِرْلَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً فَلَنْ يَغْفِرَاللّٰهُ لَهُمْ). فَصَلَّى عَلَيْهِ، فَنَزَلَتْ: (وَلَا تُصَلِّ عَلَى أَحَدٍ مِنْهُمْ مَاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَى قَبْرِهِ). (الحديث ١٢٦٩ – اطرافه في: ٤٦٧٠، ٤٦٧٢، ٥٧٩٦):[22]

ئیبنو عومەر رەزای خوایان لێ بێ فەرمووی: (کە عەبدولای کوڕی سەلوول ـ سەرۆکی ناپاکەکان ـ مرد، عەبدوللای کوڕی ئەم عەبدولایە، کە یەکێك بوو لەهاوڕێ راست و باشەکانی پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێ هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێ عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! کراسێکی خۆتم بدەرێ، تا بیکەم بە کفن بۆ باوکم، ئەویش کراسێکی خۆیىدا پێی، لە پاشا داواشی لێکرد کە نوێژی مردووشی لەسەر بکاو بۆشی بپارێتەوە، پێغەمبەریش دروودی خوای لەسەر بێ بەڵێنی ئەوەی پێداو فەرمووی: (ئاگادارم بکە نوێژی لەسەر دەکەم) جا کە لەشۆرین و کفن کردنی بوونەوە، عەبدوللا پێغەمبەری ئاگاداركردەوە، کە تەشریفی بچێ نوێژی مردوو لەسەر تەرمەکەی باوکی بکا، پێغەمبەریش دروودی خوای لەسەر بێ هەڵسا کە نوێژی لەسەر بکا، عومەر رەزای خوایان لێ بێ هەڵسا جلەکەی پێغەمبەری گرت و کێشایە دواوەو عەرزی کرد: قوربان ! ئەی پێغەمبەری خودا ! تۆ خودا رێگەی

(٢٢) أخرجه مسلم في أوائل صفات المنافقين وأحكامهم: رقم: ٢٧٧٤.

ئەمەی نەداویت، ئیتر نوێژی چی لەسەر دەکەی! ئەوەتا بەئاشکرا قورئان دەفەرموویێت: ﴿اسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لاَ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ..﴾؟ پێغەمبەریش -درودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (ئەمەی تۆ دەیڵێی وایە، بەلاّم من هێشتا ئومێدم ماوەو بەتەواوی ڕێگەی ئەوە نەگیراوە، چونکە لەم ئایەتەدا، کە سەبارەت بەم بابەتەن، خودا منی کردووە بەسەر پشك و خاتر خۆی کردووم و دەفەرموێ: ﴿اسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لاَ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ إِن تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً فَلَن يَغْفِرَ اللّهُ لَهُمْ – تەوبە /٩/٨٠﴾ واتە: ئەی پێغەمبەری ! ئارەزووی خۆتە داوای لێخۆش بوون بکە بۆیان یا مەکە، ئێمە ڕێگەی ئەوەت لێناگرین، بەلاّم ئەوە بێ سوودە، ئەگەر نەك جارو دووجار، تەنانەت حەفتا جاریش داوای لێخۆش بوونیان بۆ بکەی خودا لێیان خۆش نابێ). ئەوجا پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (دەی من لە حەفتا جار زیاتر داوای لێخۆش بوونی بۆ دەکەم). عومەر -رەزای خوایان لێ بێ-: فەرمووی ئاخر ئەمە ناپاك و مونافقە.

جا قسەبەر فەرمووی: جاکاتێ پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- نوێژی لەسەر ئیبنو سەلوول کرد، خودا ئەم ئایەتەی تری نارده خوارەوە کەدەفەرموێت: ﴿وَلاَ تُصَلِّ عَلَى أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلاَ تَقُمْ عَلَىَ قَبْرِهِ - تەوبە/٩/٨٤﴾. واتە: بە هیچ جۆرێ نوێژمەکە لەسەر هیچ کامێ لەوان، کاتێ کە دەمرن، وە لەسەر گۆڕەکەی ڕامەوەستە بۆ نزاکردن بۆی) (بڕوانە: تاج /٦/٢٠٧/١٦-ش/ت).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

**یەکەم-** ئەم فەرموودەیە بەلگەیەکی روون و ئاشکرایە بۆ

چەندبابەتێکی تازە بابەتی هاوچەرخ، کە بەزەقی و مەترەقی لەم سەردەمەی ئێمەدا روودەدەن، بەتایبەتی لەو ناوچەو ولاتانەی کە بەناوی ئازادی و سەربەستییەوە رێگەی ئیلحاد دراوە، وەهەندێ گرووپ و لایەن و کۆمەڵ و پارت پەیدابوون، بەدەق لەبەرنامەی نوسراوی خۆیاندا جاردەدەن: (ئێمە باوەڕمان بەهیچ ئایینێ نییە). وە زۆر کەسیش لە خەڵکی ولات، دەچنە سەر ئەم بیرو باوەڕانە، وەناوی خۆیان لەلیستی ئەوانا دەنوسن و ناسنامەی ئەو گرووپانە وەردەگرن، کە ئەمانە لەپێش ئەم گۆڕانکارییەدا سەر بەئایینێ لەئایینەکان بوون. ئەمە لەلایێ. لەلایەکی تریشەوە زۆرینەی کات هەتا کاتی مردن، ئەوەی پێی بڵێی بۆنی ئایین لێیان نایێ، بگرە زۆرینەی کات بەئاشکراش دژی ئایین دەوەستن، وەکی تریش کاتێ دەمرن، بەشێوەیەکی گشتی، هەموو مەراسیم و پێویستیە ئایینیەکانیان بۆ دەکرێ، بە وێنە ئەگەر لە پێشدا بەئیسلام ناسرابن ئەوا وەك موسوڵمانانی تر دەشۆرێن و کفن دەکرێن و نوێژی مردوویان لەسەر دەکرێ و تەڵقینیان دائەدرێ و پرسەیان بۆ دادەنرێ و سەرخۆشی لە کەس و کارییان دەکرێ و لە پرسەکەیاندا فاتیحەو قورئان دەخوێنرێ و پاداشەکەیان دەنێررێ بۆ گیانیان و نزای باشیان بۆ دەکرێ و داوای لێخۆشبوونی گوناهیان لە خودا بۆ دەکرێ !!.

**دەی بڕیاری شەرعی پیرۆز سەبارەت بەم مەراسیم و دەستوورە ئایینیانە کە بۆ ئەم زەندیق و بێ بڕوا رەسمییانە دەکرێن چییە؟!**

لەوەلامدا دەڵێین: بەپێی بنەما شەرعییەکان و فەرموودەی زانا گەورەکان و فەرمایشتی پەڕاوە ناودارەکانی شەریعەت، دەبێ لەم جۆرە بابەتانەدا، ئەم بنەماو رێسا سەرەکییانە بەووردی ڕەچاو بکرێن:

١ـ هەرکەسێ ساغ بوویەوە کە بەشێوەیەکی شەرعی لەئایین پاشگەز

بووەتەوە ئەوە لە یاسانامەی خودادا کۆمەڵێ بڕیاری چەسپاوی ناسراو، لەبارەیەوە هەیە. ئێمە لێرەدا مەبەستمان ڕوونکردنەوەی ئەو بڕیارە زانراوانە نییە، کە لە یاسانامە (شەریعەت)دا سەبارەت بە ملحدیین و مورتەددی شەرعی هەیە.

٢- بڕیاردان لەسەر وەرگەڕان لە ئایین کاری موفتیو قازییە، ئیشی ڕەشەخەڵك و عەوام نییە، وە ئەوانیش لەکاتی وادا دەبێ ئەوپەڕی دووربینی بکەن و بەکوێرانە بڕیاری کافر بوونی کەسێ نەدەن کە نیسبەتی گوفتارو کرداری پاشگەز بوونەوەیان لێ دەدرێ وەك ئەم کەسانەی کە گووتمان.

٣- هەموو ئادەمیزادێ بە زیندوویی و بە مردوویی، بەشی خۆی ڕێزی هەیە، وە هەموو ڕێزێکی پارێزراوە، مەگەر ڕێزێ کە شەرع ئیسقاتی بکاو پووچی بکاتەوە.

٤- وەك لە شەرحەکانی ئەم فەرموودەیەدا هاتووە، حیکمەتی ئەم ئاسانکارییە کە پێغەمبەر خۆی -دروودی خوای لەسەر بێ- بۆ سەرۆکی موناففقەکانی ڕەوا دیووە ئەم چەند مەبەستەیە:

أ - ئومێد نەبڕاوە، دەگونجێ کابرا تەوبە بکا، یا تەوبەی کردبێ، خاتیمە مەجهوولە، ئیمان پەنهانە، زۆر لەمانە لە سەرەمەرگ و نەخۆشینی مەرگا، پاش ئەوەی کە لە جاهو دەستەلات و خۆشی دنیا نائومێد دەبن، مل بۆ هەق دادەنەوێنن و دین لەکانگای دڵەوە قەبووڵ دەکەن، ئیمان هێنانی فرعەون لەکاتی نووقم بوونیدا ڕاسترین بەڵگەیە بۆ ئەم بابەتە.

وەك قورئان بەدەق دەفەرموێ: ﴿..حَتَّى إِذَا أَدْرَكَهُ الْغَرَقُ قَالَ آمَنتُ أَنَّهُ

لا إِلَـهَ إِلاَّ الَّذِي آمَنَتْ بِهِ بَنُو إِسْرَائِيلَ وَأَنَاْ مِـنَ الْمُـسْلِمِينَ. (١٠/٩٠)﴾. واتـه: كاتێ فیرعەون لەدەریاكەدا غەرق بوو، ئیمانی هێناو گوتی: (واباوەڕم هێنـا بـەو خوایـەی كەنـەوەی ئیـسرائیل دەیپەرسـتن، وە مـن یـەكێكم لـە موسوڵمانان).

ب ـ (استـصلاحا للقلـوب المؤلفـة) ئـیتر شـتەكە سوودی هەیـە بـۆ مردووەكە یا نییەتی ئەوە زۆر كاریگـەر نییـە لەكارەكـەدا. دەڵێن: بـەهۆی ئـــەم هەڵوێـــستەی پێغەمبـــەرەوە لەگـــەڵ ئیبنوســـەلوولدا، ئـــەو ڕۆژە هەزاركەس لە هۆزەكەی ئیسلام دەبن.

ج ـ بۆ ڕێزلێنان لە عەبدوڵلأی كوڕی، كـە موسـوڵمانێكی زۆر زۆرباش بـووە، وەك لـە ژیاننامەكەیـدا كـەمێ لەمـەودوا ڕوونـی دەكەینـەوە، زۆر لەشـوێنكەوتوانی ئـەم پارتـە ئیلحادییانـە سـاویلكەو هەژارۆكـەو ڕەشـە خـەڵكن، لەكارەكـە بەباشـی حـاڵی نـەبوون، پارتـە زەندیقـەكانیش بـۆ تەفرەدانی جەماوەرە دیندارەكە تەقیە بەكاردەهێنن و زۆر بە زەقی شالأو نابەنە سەر ئایین و پەیڕەوانی. بگـرە زۆركـەس لەپـەیڕەوانی ڕەسمـی ئـەم پارتـە زەنـدیق و بـێ ئایینانـە نوێـژ دەكـەن، ڕۆژو دەگـرن، حـەج دەكـەن، هامۆشۆی مزگەوت دەكەن، خێر دەكەن.

نموونـەی زۆر هەیـە لەسـەرئەوە كـە مرۆڤگـای ڕەش نییـە كـە هـەتا مردن لەیەك پێستا بمێنێتەوە. ئەوەتا ڕۆژانـە دەبیـنین كەسـانی تاوانبـارو فاسق و زەندیق و بێ دین تەوبە دەكەن و دەگەڕێنـەوە بـۆ باوەشـی ئـایین، كێ دەڵێ ئەمانەیش تەبەڕایان لەو لایەنانە نەكردووە؟!

تەكفیری شەخصێ بەتایبەتی ـ واتە: لەپاش مردن ـ جگە لەوانـەی كـە لە قورئان و سوننەتدا ناو براون، كارێكی بـاش نییـە، بگـرە دروسـت نییـە،

لەپاش ڕەچاوکردنی ئەم خاڵانە، بەدڵنیاییەوە دەڵێین:

أ ــ کردنـی ئـەم جـۆرە شـتانە، بـۆ ئـەم جـۆرە کەسـانە، بـەم جـۆرە نیازانەی کەباسمان کـردن، قەیـدی نییـە، بـەر مەرتـەبـەی عـەفو دەکـەون، وەبەر ئـەو شـتانە دەکـەون، کـە قورئـان لەبارەیانـەوە دەفـەرمێت: ﴿یاایهـا الذین امنوا لاتسألوا عن اشیاء ان تبدلکم تسؤکم﴾. وە پێغەمبـەریش ـدروودی خوای لەسەر بێ ـ دەفـەرموێ: ﴿..وَعَفَا عَنْ أَشْيَاءَ رَحْمَةً بِكُمْ لا عَنْ نِسْيَانٍ فَلا تَسْأَلُوا عَنْهَا..﴾.

وەکـی تـریش شـتەکە گەیـشتوەتە ڕادەی بـەلوا عامـمـە، لەبەرئـەوە چاوپۆشی کردن و خۆ گێل کردن لێی کارێکی خراپ نییە. ئەوەنـدە هەیـە ئەگەر کەسێ ئاگاداری تەواوی هـەبێ بەسـەر حـاڵی مردووەکەدا، کـە هـەتا کـاتی گیـان دەرچـوون، هـەر بـەردەوام بـووە لەسـەر پاشـگەز بوونـەوە لـە ئیسلام، ئەوە باشترو چاکتر ئەوەیە، کـە وەك پاشـگەزو مورتـەدد مامەڵەی لەگەڵدا بکا، بەڵام لە سنووری ئەم فەرموودەیـەی پێغەمبـەردا، کـە هانمـان دەدا لەسەر سڕ قایمی کە بەدەق دەفـەرموێ: (استعینوا علی قضاء حوائجکم بالکتمان).

ب ـ وەك لەم فـەرموودە پیرۆزەوە دەردەکـەوێ، مـردوو ــ گەرچـی لـە ژیانیدا خراپیش بێ ـ بەڵام کاتێ دەمرێ، لەلای کەسـوکاری شـیرین دەبـێ، نەنگییەکانی دەشارێتەوە، لەبەرئەوە کەسوکاری بەپێی توانا، هەوڵ دەدەن مایـەی چاوپۆشـی لێکردنـی خـودای بـۆ دابـین بکـەن، وە بـەهۆی سـەرەتای خورپـە لێکەوتنـەوەو سـامی مەرگـەوە، لەمـەدا تـاڕادەیێ عوزریـان هەیـە. سەرنج بفەرموون: ئـەوەتا عەبـدوڵڵای کـوڕی عەبـدوڵڵای کـوڕی سـەلوول، لــەژیانی باوکیـــدا، زۆر توندوتیـــژ بـــووە دەرهــەقی، تەنانـــەت داوای

لەپێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کرد کە ڕێگەی بدات خۆی بەدەستی خۆی بدا لەگەردنی باوکی، لەسەر ئەو هەڵوێستە ناشیرینانەی کە بەرامبەر بەپێغەمبەر هەیبوو، بەڵام پێغەمبەر ڕێگەی ئەوەی نەدا، چونکە ئاگای لەو ئایەتانە بوو کە سەبارەت بە ئیبنوسەلوولی باوکی هاتبوون، لەگەڵ ئەوەیشا، ئەوەتا کاتێ ئیبنوسەلوول دەمرێ، لەبەر چاوی عەبدوڵڵای کوڕی شیرین دەبێ، مەرگ خراپەکانی دادەپۆشێ، شلۆقی هەڵوێست کارێکی وادەکا، کە ڕەحمی بۆی بجووڵێ، چونکە کاتی گلەیی و تانەو تەشەر نییە بەڵکو کاتی لێقەومان و فریاکەوتن و نزای باشە.

ئەم دیدو بۆچوونە نوێیە بوو کە وای لەعەبدوڵڵا کرد داوا لە پێغەمبەر بکاو ئەو شتانە بۆ باوکی بکا، کە لە فەرموودەکەدا باس کراوون.

جـ- پێغەمبەری خودا (دروودی خوای لەسەر بێ) بەنهێنی، ناوی مونافق و ناپاکەکانی بە حوزەیفەی کوڕی یەمان فەرموو بوو، لەبەرئەوە کاتێ کەسێ دەمرد، پێشەوا عومەر (ڕەزای خوایان لێ بێ) لەلای خۆیەوە سەرنجی حوزەیفەی دەدا، ئەگەر ئامادەی سەر تەرمی ئەو مردووە ببوایەو نوێژی لەبەر بکردایە، ئەوا حەزرەتی عومەریش دەیزانی کە ئەوە مونافق نییە، لەبەرئەوە ئامادەی سەر تەرمەکەی دەبوو، وەنوێژی لەسەری دەکرد، بەڵام ئەگەر حوزەیفە ئامادەی سەر تەرمەکەی نەبووایە، ئەوا عومەریش ئامادەی نەدەبوو، وە لەوەوە ئەوەی وەردەگرت خاوەن ئەو تەرمە لەو ناپاکانەیە، کەپێغەمبەر ناوەکانیانی بەنهێنی بەحوزەیفە ووتووە، دەی ئەمە بەڵگەی ئەوەیە کە ئەم جۆرە بابەتانە هەتا لەژێر پەردەوە بن باشە، وەشەرع ئاشکرا ببینە، لەبەرئەوە بڕیاری شەرع بەپێی ڕواڵەتە، وەئەصڵ لەم جۆرە کاتانەدا، بەرائەتە، چونکە ئەصڵ بەقای ئەصڵەکە ئیمانە، وە بەرائەتە لە کوفر هەتا بەبەڵگەی دامەزراو کوفری کابرا دەچەسپێ.

د ـ فەرمایشتی ڕاست و دروست ئەوەیە: (کە موسوڵمان هەتا بۆی دەکرێ لەدنیاو لەقیامەتدا لەم جۆرە کەسانە دوور بێ، لە دونیادا هاوڕێتی یان نەکات و، لە گۆڕستان گۆڕی لەگەڵ گۆڕیاندا نەبێ، چونکە نزیکی مرۆڤی خراپ لە هەردوو دنیادا مایەی سەراسێیە).

هـ ـ لەبابەتی نیکاح و تەلاق و میرات و شتی تری وایشدا هەمان حسابیان بۆ بکرێ.

**دووەم:** عەبدوڵلای کوڕی عەبدوڵلای کوڕی سەلوول (ڕەزای خوای لێ بێ) یەکێکە لە هاوڕێ زۆر بەڕێزەکانی پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- خەزرەجییە، ئەنصارییە، لەپێشدا ناوی حوباب بوو، پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- ناوەکەی گۆڕی و ناوی نا عەبدوڵلا ئامادەی غەزای بەدرو ئوحودو گشت غەزاواتەکانی تری پێغەمبەر بووە، لەخزمەت پێغەمبەر خۆیدا وەیەکێ بوو لەنووسەرانی سرووش، وە لەغەزای تەبووکا عەبدوڵلای باوکی، کە ناوداره بە ئیبنوسەلوول، کە سەرۆکی ناپاکەکان بوو، هەڕەشەی لەپێغەمبەر کردو گوتی: (من و موحەممەد کاتێ گەڕاینەوە بۆ شاری مەدینە، کاممان بەدەسەڵات و تواناتر بوو، بەوی ترمانی چۆڵ دەکات، مەدینە یا بۆ من دەبێ یا بۆ ئەو) جا کاتێك قورئانی پیرۆز، پەردەی لەسەر ئەم قسە ژەهراوییەی ئیبن سەلوول هەڵمالی، عەبدوڵلای کوڕی، پشتی پێغەمبەری گرت و لەدژی باوکی وەستاو بەپێغەمبەری فەرموو: (سوێندم بە خودا ئەی پێغەمبەری خودا ! داماوو ناتەوان ئەوە، عەزیزو دلێروتوانا تۆی!) هەروەها فەرمووی: (ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەگەر ڕێگەم پێ بدەی بەدەستی خۆم دەیکوژم) بەلام پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- ڕێگەی پێ نەدا، پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- زۆر لێی ڕازی بوو، وەگەڵێ جار پەسەن و مەدحی ئەوی کردووە، لە شەڕی هەڵگەڕاوەکاندا (ردة) دا،

لەکاتی جێنشینی ئەبوبکری سدیقدا، لەساڵی دوانزەی کۆچییدا، لە یەمامە شەهیدبوو، (رەزای خوای لێ بێ) (بڕ: شەریعەتی ئیسلام، مغنی موحتاج، فیقهی ئاسان، باسی تەرم).

**سێیەم:** ئەم عەبدوڵڵای کوڕی سەلوولە باوکی ناوی ئوبەیی کوڕی مالیکە، سەلوول نەنکییەتی، دایکی باوکییەتی، ژنێ بوو لەهۆزی خوزاعە، ئیبنو سەلوول یەکێك بوو لەسەرۆك هۆزەکانی هۆزی خەزرەج لەمەدینە، هۆزی خەزرەج ـ لەپێش کۆچی پێغەمبەر بۆ مەدینە ـ بڕیاریان دابوو کە ئیبنو سەلوول بکەن بەپادشای خۆیان، بەلام پێغەمبەرو موسوڵمانان دەوڵەتی ئیسلامییان لەمەدینە دامەزراندا، ئەم هەلەی لەدەست چوو لەبەرئەوە هەتا مرد، ئەو کۆنە ڕقەی لە پێغەمبەر بوو، مەشهورە بە سەرۆکی ناپاکەکان، کە لەزاراوەی سوونەتدا ناودارە بەسەرۆکی مونافقەکان. ئیبنو سەلول لەساڵی نۆی کۆچیدا مردووە.

٦١٠- عَنْ جَابِرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: أَتَى النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أُبَيٍّ بَعْدَ مَا دُفِنَ فَأَخْرَجَهُ، فَنَفَثَ فِيهِ مِنْ رِيقِهِ، وَأَلْبَسَهُ قَمِيصَهُ) (الحديث – ١٢٧٠ – أطرافه في: ٣٥٠، ٣٠٠٨، ٥٧٥٩):[٢٣]

جابری کوڕی عەبدولا (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- چووە سەر گۆڕەکەی عەبدوڵڵای ئوبەیی، لەپاش ناشتنی، فەرمانی کرد دەریان هێنا لە گۆڕەکەی، بەئومێدی سوود بۆی تفی دەمی بەفووی خۆیدا لەجەستەیی و، کراسێکی خۆی بۆ موفەرکی لەسەر گۆشتەوە کردەبەری.

٦١١- عَنْ خَبَّابٌ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: هَاجَرْنَا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَلْتَمِسُ وَجْهَ اللَّهِ، فَوَقَعَ أَجْرُنَا عَلَى اللَّهِ، فَمِنَّا مَنْ مَاتَ لَمْ يَأْكُلْ مِنْ أَجْرِهِ

---

(٢٣) أخرجه مسلم في أوائل صفات المنافقين وأحكامهم رقم: ٢٧٧٣

شَيْئًا، مِنْهُمْ مُصْعَبُ بْنُ عُمَيْرٍ، وَمِنَّا مَنْ أَيْنَعَتْ لَهُ ثَمَرَتُهُ، فَهُوَ يَهْدِبُهَا قُتِلَ يَوْمَ أُحُدٍ، فَلَمْ نَجِدْ مَا نُكَفِّنُهُ إِلَّا بُرْدَةً، إِذَا غَطَّيْنَا بِهَا رَأْسَهُ خَرَجَتْ رِجْلَاهُ، وَإِذَا غَطَّيْنَا رِجْلَيْهِ خَرَجَ رَأْسُهُ، فَأَمَرَنَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ نُغَطِّيَ رَأْسَهُ، وَأَنْ نَجْعَلَ عَلَى رِجْلَيْهِ مِنْ الْإِذْخِرِ (احديث ١٢٧٦– اطرافه فى: ٣٨٩٧، ٣٩١٣،٣٩١٤، ٤٠٤٧، ٤٠٨٢، ٦٤٣٢، ٦٤٤٨):

خەبباب (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ لەخزمەت پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەر بێ) کاتێك کۆچمان کرد، مەبەستمان بەس رەزای خوا بوو، ئیتر ئەجرو پاداشی باشمان کەوتە سەر خودا، جا گەلێ کەسمان لێ مردو هیچی لە ئەجرو پاداشتی خۆی لە دونیادا نەخواردوو، گشتی برد بۆ قیامەتی، یەکێ لەم خودا پێداوانەی کە ئەمە حاڵیان بوو، کە مردووە موصعبی کوڕی عومەیر بوو، وەگەلێك کەسیشمان ماوون و لە خودای گەورە بەزیاد بێت، باخەکەیان خەملیوەو پەیتا پەیتا دەیرنن! موصعبی کوڕی عومەیر (رەزای خوای لێ بێ) کە لەغەزای ئوحوددا شەهید کرا، یەك لۆ بەرگی لەپاش بەجێمابوو کەبریتی بوو لەعەبایەك، ئەو عەبایایەیان بۆکرد بەکفن، بەلام ئەویش ئەوەندە نەبوو کە هەموو لەشی داپۆشێ، ئەگەر دەیاندا بەسەر سەریدا قاچەکانی دەردەکەوتن، ئەگەر دەیاندا بەسەر قاچەکانیدا سەری دەردەکەوت ! لەبەرئەوە حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (سەری بەجلەکەی داپۆشن و پوشە سوڕناتك (گیای ئیژخر) یش بدەن بەسەر قاچەکانیدا). (تاج/١/١٢٩/٥).

## راڤەو شیکردنەوە:

خەببابی کوڕی ئەرەتت (رەزای خوای لێ بێ)، یەکێکە لە موسوڵمانە هەرە پێشینەکان، یەکەم کەس بوو کە ئیسلامبوونی خۆی ئاشکرا کرد، لەپێناوی

ئـاینی خـودادا تووشـی ئەشـکەنجەو ئـازاردانێکی زۆربـوو، لـەپێش ئیـسلامدا ئاسنگەر بـوو شمشێری دروست دەکـرد، لـە کۆچکارە پێشینەکانە دەیفـەرموو: هاوبەش پەیداکارەکان ئاگرێکان کردەوە بۆم و بەسەر ئەو ئاگرەدا ڕایان کێشام، قرچە قرچ جەستەم دەسووتا، تـا بـەرە بـەرە بـەزە تواوەکەی لەشـم ئاگرەکـەی کوژاندەوە ! هەتا مـرد چاڵ وچۆڵی ئـەو سـووتانە بەپشتییەوە مـابوو، لـەکاتی بەستنی پـەیمانی برایەتیـدا پێغەمبـەر ‹درووی خوای لەسەر بێ› کـردی بـەبرای جوبـەیری کوڕی عـەتیك، خـەباب ئامـادەی جـەنگی بـەدرو هـەموو شـەرگاکانی تـری پـاش بەدر بوو لەخزمەت پێغەمبـەردا، لـە کوفـە نیشتەجێ بـوو هـەر لـەوێش مـرد، لەساڵی ٣٧ی کۆچیدا، لەو دەمەدا کـە عـەلی کـوڕی ئـەبو تالیـب ‹درووی خوای لەسەر بێ› لـە شەڕی صەفین گەڕایەوە عەلی نوێژی لەسەرکرد، ٦٣ساڵ ژیاوە.

موصعەبی کوڕی عومـەیر (رەزای خوای لێ بێ)، لەموسـوڵمانە هەرەپێـشینەکانە، جوانترین و شۆخ و شەنگترین و تەڕپۆشترین لاوبـوو لەمەککـەدا ئـەو کاتـە موسـوڵمان بـوو کەپێغەمبـەر لـەماڵی ئەرقەمـدا بەدزییـەوە لەگـەڵ موسوڵمانەکاندا کۆ دەبوونەوە، کـە دایـك و بـاوکی پێیـان زانـی پێوەنـدیان کـردو حەپـسیان کـرد، تـا هـەلی بـۆ هەڵکـەوت و هـەڵهاتو کۆچـی کـرد بـۆ حەبەشە، پاشان گەڕایەوە بۆ مەککەو لـەوێوە کۆچـی کـرد بـۆ مەدینـە، لـە پاش عەقەبەی دووەم پێغەمبـەر ‹درووی خوای لەسەر بێ› نـاردی بـۆ مەدینـە، لـەوێ فێری قورئانی دەکردن و شارەزای دەکـردن لـە ئاینـدا، ئـەو یەکـەم کـەس بـوو کـە لـە مەدینـە لـەپێش کۆچـی پێغەمبـەردا نوێـژی هـەینی کـرد بـۆ موسوڵمانەکانی مەدینە، ئامادەی جەنگی بـەدر بـوو، لـە جـەنگی ئوحـوددا ئـالآی ئیـسلام بـەو بـوو، کـە لـەم جەنگـەدا شـەهید کـرا، عـەلی ئالآکـەی هـەلگرت، موصـعب لەتەمـەنی چـل سـاڵیدا لەشـەڕی ئوحـوددا بـە دەسـتی ئیبنو قمئەی لەیسی شەهید کرا (رەزای خوای لێ بێ).

## كفن ئاماده كردن بۆ كاتی مردن دروسته

٦١٢- عَنْ سَهْلٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ امْرَأَةً جَاءَتْ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِبُرْدَةٍ مَنْسُوجَةٍ، فِيهَا حَاشِيَتُهَا، أَتَدْرُونَ مَا الْبُرْدَةُ ؟ قَالُوا: الشَّمْلَةُ، قَالَ نَعَمْ، قَالَتْ نَسَجْتُهَا بِيَدِي فَجِئْتُ لأَكْسُوَكَهَا فَأَخَذَهَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُحْتَاجًا إِلَيْهَا، فَخَرَجَ إِلَيْنَا وَإِنَّهَا إِزَارُهُ فَحَسَّنَهَا فُلانٌ فَقَالَ اكْسُنِيهَا، مَا أَحْسَنَهَا، قَالَ الْقَوْمُ مَا أَحْسَنْتَ لَبِسَهَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُحْتَاجًا إِلَيْهَا، ثُمَّ سَأَلْتَهُ، وَعَلِمْتَ أَنَّهُ لَايَرُدُّ، قَالَ: إِنِّي وَاللَّهِ، مَا سَأَلْتُهُ لِأَلْبَسَهَا، إِنَّمَا سَأَلْتُهُ لِتَكُونَ كَفَنِي قَالَ سَهْلٌ فَكَانَتْ كَفَنَهُ (الحديث ١٢٧٧- اطرافه في: ٢٠٩٣).

سەهلی كوڕی سەعد (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئافرەتێ پارچەیە شاڵی هێنا بۆ پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- هێشتا ڕیشووەكانی هەر پێوە مابوو، هەر تۆپ بوو نەبڕابوو، ئەو پارچە شاڵە بەشی بالاپۆشێكی دەكرد، خۆ دەزانن بالاپۆش چییە؟ گوتییان: بەڵێ عابایە، كە هەموو لەش دادەپۆشێ - ژنەكە گووتی: ئەی ڕەوانە كراوی یەزدان ! بەدڵ و بەداو، بەدەستی خۆم ئەم پارچە شاڵەم چنییوە بۆ تۆ كە بۆ خۆت لەبەری بكەی، پێغەمبەریش -درودی خوای لەسەر بێ- ئاتاجی بە شاڵەكە هەبوو وەریگرت، ڕۆژێ ئەو شاڵەی كرد بوو بەئیزارو لەباتی دەرپێ ئاڵاندبووی بەلای خوارووی خۆیەوەو تەشریفی هات بۆ ناومان، جا پیاوێ كە ناوی فیسار بوو، دەستی دا لەقوماشەكەی وگوتی: بەڕاستی جوان و چاكە، ئەی پێغەمبەری خودا ! ئەم شاڵەم بدەرێ تا لەبەری بكەم، فەرمووی -درودی خوای لەسەر بێ- : (باشە) جاچەندە حەزی خودای لەسەر بوو، پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- ئەوەندە لەناو كۆڕەكەدا مایەوەو پاشان گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، لەوێ شاڵەكەی پێچایەوەو ناردی بۆی، خزمانیش پێیان گووت: جوان نەبوو داوای ئەو شاڵەت لێكرد، ئەو خۆی ئاتاجی پێی هەبوو، ئەوەبوو لەبەری كردبوو،

تۆ خۆت دەزانیت کە ئەو (درودی خوای لەسەر بێ) داواکار نائومێد ناکا، کەواتە نەدەبوو داوای بکردایە. پیاوەکەش (کە هەندێ دەڵێن: عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف بووە، وە هەندێ دەڵێن: سەعدی کوڕی ئەبو وەقاس بووە، گوتی: بەخودا بۆ ئەوەم داوا نەکردووە کە لەبەری بکەم وەك ئێوە وادەزانن، بەلاّم بۆ ئەوە داوایم کردووە، کە هەڵی بگرم بۆ ئەو ڕۆژەی دەمرم، تابیێ بەکفنم. سهل (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئاواتەکەی هاتەدی، کە مرد ئەو شاڵە بوو بەکفنی، خۆزگەم بەخۆی. (بڕ/ تاج /١٠٦/٤ ف/٦).

### راڤەو شیکردنەوە:

لەکۆی فەرموودەکانی ئەم باسەوە ئەوەی کە لەشەرعی پیرۆزدا پێی دەگوترێ (التَبَرُكَ بِآثارِ الصَّالِحِين) بەباشی رەنگ دەداتەوە.

## چوونی ژنان لەگەڵ تەرما بۆ گۆڕستان

٦١٣- عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْها قَالَتْ: نُهِينَا عَنْ اتِّبَاعِ الْجَنَائِزِ وَلَمْ يُحْزَمْ عَلَيْنَا. (الحديث ١٢٧٨):[٢٤]

ئوممو عەتییە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئێمەی ژنان نەهیمان لێکراوە لە شوێنکەوتنی تەرم کە لەگەڵیدا بچین بۆ گۆڕستان، بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا یاساغ نەکراوە لێمان کە لەگەڵ تەرمدا بڕۆین بۆ سەر قەبران و ئامادەی ناشتنی بین (تاج /٧/٥٦٩/١)

(٢٤) أخرجه مسلم في الجنائز باب: نهي النساء عن إتباع الجنائز (ج/٧ ص/٢ صحيح مسلم بشرح النووي). —المترجم-

واتە: چوونی ژنان لەگەڵ تەرمی مردوودا بۆ گۆڕستان و ئامادە بوونی ڕێ و ڕەسمی ناشتنی تەرم، لەلایەن ژنانەوە، ناباشە، واتا: کەراهەتی هەیە، بەلاّم حەرام نییە.

## ماتەم دانانی ژن لە سێ ڕۆژ بۆ غەیری مێردی

٦١٤- عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْها زَوْجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (لاَ يَحِلُّ لِامْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ، تُحِدُّ عَلَى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلَاثٍ، إِلَّا عَلَى زَوْجٍ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا). (الحديث ١٢٨١ - اطرافه في: ٥٣٣٥، ١٢٨٢، ١٢٨٠).[٢٥]

حومەیدی کوڕی ناخع (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: زەینبی کچی ئوم سەلەمە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ ئەبو سوفیان مرد کە باوکی ئوم حەبیبەی هاوسەری پێغەمبەر بوو، بەم بۆنەیەوە چوون بۆلای، ڕوانیم ئوم حەبیبە داوای بۆنێکی گیراوەی کرد، کەمێ زەعفەرانی تێدابوو، جا هەردوو دەستی کرد بەناویداو ئینجا دەستەکانی هێنا بەسەری کەنیزەکەکەدا، هەتا دەستی بۆنی کەمی پێوە بمێنێت ئینجا دەستی سووی بەهەردوولا ڕوومەتی خۆیداو، بۆنیدا لەخۆی و تازیێ شکاندو فەرمووی: بەو خودایەی کە هەرخۆی خودایە هیچ کارێکم بەبۆنی خۆش نییە، بەلاّم بۆ ئەوە بەکاری دەهێنم چونکە لەپێغەمبەرم ژنەوت -درودی خوای لەسەر بێ- لەسەر دووانگە دەیفەرموو: (ئەو ژنەی باوەڕی بەخوداو، بەڕۆژی دواییی هەیە، دروست نییە بۆی: کە لەسێ ڕۆژ زیاتر پرسەو ماتەم بگێڕێت بۆ مردوو مەگەر بۆ مێردێ، کەدەبێت بۆ ئەو چوارمانگ و دە شەو تازێ باربێت بۆی). (تاج/٣/١٨٧-٤).

---

(٢٥)أخرجه مسلم في الطلاق، باب: وجوب الإحداد في عدة الوفاة (صحيح مسلم ج/١٠/١١٢). -المترجم-

## راڤەو شیکردنەوە:

ئوم حەبیبەی هاوسەری پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- ناوی ڕەملەی کچی ئەبوسوفیانی کوڕی سەخرە، خوشکی حەزرەتی موعاویەیە. لەپێش پێغەمبەرایەتیدا بە حەڤدە ساڵ لەدایك بووە، لەموسوڵمانە پێشینەکانە، کۆچی کرد بۆ حەبەشە لەوێ بێوەژن کەوت، ئوم حەبیبە دەفەرموێت پیاوێ لەخەومدا پێی فەرمووم: (ئەی دایکی موسوڵمانان !) لەم خەونە شڵەژام، زۆری پێ نەچوو، هەر کە عیدەی شەرعیم تەواوبوو پاشای حەبەشە کەنیزەکێکی نارد بۆ لام و خوازبێنی کردم بۆ پێغەمبەرو شووم پێکرد، خالیدی کوڕی وەلیدم کردە وەکیلی خۆم، وەکیلی پێغەمبەریش جەعفەری کوڕی ئەبوتالیب بوو، نەجاشی لەجیاتی پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- چوارسەد لیرەی زێڕی کرد بە مارەییم، خالید وەریگرت و دوایی دایەوە بەخۆم.

لەباسی مارەییدا، لەبەرگی سێی تاجول ئوصولدا، ئوم حەبیبە دەفەرموێ: ژنی عەبدوڵلای کوڕی جەحش بووم، لە وولاتی حەبەشە ئەمری خودای کرد، جا نەجاشی شای حەبەشە مارەی بڕیم لە پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- وە نەجاشی خۆی چوارهەزار درەم مارەیی لەباتی پێغەمبەردا پێم، ئەوجا لەگەڵ شورە جبیلی کوڕی حەسەنەدا ناردمی بۆ پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- (تاج/٣/٧٨-٣ + تاج/١٥٨/٥ ز/٣٩).

ئوم سەلەمە نزیکەی هەشتاوسێ ساڵ ژیاوە، چونکە لە اصابەدا دەفەرموێ: بەحەڤدە ساڵ لە پێش پێغەمبەرایەتیدا لەدایك بووە، وە لەمەدینە لەساڵی پەنجاو چواری کۆچیدا مردووە. دەی ١٧+١٢+٥٤=٨٣ ساڵ.

زۆرکەس فەرموودەی لە ئوم حەبیبەوە گێڕاوەتەوە، دوو فەرموودەی لە بوخاریدا هەیە. حەزرەتی عائیشە دەفەرموێ لەکاتی سەرەمەرگدا، ئوم

حەبیبە ناردی بەدوامدا، فەرمووی: خۆت دەزانی من وتۆ هەوێی یەکتری بووین، هەوێش لەوەزەنی هەوێ ڕزگاری نابێت، کەواتە بەخەیری خۆت گەردنم ئازاد بکە، منیش گەردنیم ئازادکردو لەخودا پاڕامەوە بۆی کە لەگوناهی خۆش بێت، ئەویش پێی فەرمووم: بەڕاستی دڵت خۆش کردم خوا دڵت خۆش بکات.

# دێنی و سەردانی گۆڕو گۆڕستان

٦١٥- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: مَرَّ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِامْرَأَةٍ تَبْكِي عِنْدَ قَبْرٍ، فَقَالَ (اتَّقِي اللَّهَ وَاصْبِرِي). قَالَتْ: إِلَيْكَ عَنِّي فَإِنَّكَ لَمْ تُصَبْ بِمُصِيبَتِي، وَلَمْ تَعْرِفْهُ، فَقِيلَ لَهَا إِنَّهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَتَتْ بَابَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلَمْ تَجِدْ عِنْدَهُ بَوَّابِينَ، فَقَالَتْ لَمْ أَعْرِفْكَ، فَقَالَ: (إِنَّمَا الصَّبْرُ عِنْدَ الصَّدْمَةِ الْأُولَى) (الحديث ١٢٨٣)[٢٦]

پێشەوا ئەنسی کوڕی مالیك (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ژنێك لەسەر گۆڕی منداڵێکی خۆی دەگریا، پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- لەلایەوە ڕەت بوو پێی فەرموو:(ئافرەت! لەخودا بترسەو دان بەخۆتا بگرەو ئارام بگرە، لەبەرباری خودادا). ژنەکەیش نەیناسی کەئەوە پێغەمبەرە، گوتی پێی: بەولاوە! تۆ ئاگات لە دەردی من نییە، لەپاشدا پێیان ووت ئەوە پێغەمبەر بوو، ژنەکەیش چوو بۆ ماڵی پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- ڕووانی کەدەرگاوانی لێ نییە، گووتی: ئەی پێغەمبەری خوا لێم مەگرە کە ئەو قسە زەق و ڕەقەم لەڕووی تۆدا، چونکە نەمناسیت، فەرمووی -درودی خوای لەسەر بێ-: (ئەو

---

(٢٦) أخرجه مسلم في الجنائز باب: الصبر علي المصيبة عند الصدمة الأولي ج/ ٦ ص ٢٢٧.
-المترجم-

صەبرو ئارام و خۆڕاگرتنەی کەخودا پێی خۆشە، دەشێ لەسەرەتای خۆرپە لێکەوتنەوە بێت).(تاج/١/٥٣٢-٢/- س /د/ت/ن)

## گریان بۆ مردوو، ڕەواو نارەوای

٦١٦- عَنْ أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ قَالَ أَرْسَلَتْ ابْنَةُ النَّبِيِّ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَيْهِ: إِنَّ ابْنًا لِي قُبِضَ فَأْتِنَا، فَأَرْسَلَ يُقْرِئُ السَّلَامَ، وَيَقُولُ: (إِنَّ لِلّٰهِ مَا أَخَذَ وَلَهُ مَا أَعْطَى، وَ كُلٌّ عِنْدَهُ بِأَجَلٍ مُسَمًّى فَلْتَصْبِرْ وَلْتَحْتَسِبْ). فَأَرْسَلَتْ إِلَيْهِ تُقْسِمُ عَلَيْهِ لَيَأْتِيَنَّهَا، فَقَامَ وَمَعَهُ: سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ، وَمَعَاذُ بْنُ جَبَلٍ، وَأُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ، وَزَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ، وَ رِجَالٌ، فَرُفِعَ إِلَى رَسُولِ اللّٰهِ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الصَّبِيُّ وَنَفْسُهُ تَتَقَعْقَعُ، قَالَ حَسِبْتُهُ أَنَّهُ قَالَ: كَأَنَّهَا شَنٌّ، فَفَاضَتْ عَيْنَاهُ، فَقَالَ سَعْدٌ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ، مَا هَذَا ؟ فَقَالَ: (هَذِهِ رَحْمَةٌ جَعَلَهَا اللّٰهُ فِي قُلُوبِ عِبَادِهِ، وَإِنَّمَا يَرْحَمُ اللّٰهُ مِنْ عِبَادِهِ الرُّحَمَاءَ). (الحديث ١٢٨٤- اطرافه في:٧٣٧٧،٦٦٥٥،٦٦٠٢،٥٦٥٥، ٧٤٤٨):[٢٧]

ئوسامەی کوڕی زەید (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: کچێکی پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- کە ناوی زەینەب بوو، ناردی بەشوێن باوکیا: کەوا کوڕەکەم گیان دەدا، تەشریفت بێنە بۆلامان، پێغەمبەریش -دروودی خوای لەسەر بێ- بەڕابەرەکەدا سڵاوی بۆناردو فەرمووی: پێی بڵێ: ئەوەی خودا دەیدا بەبەندەی خۆی هەتا ماوەیەك و لەپاشا دەیباتەوە بۆ خەزێنەی خۆی هی خۆیەتی، وە هەمووشتێکیش لەلای خودا ماوەیەکی دیاریکراوی هەیەو کەئاکامی هات ئیتر پاش و پێشی نیەو ماوەی بەسەردەچێ! کەوابوو پێی بڵێ: باصەبرو ئارام بگرێ، ساغ لەبەر رەزای خودای گەورە، بەڵام دیسانەوە کچەکەی

---

(٢٧) أخرجه مسلم في الجنائز باب: البكاء علي الميت، رقم: ٩٢٣

ناردییەوە بە شوێنیداو سوێندی لێ خوارد کە دەبێ هەر تەشریف بهێنێ بۆلای، پێغەمبەریش -دروودی خوای لەسەر بێ- هەڵسا لەگەڵ سەعدی کوڕی عوبادەو موعاذی کوڕی جەبەل و ئوبەیی کوڕی کەعب و زەیدی کوڕی پابیت و چەند پیاوێکی تردا چوون بۆلای، کە منداڵەکەیان هێنا بۆ پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- گیانی دەداو هەناسەی سوار بووبوو، وەك کوندەیێ کە بیژەنی بەدەم گیانەڵانەوە دەهات و دەچوو، جاهۆن هۆن فرمێسك بەچاوەکانی پێغەمبەردا -دروودی خوای لەسەر بێ- هاتە خوارەوە، سەعدیش (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەم گریانە چییە ؟ فەرمووی: ئەمە سۆزوڕەحمە خودا دەیخاتە دڵی بەندەکانی خۆیەوە، وەخودای گەورە لەناو بەندەکانی خۆیدا تەنیا ڕەحم بەوانە دەکات، کە بەڕەحم و میهرەبانن). (تاج/١/ ١/٥٨٨- ش/د/ن).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

پەندو عیبرەت لەم جۆرە فەرمودانەدا ئەوەیە کە موسوڵمان لە هەموو بۆنەو کاتێکا، پێغەمبەر بکا بەسەر مەشق. ئیسلام حەزدەکا کە موسوڵمان گەشبین بێ، ڕەشبین نەبێ، هەمیشە لەگەڵ خەڵکا ڕوو خۆش و قسە شیرین و ڕەفتار جوان و کراوەبێ، چەندەی لە توانادایە هەوڵ بدات کە باریان سووك بکا. خەمیان بڕەوێنێتەوە، ببێ بەمایەی سەبوری و خەم و پەژارەیان، پاداشی باشی گەورەی خۆیان لای خوا یاد بخاتەوە، بۆ ئێمە لەم سەردەمە ناسکەدا، کە هەوری خەم وەك توێژاڵی تەم باڵی کێشاوە بەسەر میناى دڵ و دەروونی هەموو کوردێکی مەردو موسوڵمانی پاکدا، عەرزی خوشك و برایان دەکەم، کەنائومێد نەبن، جڵەوی صەبروشەکیبایی‌و خۆگریی، لەکاتی لێقەومانی کارەسات و ڕووداوی

دڵتەزێندا لەدەست نـەدەن، تەسلیم بەخـەم و خەفـەت و ڕەشـبینی نـەبن، بابزانن کە کاری موسوڵمان هەموو هـەرخێرە، هەرچی تووشی موسـوڵمان دەبێ، دەبێ بەمایەی ڕەحمەت، دەبێ ئەوانـەی کـە ئازیزییێکیـان لـە دەسـت دەچێ، پێغەمبەری ئازیزو نازدار بکەن بەپێشەواو سەرمەشق بۆ خۆیـان، لەڕاستیدا ئەو هـەموو ئـازیز مـردن و ناخۆشیی و زەحمەتـەی کـە بەسـەر پێغەمبەردا ـدروودی خوای لەسەر بێـ هاتووە، بۆ ئەوەیە کە یەك بەیەك ڕووداوەکانی ژیانی پێغەمبەر، ببن بەسەر مەشق بۆ ئێمە، پێغەمبەری خوا ـدروودی خوای لەسەر بێـ لـە سکی دایکیـدا بـاوکی دەمـرێ، لەهـەتیوی دەرناچـێ دایکی دەمـرێ، هـەروا بـاپیرەی ـ کـە داڵـدەی بـووە ـ ئـەویش دەمـرێ، لـە شـەش منـاڵ، پێنجیان لە پێش خۆیدا دەمرن، وەك ئیمامی جەزەری لە (ذات الشفاء) دا دەفەرمووێ:

**وَكُلُّهُم قَدْ مَاتَ فِى حَيَاتِهِ إلاَّ البَتُولَ فَإنَّى وَفَاتِهِ**

واتە:

**مناڵی، یەك یەك، بەر لەخۆی مردن بەس فاتیمە ما، تا وەفات کردن**

حیکمـەتێکی تـری ئـەم لایەنـەی ژیـانی پێغەمبـەر ـدروودی خوای لەسەر بێـ ئەوەیە: کە کەس نەڵێ: ئەم مناڵەمان شووم بوو، یاپێی ڕەش بوو، یا ئەمە سەرەخۆرەیە، سەری باوکی خوارد، یا گوتەی بێبایەخی تری لـەم بابەتـە. پێغەمبەر ـدروودی خوای لەسەر بێـ دەفەرموێ: (لاَ طَيَرَةَ وَخَيْرُها اَلفَألُ): (نە نوقلانەی خراپ هەیەو، نـە پـێ ڕەشـی و بـەدقوومی هەیـە، بـەڵام باشـترین نوقلانـە نوخشە لێدانە). کەواتە دروستە بڵێین: ئەم منداڵە سەری بە ڕزقە، یا ئەم دوکانە پێوقدومی باشە! یا مـن چـووم بـۆ حـەج نوخشەش بـێ لـە تـۆش، چونکە ئەمەیان زیانی بۆ کەس نییە، بـەڵکوو دەبـێ بـەهۆی خۆشەویستی زیاتر. وەك ئەوەی کە حەلیمەی سەعدییە پێغەمبەری بردەوە، بۆیان بـوو

بـەهۆی گوشـاد بـوونی رزق و رۆزی. لـە مامۆسـتا بـەرێزەکانی خـۆمم بیـستووە، لـەولاتی خۆمانـا، پیرەژنـی خواناسـی وابـووە کـاتێ سـولتان لەئەسـتەمبولْ گـۆڕاوە، ئـەو لێـرە هەسـتی پێکـردووە، بـەوەدا کـە مانگـا شیردەرەکەی، بەرەکەت کەوتووەتە شیری !

٦١٧- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: شَهِدْنَا بِنْتًا لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: وَرَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جَالِسٌ عَلَى الْقَبْرِ، قَالَ: فَرَأَيْتُ عَيْنَيْهِ تَدْمَعَانِ، قَالَ: فَقَالَ: (هَلْ مِنْكُمْ رَجُلٌ لَمْ يُقَارِفْ اللَّيْلَةَ) فَقَالَ أَبُو طَلْحَةَ أَنَا، قَالَ: (فَانْزِلْ) قَالَ: فَنَزَلَ فِي قَبْرِهَا. (الحديث ١٢٨٥- طرفه في ١٣٤٢).[28]

ئەنەسـی کـوڕی مالیـك (رەزای خـوای لێ بـێ) فـەرمووی: لەگـەڵ تـەرمی کـچێکی پێغەمبـەردا -دروودی خوای لەسەر بێ- چـووین بـۆ سـەرقەبران، فـەرمووی: پێغەمبـەرم بینـی لەسـەر لێـواری گۆڕەکـە دانیـشتبوو، تەماشـایم کـرد هەردووچـاوی پێغەمبـەر هـۆن هـۆن فرمێسکیان پێـدا دێتـە خـوارەوە جـا فـەرمووی: (ئایـا پیاوێکتـان واتیـادا کـە ئـەم شـەو ئـەو ئیـشەی نـەکردبێت!). ئەبوتەلحـە فەرمووی: (بەڵێ من) فەرمووی -دروودی خوای لەسەر بێ-: (دەتـۆ دابـەزە نـاو گۆڕەکـەوە) ئەویش دابەزییە ناوگۆڕەکەوەو تەرمی مردووەکەی داگرتە ناویەوە.

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

ئەم کچەی پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- ناوی ئوم کـەلپوم بـوو، سـاڵی نـۆی کۆچی مردووە، هاوسەری ئیمامی عوسمان بووە.

ئەبو تـەلحە ناوی زەیدی کوری سـەهلی ئەنـصاریی بـوو، خـەزرەجییـە،

(٢٨) لم يوافقه مسلم غلي تخريجه، قاله العسقلاني في خاتمة كتاب الجنائز، أنظر فتح الباري المجلد الثالث، الصحيفة ٣٠٦. -المترجم-

لەهەموو غەزەواتەکانی پێغەمبەردا ئامادە بووە، پێغەمبەر درودی خوای لەسەر بێ لە وەسفی دلێری ئەودا دەفەرمووێ: (تەنها دەنگی ئەبو تەلحە لەناو سوپای ئیسلامدا لە سەد پیاو باشترە). لە ڕۆژی شەڕی حونەیندا بیست پیاوی لە بێبڕواکان کوشت و چەك و کەلوپەلەکانیانی گشت بەتالآن گرت، لە شەڕو غەزاکاندا خۆی دەکرد بە سوپەرو پەردە بۆ پێغەمبەر درودی خوای لەسەر بێ وە دەیفەرموو: (ئەی پێغەمبەری خوا ڕۆحم دەکەم بەقوربانی ڕۆحی تۆ). بڕوانە (تاج /١/١٧٩/٥)

٦١٨- عَنْ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِنَّ الْمَيِّتَ يُعَذَّبُ بِبَعْضِ بُكَاءِ أَهْلِهِ عَلَيْهِ) (الحديث ١٢٨٧- طرفاه في: ١٢٩٠- ١٢٩٢).

قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: فَلَمَّا مَاتَ عُمَرُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ذَكَرْتُ ذَلِكَ لِعَائِشَةَ (رضى الله عنها) فَقَالَتْ: رَحِمَ اللَّهُ عُمَرَ، وَاللَّهِ مَاحَدَّثَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِنَّ اللهَ لَيُعَذِّبُ الْمُؤْمِنَ بِبُكَاءِ أَهْلِهِ عَلَيْهِ، وَلَكِنْ رِسُوُلُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِنَّ اللَّهَ لَيَزِيدُ الْكَافِرَ عَذَابًا بِبُكَاءِ أَهْلِهِ عَلَيْهِ) وَقَالَتْ: حَسْبُكُمْ الْقُرْآنُ: (وَلاَ تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى). (الحديث ١٢٨٨ - طرفاه في ١٢٨٩- ٣٩٧٨):[٢٩]

کاتێ پێشەوا عومەر (رەزای خوای لێ بێ) پێکرا، صوهەیب (رەزای خوای لێ بێ) هاواری لێ هەڵسا دەیگوت: ئای براڕۆ ! عومەریش فەرمووی: ئەوە چۆن وادەڵێیت، ئەدیی نازانی کە پێغەمبەر درودی خوای لەسەر بێ ڕێگەی شتی وای نەداوە، ئەوەتا دەفەرمویێ: (مردو سزا دەدرێ بەهۆی هەندێ لەو گریانەوە کە کەس و کارەکەی لەسەری دەگرین).

(٢٩) أخرجه مسلم في الجنائز، باب: الميت يعذب ببكاء أهله عليه، رقم: ٩٢٧، ٩٢٨، ٩٢٩

ئیبنوعەباس (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ عومەر (رەزای خوای لێ بێ) بەو پێکرانە مردن قسەکەی عومەرم گێڕایەوە بۆ عائیشە: کە گوایە مردو سزا دەدرێ لەسەر ئەو گریانەی کە کەسوکارەکەی بۆی دەکەن، عائیشە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: رەحمەتی خوا لە عومەر، عومەر پیاوی درۆ نەبوو، بەلاّم یا باش لە یادی نەماوە، یا بە هەڵەدا چووە، چونکە بەخودا پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێ- سەروماڵ و حاڵ و هەست و نەست بەقوربانی گەردی سەرگۆڕی پیرۆزی بێ - وەهای نەفەرموو، نەیفەرموو کە موسوڵمان بەهۆی گریانی کەسوکاری لەسەری ئێش وئازار دەدرێ، بەلاّم فەرمووی - دروودی خوای لەسەر بێ- : (کافرو بێبڕوا کە کەسوکاری بۆی دەگرین، خودا بەهۆی ئەوەوە ئەوەندەی تر ئێش و ئازاری گرانتر دەکا). عائیشە فەرمووی: دەقی ئایەتی قورئانتان بەسە بۆ شایەتی ڕاستی و دروستی ئەم قسەی من، کە دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى/ الانعام /١٦٤/٦ واتە: هیچ کەسێ با گوناهباریش بێ، باروگوناهی کەسێکی تر، جگە لە خۆی هەڵناگرێ﴾. (بڕ: تاج/١ / ٥٢٧ / ٣ + ز – ١٩٦، ز ١٩٧، ١٩٨) + (فقهی ئاسان بەرگی /١ لاپەڕە /٢٧٥).

٦١٩– عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا زَوْجَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَتْ: إِنَّمَا مَرَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى يَهُودِيَّةٍ يَبْكِي عَلَيْهَا أَهْلُهَا، فَقَالَ: (إِنَّهُمْ لَيَبْكُونَ عَلَيْهَا، وَإِنَّهَا لَتُعَذَّبُ فِي قَبْرِهَا).(الحديث ١٢٨٩– طرفاه في: ١٢٨٨، ٣٩٧٨):[30]

عائیشە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەبو عەبدولڕەحمان خوا لێیخۆش بێت پیاوی درۆنییە کەوا دەفەرمووێ، بەلاّم یا باش لەیادی نەماوە، یا بەهەڵەدا چووە، چونکە شتەکە خۆی ئاوا بوو، جارێ پێغەمبەر -درودی خوای

(٣٠) أخرجه مسلم في الجنائز، باب: الميّت يُعذّبُ ببكاء أهله عليه رقم: ٩٣٢

لسەر بێ له لای گۆڕی ژنە جوولەکەیەکەوە ڕەت بوو، کەچی کەسوکارەکەی لەسەری دەگریان، فەرمووی: (ئەوان لەسەری دەگرین، کەچی ئەویش لە گۆڕەکەیدا سزا دەدرێ) (تاج/١/٥٢٨-ش/د/ت/ن).

٦٢٠- عَنْ الْمُغِيرَةِ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (إِنَّ كَذِبًا عَلَيَّ لَيْسَ كَكَذِبٍ عَلَى أَحَدٍ، مَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنْ النَّارِ) وسَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (مَنْ نِيحَ عَلَيْهِ يُعَذَّبُ بِمَا نِيحَ عَلَيْهِ) (الحديث ١٢٩١): [٣١]

موغیرە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەگوێی خۆم لەزاری پیرۆزی پێغەمبەری ئازیزو نازدارم بیست دەیفەرموو: (درۆ بەدەم منەوە وەك درۆ بەدەم کەسێ ترەوە نییە هەرکەسێ بەئارەزوو بەدەم منەوە درۆ هەڵبەستێ باجێ فنگی خۆی لەناو ئاگری دۆزەخا خۆش بکات). وەهەروەها لێیم ژنەووت دەیفەرموو (هەرمردوویێ شین و زاری لەسەر بکرێ بەهۆی ئەو شین و زارییەوە سزا دەدرێ). (تاج ١/٥٢٦/١ + ژمارە /٨٩ و٩٠ کە لەپێشەوە ڕابوون.

٦٢١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لَيْسَ مِنَّا مَنْ لَطَمَ الْخُدُودَ وَشَقَّ الْجُيُوبَ وَدَعَا بِدَعْوَى الْجَاهِلِيَّةِ) (الحديث ١٢٩٤- اطرافه في: ١٢٩٨،١٢٩٧، ٣٥١٩): [٣٢]

عەبدوڵلا (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (ئەوەی ڕوومەت برنێتەوەو یەخە دابدڕێ و بانگەوازی سەردەمی نەزانی پێش هاتنی ئیسلام هەڵ بدات لە ئێمە نییە) (تاج/١/٥٢٤/١-ش/ت/ن).

---

(٣١) اخرجه مسلم شطره الأول في المقدمة، باب: تغليظ الكذب علي رسول الله رقم:٤ وشطره الثاني في الجنائز، باب الميت يعذب ببكاء اهله عليه رقم: ٩٣٣

(٣٢) اخرجه في الأيمان، باب: تحريم ضرب الخدود، رقم: ١٠٣

**راقەو شیکردنەوە:**

عەبدوڵلاکان کەهاوڕێی پێغەمبەربوون چەند کەسێکن: عەبدوڵلای کوڕی عەبباس و عەبدوڵلای کوڕی مەسعودو چەندین عەبدوڵلا ناوی ترن کە لەئیصابەو ئیستیعاب و چەندین پەڕاوی تری لەبابەتی ئەمانە ناویان تۆمار کراوە لەناو هاوڕێیانی پێغەمبەردا ـدروودی خوای لەسەر بێـ جاپاش ئەمە دەڵێین: هەرکاتێ فەرموودەیێ لە (عەبدوڵلا) وە گێڕرایەوە، لەسەر ئەم شێوەیەی ئێرە، کە هەرناوی خۆی براوە، ناوی باوکی نەبراوە، ئەوە مەبەست عەبدوڵلای کوڕی مەسعوودە، کە ناسراوە بە ئیبنو مەسعوود.

مەبەست لەوە کە دەفەرموێ (لەئێمە نییە) دەرکردنی نییە لە بازنەی ئیسلام، بەڵکوو مەبەست هەڕەشەیە، دەنا موسوڵمان بەکردنی هیچ تاوانێ ـ بێجگە لە هاوبەش پەیداکردن بۆ خوداو باوەڕ نەکردن بە پێغەمبەر ـ کافر نابێ.

## باسی ڕاسپێری و بەزەیی هاتنەوە بەمردوودا

٦٢٢– عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ عَنْ أَبِيهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَعُودُنِي عَامَ حَجَّةِ الْوَدَاعِ مِنْ وَجَعٍ اشْتَدَّ بِي، فَقُلْتُ إِنِّي قَدْ بَلَغَ بِي مِنَ الْوَجَعِ وَأَنَا ذُو مَالٍ، وَلَا يَرِثُنِي إِلَّا ابْنَةٌ، أَفَأَتَصَدَّقُ بِثُلُثَيْ مَالِي ؟ قَالَ: (لَا) فَقُلْتُ: بِالشَّطْرِ ؟ فَقَالَ: (لَا). ثُمَّ قَالَ: (الثُّلُثُ وَالثُّلُثُ كَبِيرٌ أَوْ كَثِيرٌ، إِنَّكَ أَنْ تَذَرَ وَرَثَتَكَ أَغْنِيَاءَ خَيْرٌ مِنْ أَنْ تَذَرَهُمْ عَالَةً يَتَكَفَّفُونَ النَّاسَ وَإِنَّكَ لَنْ تُنْفِقَ نَفَقَةً تَبْتَغِي بِهَا وَجْهَ اللَّهِ إِلَّا أُجِرْتَ بِهَا حَتَّى مَا تَجْعَلُ فِي فِي امْرَأَتِكَ). فَقُلْتُ يَارَسُولَ اللَّهِ أُخَلَّفُ بَعْدَ أَصْحَابِي؟ قَالَ: (إِنَّكَ لَنْ تُخَلَّفَ فَتَعْمَلَ عَمَلًا صَالِحًا إِلَّا ازْدَدْتَ بِهِ دَرَجَةً وَرِفْعَةً ثُمَّ لَعَلَّكَ أَنْ تُخَلَّفَ حَتَّى يَنْتَفِعَ بِكَ أَقْوَامٌ وَيُضَرَّ بِكَ

آخَرُونَ، اللَّهُمَّ أَمْضِ لِأَصْحَابِي هِجْرَتَهُمْ وَلَا تَرُدَّهُمْ عَلَى أَعْقَابِهِمْ لَكِنْ الْبَائِسُ سَعْدُ بْنُ خَوْلَةَ) (الحديث ١٢٩٥): [٣٣]

سەعدی کوڕی ئەبو وقاص (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ساڵی حەجیماڵئاوایی، کەناسراوە بەساڵی حەججەتولوەداع (حَجّه الوَداع)، لەمەککە نەخۆشکەوتم، کە شەنگ بووم، خەریکبووم بمرم، پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- هات بۆ سەردان و هەواڵ پرسیم. عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خوا! دەمبینی کەنەخۆشی چی لێ کردووم، ماڵێکی زۆریشم هەیە، تاقە کچێکیشم هەیە کە کەلەپوورو میراتم لێ بگرێ، جادەمەوێ دووبەش لەسێ بەشی ماڵەکەم بکەم بە خێرو وەسێت و راسپێری، لە پاش مردنم بۆم بکرێ بەخێر، تۆ فەرمانت چییە، شتەوا دروستە یان نا؟

فەرمووی: (نەوە دروست نیە) گوتم دە نیوەی؟ فەرمووی: (ئەویش نابێ). گوتم: دە سێ یەکێکی ؟ فەرمووی -دروودی خوای لەسەر بێ- سێیەك دەبێ، بەلام سێیەکیش هەر زۆرە، کەمتر بێ باشترە، چونکە تۆ لەپاش مردنی خۆت، کەلەپوور گرەکانت بەدەوڵەمەندی و تێروتەسەلی بەجێ بهێڵیت، گەلێ لەوە باشترە کە بە هەژاری بەجێیان بهێڵی، لەپ لەم ولەو پان بکەنەوەو چاویان لە دەستی خەڵك بێ !

ئەوەیش بزانە هەرچی خەرج بکەی لەبەر ڕەزای خودای گەورە، ئەوا پاداشتی باشی لەسەر وەردەگریت، تەنانەت ئەو پاروەوە نانەیش کە دەیدەیت بە ژنی خۆت، یا ئەو مەصرەفەی کە دەیکەی بۆ خێزانی خۆت، کە ژێواریان لەسەر تۆیە، ئەم جۆرە مەسرەفەیش، بەمەرجێ بە نیازی پاك بێ، ئەویش هەر خێرێکی گەورەیە).

---

(٣٣) أخرجه مسلم في الوصية، باب: الوصية بالثلث، رقم: ١٦٢٨

عەرزیم کرد: قوربان ! ئەی پێغەمبەری خودا ! دەترسم لەهاورێکانم بەجێ بمێنم و لەم نەخۆشییەدا لە مەککە بمرم و نەگەڕێمەوە لەگەڵ ئێوەدا بۆ ڕەوگەی کۆچ و داری هیجرەتم ؟! وە ئەوەیش بۆ کۆچەکەم زیانی هەبێ ؟! فەرمووی: (بابەجێش بمێنێ، گرنگ ئەوەیە تۆ بەنیازی پاکی خۆت دەگەی هەر کارێ بکەی، لە هەر کوێ بێ، بەمەرجێ مەبەستت ڕەزای خودا بێ پێی، ئەوە پایەوپلەت پێی بەرزتر دەبێتەوە، ئومێد دەکەم کە جارێ نەمری و بمێنی و تەمەنت درێژبێ و خوا بتکا بەمایەی خێرو خۆشی بۆ گەلی موسوڵمانان و ببی بەهۆی زیان و شکستی بۆ هۆزی کافران، ئەی خودایە ! کۆچ و هیجرەتی هاورێکانم گیرا بکەو پاشگەزیان مەکەرەوەو ئاخر شەڕیان مەکە، بەلاّم داخەکەم هەژارە سەعدی کوڕی خەولە لەمەککە مرد، بۆیە پێغەمبەر ـدروودی خوای لەسەر بێـ بەزەیی پیادا هاتەوەو دڵی پێی سووتا). (تاج/٣/٢٧/١-ش/د/ن) + (ریاض/١/١٣/٦-کوردی)

**ڕاڤەو شیکردنەوە:**

سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص لەپاش ئەم نزایەی پێغەمبەر بۆی، چل ساڵی تر ژیا، خوا پیت و فەڕی خستە تەمەنی.

## شین و شەپۆڕو ڕوومەت و قژ ڕنینەوەو دانیشتن بەغەمباری

٦٢٣- عَنْ أَبِي مُوسَى رَضِي اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: وَجِعَ أَبُو مُوسَى وَجَعًا شَدِيدًا، فَغُشِيَ عَلَيْهِ وَرَأْسُهُ فِي حَجْرِ امْرَأَةٍ مِنْ أَهْلِهِ فَلَمْ يَسْتَطِعْ أَنْ يَرُدَّ عَلَيْهَا شَيْئًا فَلَمَّا أَفَاقَ قَالَ: أَنَا بَرِيءٌ مِمَّنْ بَرِئَ مِنْهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَرِئَ مِنْ الصَّالِقَةِ وَالْحَالِقَةِ وَالشَّاقَّةِ. (الحديث ١٢٩٦):[٣٤]

(٣٤) أخرجه مسلم في الإيمان، باب تحريم ضرب الخدود وشق الجيوب رقم: ١٠٤

ئـەبو بوردەی کوڕی ئـەبو موسـا (رەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی: جارێ بـاوکم نەخۆش کەوت، لـە کەشـەنگیی خـۆی بووورایـەوە، لەوکاتـەدا سـەری لەسـەر کۆشـی ژنـێ بـوو لەکەسوکارەکەی، ژنەکـە دەسـتی کـرد بـەگریان و هـات و هاوار، ئـەبو موسـا نـەیتوانی لـەو کاتـەدا وەڵامـی ئـەو ژنـە بداتـەوە، بـەڵام کاتێ هۆشی هاتـەوە فـەرمووی: مـن بێـزاری خـۆم دەردەبـڕم و بـەریم لـەو کەسەی کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) لێـی بێـزارەو بەرییـە لێـی فـەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) بێزارو بەرییە لەو ژنەی کە شین و شەپۆڕ دەکاو، سەری خۆی دەتاشێ و یەخەی خـۆی دادەدڕێ لـەکاتی ڕوودانـی کارەسـاتا). (تاج/١/ ٥٢٤ /٢/ش/د/ن).

٦٢٤- عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْها قَالَتْ: لَمَّا جَاءَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَتْلُ ابْنِ حَارِثَةَ وَجَعْفَرٍ وَابْنِ رَوَاحَةَ، جَلَسَ يُعْرَفُ فِيهِ الْحُزْنُ، وَأَنَا أَنْظُرُ مِنْ صَائِرِ الْبَابِ، شَقِّ الْبَابِ، فَأَتَاهُ رَجُلٌ فَقَالَ إِنَّ نِسَاءَ جَعْفَرٍ وَذَكَرَ بُكَاءَهُنَّ فَأَمَرَهُ أَنْ يَنْهَاهُنَّ، فَذَهَبَ، ثُمَّ أَتَاهُ الثَّانِيَةَ، لَمْ يُطِعْنَهُ، فَقَالَ: (انْهَهُنَّ) فَأَتَاهُ الثَّالِثَةَ، قَالَ وَاللَّهِ لَقَدْ غَلَبْنَنَا يَارَسُولَ اللَّهِ. فَزَعَمَتْ أَنَّهُ قَالَ: (فَاحْثُ فِي أَفْوَاهِهِنَّ التُّرَابَ). (الحديث ١٢٩٩- طرفاه في: ١٣٠٥، ٤٢٦٣):[٣٥]

عائیشە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) کاتێـك هـەواڵی شـەهیدبوونی ئـەم سـێ سـەرکردەیەی بـۆ هـات، کـە لـە شـەڕی مۆتـەدا کوژرابوون، کە عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحەو جەعفەرو زەیدی کوڕی حاریثە بـوون پێغەمبـەر (درودی خوای لەسەر بێ) لـە مزگـەوت بەغـەمباری دانیـشت و خەموخەفەت و پەستی لەڕووی دیاربوو، من لـەدرزی دەرگاکـەوە تـەماشـام دەکرد، پیاوێ هاتە خزمەتی عەرزی کرد: ئەی پێغەمبـەری خـودا ! ژنـانی

(٣٥) أخرجه مسلم في الجنائز، باب: التشديد في النياحة، رقم: ٩٣٥

جەعفەر شین و شەپۆڕ دەكەن !؟ ئەویش فەرمانی پێ كرد كە نەهییان لێ بكات، ئەویش ڕۆیشت، بەڵام سوودی نەبوو، ژنەكان بە گوێیان نەكرد، دیسان پیاوەكە هاتەوەو پێی گووتەوە، ئەویش فەرموویەوە: (نەهیان لێ بكەن).

جا بۆ جاری سێیەم پیاوەكە هاتەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەرو عەرزی كرد بەخودا ئەی پێغەمبەری خودا! چاریان ناكەین! عایشە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (دەی قوڕبدەن بەدەمیاندا). (بڕ: ژمارە/٦٠٤).

## راقەو شیكردنەوە:

ئەم فەرموودەیە وەك شێخی عەینی دەفەرمووێ: بەڵگەی دەستوریی دانیشتن بۆ تازێی واتیادا، لەگێڕانەوەی ئیمامی ئەبوداودا دەڵێت: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) لە مزگەوت دانیشت.كەواتە: ئەمەی كە ئێستا موسوڵمانان لە مزگەوت دادەنیشن بۆ پرسەی مردووی خۆیان لەم فەرموودەیە وەرگیراوە.

٦٢٥- عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: اشْتَكَى ابْنٌ لأَبِي طَلْحَةَ قَالَ فَمَاتَ وَأَبُو طَلْحَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ فَمَاتَ وَأَبُو طَلْحَةَ خَارِجٌ، فَلَمَّا رَأَتْ امْرَأَتُهُ أَنَّهُ قَدْ مَاتَ هَيَّأَتْ شَيْئًا وَنَحَّتْهُ فِي جَانِبِ الْبَيْتِ فَلَمَّا جَاءَ أَبُو طَلْحَةَ قَالَ: كَيْفَ الْغُلَامُ ؟ قَالَتْ قَدْ هَدَأَتْ نَفْسُهُ، وَأَرْجُو أَنْ يَكُونَ قَدْ اسْتَرَاحَ وَظَنَّ أَبُوطَلْحَةَ أَنَّهَا صَادِقَةٌ. قَالَ: فَبَاتَ، فَلَمَّا أَصْبَحَ اغْتَسَلَ، فَلَمَّا أَرَادَ أَنْ يَخْرُجَ أَعْلَمَتْهُ أَنَّهُ قَدْ مَاتَ، فَصَلَّى مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثُمَّ أَخْبَرَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمَا كَانَ مِنْهُمَا فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (لَعَلَّ اللَّهَ أَنْ يُبَارِكَ

لَكُمَا فِي لَيْلَتِكُمَا).

قَالَ رَجُلٌ مِنَ الْأَنْصَارِ: (فَرَأَيْتُ لَهُمَا تِسْعَةَ أَوْلَادٍ كُلُّهُمْ قَدْ قَرَأَ الْقُرْآنَ).
(الحديث ١٣٠١– طرفه في: ٥٤٧٠): [٣٦]

پێشەوا ئەنسی کوڕی مالیك (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: کوڕێکی منالی ئەبوتەلحە نەخۆش بوو، کە ئەبوتەڵحە لەماڵ دەرچوو کوڕەکە کەدایك برای من بوو مرد، کە ئەبوتەلحە دێتەوە بەدایکی دەڵێت: کوڕەکەم چۆنە ؟ ئوم سولەیمیش، کە هەم دایکی من و هەم دایکی مناڵە مردووەکە بوو، پێی دەفەرموێت: لە گشت کاتێك خامۆشترە زۆر بێدەنگە، تەرمی مناڵە مردووەکەیش لە قوژبنێکیماڵەکەدا دادەنێت، ئینجا شێو دادەنێت بۆ ئەبوتەلحەو شێو دەکا، شەویش خۆی نەختێك بۆی دەڕازێنێتەوەو لەگەڵی دروست دەبێت، کەڕۆژ دەبێتەوە ئەبوتەلحە خۆی دەشۆرێت و کاتێك دەیەوێت لەماڵ دەرچێت، ژنەکە پێی ووت: مناڵەکە مردووە، دەی بیسپێرن بەخاك و بڕۆن بینێژن ! جا ئەو بەیانییە ئەبوتەلحە نوێژی بەیانی لەگەڵ پێغەمبەردا دەکات و، سەرگوزەشتەی خۆی و ژنەکەی و مناڵەکەیانی عەرزدەکات دەفەرمێت -دروودی خوای لەسەر بێ-:(ئایا ئەم شەو دروست بوون پێکەوە ؟) دەڵێت: بەڵێ، دەفەرموێت: (خودا ! لێتان پیرۆز بکات).

دوایی ئوم سولەیم کوڕێکی بوو، ئەبوتەلحە باوەپیارەم بوو، پێی فەرمووم: براکەت هەڵبگرەو بیبە بۆ خزمەتی پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- وەچەند دەنکێ خورماشی لەگەڵمدا نارد، حەزرەت -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (هیچت هێناوە لەگەڵی ؟) گوتم: بەڵێ، چەند قلێ خورمام هێناوە، جا خورماکەی وەرگرت و جوویی و دوایی لەدەمی خۆی دەری

(٣٦) أخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: فضائل أبي طلحة: رقم: ٢١٤٤

هێناو خورما جووراوەکەی نایە ناودەمی منالەکەو مەلاشووی پێ هەنوو، وە ناوی نا عەبدوللا).

ئیبنو عویەیینە دەیفەرموو: پیاوێکی ئەنصاری دەیگووت: بە چاوی خۆم نۆ منالی ئەم عەبدوللایەم دیوە، وەهەر نۆیان قورئان خوێن بوون. (ریاض/١/٦١/٤٤).

٦٢٦- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: دَخَلْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى أَبِي سَيْفٍ الْقَيْنِ، وَكَانَ ظِئْرًا لِإِبْرَاهِيمَ عليه السلام فَأَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِبْرَاهِيمَ فَقَبَّلَهُ وَشَمَّهُ، ثُمَّ دَخَلْنَا عَلَيْهِ بَعْدَ ذَلِكَ، وَإِبْرَاهِيمُ يَجُودُ بِنَفْسِهِ، فَجَعَلَتْ عَيْنَا رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَذْرِفَانِ، فَقَالَ لَهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ وَأَنْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ ؟ فَقَالَ: (يَا ابْنَ عَوْفٍ إِنَّهَا رَحْمَةٌ) ثُمَّ أَتْبَعَهَا بِأُخْرَى، فَقَالَ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (إِنَّ الْعَيْنَ تَدْمَعُ وَالْقَلْبَ يَحْزَنُ، وَلَا نَقُولُ إِلَّا مَايَرْضَى رَبُّنَا وَإِنَّا بِفِرَاقِكَ يَاإِبْرَاهِيمُ لَمَحْزُونُونَ). (الحديث ١٣٠٣)[37]

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لە خزمەت پێغەمەمبەردا -درودی خوای لەسەر بێ- چووین بۆ مالی ئەبوسەیفی ئاسنگەر، کە مێردی دایەنەکەی ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەربوو -درودی خوای لەسەر بێ- باوکی شیری ئیبراهیم بوو، پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- ئیبراهیمی هەلگرت و گرتیە باوەش و تێرتێر ماچی کردو بۆنی کرد، لەپاشان رۆژێ تر چوینەوە بۆ مالیان، ئەم جارەیان کەچووین ئیبراهیم گیانی دەدا، جاچاوەکانی پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- هۆن هۆن فرمێسکیان پێدا دەهاتە خوارەوە، لەبەر پەرۆشی بۆ

(٣٧) أخرجه مسلم في فضائل الصّحابة، باب: رحمته صلى الله عليه وسلم الصّبيان والعيال، رقم: ٢٣١٥

حاڵی ئیبراهیم، جا عەبدولرەحمانی کوڕی عەوف پێی ووت: ئەوە تۆیش دەگریت ؟ ئەی پێغەمبەری خودا ! فەرمووی ـدروودی خوای لەسەر بێـ : ئەی کوڕی عەوف ! رێگەی ڕەحم ناگیرێ، ئەمە نیشانەی ڕەحم و میهرەبانییە ئینجا فرمێسکێکی تری بەشوێنا ڕێژاو فەرمووی ـدروودی خوای لەسەر بێـ: (چاو پڕدەبێ لەئەسرین و دڵ کەیل دەبێ لەخەم و پەژارە بەڵام بەزمان ئەوەی ڕەزای خودای پەروەردگارمانی لەسەر نەبێ نایڵێین). (لەڕاستیدا ئەی ئیبراهیم ! ئێمە لەدووریی تۆ خەمگین و خەمبارین و بە کۆچی بێوەختت پەرۆشین). (بڕ: تاج /١/٥٢٨/١)+(ریاض/١ ز ٣ تا دوایی).

٦٢٧- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما قَالَ: اشْتَكَى سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ شَكْوَى لَهُ، فَأَتَاهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَعُودُهُ مَعَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ، وَسَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ، وَعَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ فَلَمَّا دَخَلَ عَلَيْهِ فَوَجَدَهُ فِي غَاشِيَةِ أَهْلِهِ، فَقَالَ: (قَدْ قَضَى)، قَالُوا: لا يَارَسُولَ اللَّهِ، فَبَكَى النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلَمَّا رَأَى الْقَوْمُ بُكَاءَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَكَوْا فَقَالَ: (أَلَا تَسْمَعُونَ إِنَّ اللَّهَ لاَ يُعَذِّبُ بِدَمْعِ الْعَيْنِ، وَلَا بِحُزْنِ الْقَلْبِ، وَلَكِنْ يُعَذِّبُ بِهَذَا وَأَشَارَ إِلَى لِسَانِهِ، أَوْ يَرْحَمُ، وَإِنَّ الْمَيِّتَ يُعَذَّبُ بِبُكَاءِ أَهْلِهِ عَلَيْهِ).
(الحديث ١٣٠٤)[٣٨]

ئیبنو عومەر ـرەزای خوایان لێ بێـ فەرمووی: جارێ سەعدی کوڕی عوبادە، نەخۆش بوو، پێغەمبەر ـدروودی خوای لەسەر بێـ ڕۆیشت بۆ سەرلێدانی، عەبدورەحمانی کوڕی عەوف و سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص و عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوودیشی لەگەڵ بوون، کە پێغەمبەر ـدروودی خوای لەسەر بێـ ڕۆیشتە ژوورەوە بۆ لای، ڕوانی بووراوەتەوەو پەل و پۆی شکاوەو کەسوکارەکەی

(٣٨) أخرجه مسلم في الجنائز، باب: التشديد في النيحة، رقم: ٩٣٦

دەورەیـان داوە، جا فـەرمووی ﷺ: (ئایا مـاوە، یا مـردووە ؟) گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا ! هێشتا مـاوە، ئیتر پێغەمبەر ﷺ دەستی کرد بـە گریـان، کاتێ خەڵکەکـەیش دییـان واپێغەمبـەر ﷺ دەگری ئەوانیش گریان، جا فەرمووی ﷺ: (گوێتان لێ بێ: خودا لەسـەر فرمێسکی چاوو لەسـەر خـەم و پـەژارەی دڵ ئـازارو سزاتان نادا، بەڵام بـەهۆی ئـەم زمانـەوە سزاتان دەدا: ئەگـەر شیوەن و ناسوپاسی پێ بکەن، یا ڕەحمتان پێ دەکا، ئەگەر لەکاتی سـەختی و قۆرت و کۆستدا قسەی باشیی پێ بکـەن، وەك ئـەوە بڵێ: انـالله وانـا إليـه راجعـون -٢/١٥٦). (بڕ/تاج/١/٥٢٩/٢).

٦٢٨- عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ رَضِي اللَّهُ عَنْها قَالَتْ: (أَخَذَ عَلَيْنَـا النَّبِـيُّ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عِنْدَ الْبَيْعَةِ أَنْ لَا نَنُوحَ، فَمَا وَفَتْ مِنَّا امْـرَأَةٌ غَيْـرَ خَمْـسِ نِـسْوَةٍ، أُمِّ سُلَيْمٍ، وَأُمِّ الْعَلَاءِ، وَابْنَةِ أَبِي سَـبْرَةَ امْـرَأَةِ مُعَـاذٍ، وَامْرَأَتَـانِ أَوْ ابْنَـةِ أَبِـي سَـبْرَةَ، وَامْـرَأَةِ مُعَـاذٍ وَامْـرَأَةٍ أُخْـرَى) (الحـديث ١٣٠٦ – طرفــاه في: ٤٨٩٢، ٧٢١٥)[٣٩].

ئـوم عەتییـە (ڕەزای خـوای لێ بـێ) فـەرمووی: ئـەو کاتـەی کـە ئێمـەی ژنـان پەیمانمان بەست لەگەڵ پێغەمبەردا، لەسەر پابەنـدبوون بەدەستوورەکانی ئیسلام، حەزرەت ﷺ بەتایبەتی پەیمانی ئـەوەی لێسەندین: کە شـیوەن و زاری نەکـەین، بـەڵام پێـنج ئافرەتمـان نـەبێ کـەسمان نـەمان بردەسەر، ئەوانیش ئەم ژنانە بوون: ئوم سولەیم و ئوم عـەلاوو کچەکەی ئەبو سەبرەی ژنـی موعـازو دووژنـی تربـوون، یا، کچەکەی ئـەبو سـەبرەو ژنەکەی موعازو ژنێکی تر بوون).

(٣٩) أخرجه مسلم في الجنائز، باب: التشديد في النياحة، رقم: ٩٣٦

# هەستان لەبەر تەرم و شتی تری وەها

٦٢٩- عَنْ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِذَا رَأَى أَحَدُكُمْ جِنَازَةً فَإِنْ لَمْ يَكُنْ مَاشِيًا مَعَهَا فَلْيَقُمْ، حَتَّى يُخَلِّفَهَا أَوْ تُخَلِّفَهُ، أَوْ تُوضَعَ مِنْ قَبْلِ أَنْ تُخَلِّفَهُ). (الحديث ١٣٠٨)[٤٠]:

**عامیری کوڕی ڕەبیعە** (رەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی پێغەمبەر** -درودی خوای لەسەر بێ- **فەرمووی: (کاتێ تەرمێکتان بینی لەبەری هەڵسن، جائەگەر لەگەڵی نەچوو دامەنیشنەوە هەتا تەرمەکە تێدەپەڕێ، یا ئەگەر تێنەپەڕی هەتا دائەنرێ) بڕوانە: تاج/ ١ ز/ ٢٢٠ ل – ٥٧١).**

٦٣٠- عَنْ سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ عَنْ أَبِيهِ: قَالَ: (كُنَّا فِي جَنَازَةٍ، فَأَخَذَ أَبُو هُرَيْرَةَ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِيَدِ مَرْوَانَ فَجَلَسَا، قَبْلَ أَنْ تُوضَعَ، فَجَاءَ أَبُو سَعِيدٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ فَأَخَذَ بِيَدِ مَرْوَانَ، فَقَالَ: قُمْ، فَوَاللَّهِ لَقَدْ عَلِمَ هَذَا أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَانَا عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: أَبُو هُرَيْرَةَ، صَدَقَ) (الحديث ١٣٠٩- طرفه في: ١٣١٠)[٤١]:

**سەعیدی مەقبووری** (رەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: باوکم ناوی کیسان بوو، فەرمووی: جارێ تەرمێکیان بەڕێ دەکرد، بەرلەوە تەرمەکە لەسەرشانی پیاوان دابگیرێ و لەسەر زەوی دابنرێ، ئەبو هورەیرە** (رەزای خوای لێ بێ) **دەستی مەروانی گرت و فەرمووی: (هەڵسە دامەنیشە، دەسا بەخودا ئەمەی کە لەگەڵت دانیشتووە ئەویش وەکو من دەزانێ کەپێغەمبەر** -درودی خوای لەسەر بێ- **نەهی لێکردوین لەشتی وا کە بەرلەوە تەرمەکە دابنرێ لەسەر زەوی ئێمە دابنیشین، ئەبو هورەیرەیش فەرمووی: راست دەکا).**

---

(٤٠) أخرجه مسلم في الجنائز، باب: التشديد في النياحة، رقم: ٩٣٦

(٤١) الحديث من أفراد البخاري (عيني /٦٨/١٠٩/٨). -المترجم-

٦٣١- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: (مَرَّ بِنَا جَنَازَةٌ فَقَامَ لَهَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَقُمْنَا لَهُ فَقُلْنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّهَا جِنَازَةُ يَهُودِيٍّ ؟ قَالَ: (إِذَا رَأَيْتُمْ الْجِنَازَةَ فَقُومُوا). (الحديث ١٣١١)[٤٢]:

جابری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: تەرمێ لەلامانەوە ڕەت بوو، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) لەبەری هەڵسا، ئێمەش لەگەڵیا، لەبەری هەڵساین، ئینجا گوتمان: ئەی پێغەمبەری خودا ! خۆ ئەوە تەرمی جوولەکە بوو؟ فەرمووی (درودی خوای لەسەر بێ): (مردن بە سامە ! لەبەرئەوە کە تەرمتان بینی لەبەری هەڵسن). (تاج/١/٥٧٢/٢ + ل/٥٧١/١ + ل/٥٧٢/٣).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

ئەم فەرموودەیەو چەند فەرموودەیەکی دروستی تری لەم بابەتە بەلگەیەکی ڕۆشنن لەسەر ڕێز گرتنی تەرمی مردوو، چ تەرمی جوولەکەبێ، چ مەسیحی، چ بێبڕوای تر. کەواتە بەشداریکردنی نوێنەری دەوڵەتێکی موسوڵمان لە ڕێ و ڕەسمی بەڕێکردنی تەرمی کەسایەتییەکی ناموسوڵمانان کارێکی دروستەو بەڵگەی سینگ فراوانی ئوممەتی ئیسلامە، بە مەرجێ کە ئەو نوێنەرە بەشداری نەکا لە کارێکی دژی ئیسلامدا، وەك ئەوان لەکاتی بەخاك سپاردندا ڕەمزی صەلیب لەسەر سینگی خۆیان بکێشن، ئەو نابێ شتی وابکا، بەلام سڵاو لێکردن و گوڵ دانان و شتیوا لەسەر گۆڕەکەی ئەوە شتێ ترە، ئەوە ڕێزێکی مەدەنییە، ڕێزی دینی نییە، ئەوە پەیوەندی بەکاروباری جیهانەوە پترە وە لەو بابەتەیە کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) لە بارەیەوە دەفەرموێ: (انتم اعلم بأمر دنیاکم - واتە: خۆتان لە کاروباری جیهانی پەتی خۆتان، کە پەیوەندی بەلایەنی

(٤٢) أخرجه مسلم في الجنائز، باب: القيام للجنازة، رقم: ٩٦٠.

ئايينيەوە نەبێ، باشتر دەزان !). بڕوانە: تاج/٣٣٠/٤ ز —١٠٣).

٦٣٢– عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِذَا وُضِعَتْ الْجِنَازَةُ، وَاحْتَمَلَهَا الرِّجَالُ عَلَى أَعْنَاقِهِمْ، فَإِنْ كَانَتْ صَالِحَةً قَالَتْ قَدِّمُونِي، وَإِنْ كَانَتْ غَيْرَ صَالِحَةٍ، قَالَتْ يَا وَيْلَهَا أَيْنَ يَذْهَبُونَ بِهَا، يَسْمَعُ صَوْتَهَا كُلُّ شَيْءٍ إِلَّا الْإِنْسَانَ، وَلَوْ سَمِعَهُ صَعِقَ). (الحديث ١٣١٤– طرفاه في: ١٣١٦، ١٣٨٠) [٤٣].

ئەبو سەعید (رەزای خوای لێ بێ) لە خۆشەویستەوە -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: (کاتێ تەرمی مردوو دادەنرێ لەناو دارەتەرما، وەپیاوان هەڵی دەگرن و دەینێنە سەرشانیان هەتا بیبەن بۆسەر گۆڕستانن لەو کاتەدا مردووەکە ئەگەر مرۆڤێکی باش بێ دەڵێ: زووکەن زوو بمبەن ! وەڵێ ئەگەر مردووەکە مرۆڤێکی باش نەبێ دەڵێ: هەی هاوار ! خۆم ڕۆ ! بۆکوێم دەبەن ؟ حەزرەت -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (لەم کاتەدا هەمووشتێ دەنگی دەبیستێ، ئادەمیزاد نەبێ، خۆ ئەگەر ئادەمیزاد گوێی لەم هاتوهاوارە بێ لەترسانا دەتۆقێ و زەندەقی دەچێ) (تاج/١ / ٨/٥٦٩).

٦٣٣ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (أَسْرِعُوا بِالْجِنَازَةِ، فَإِنْ تَكُ صَالِحَةً فَخَيْرٌ تُقَدِّمُونَهَا، وَإِنْ يَكُ سِوَى ذَلِكَ، فَشَرٌّ تَضَعُونَهُ عَنْ رِقَابِكُمْ). (الحديث ١٣١٥) [٤٤].

ئەبو هورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) لە خۆشەویستەوە -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: (دەست وبرد لەبەڕێکردنی تەرمی مردوودا بکەن و زوو بەزوو بیبەن بۆ گۆڕستان و لە ڕێ خێرا بڕۆن، چونکە حاڵ لەم دوو خاڵە بەدەر نییە: ئەگەر خۆی مرۆڤێکی باش بێ ئەوا ئێوە ئەیبەن بەسەر خێرو خۆشیدا،

---

(٤٣) لم يوافقه مسلم علي تخريجه (فتح / ٣٠٦/٣ ـ خاتمة كتاب الجنائز). -المترجم-

(٤٤) أخرجه مسلم في الجنائز، باب: الإسراع في الجنازة رقم: ٩٤٤.

خۆ ئەگەر خۆی مرۆڤێکی باش نەبێ، ئەوا ئەوە شەڕێکەو زوو بەزوو لەکۆڵی خۆتانی دەکەنەوە) (تاج/١/٥٦٨/٥-ش/د/ت/ن+ز —٢١٨ ب/١).

٦٣٤- عَنْ نَافِعٍ رَحِمَهُ اللّٰهُ تَعَالَى قَالَ: (حُدِّثَ ابْنُ عُمَرَ: أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ يَقُولُ: مَنْ تَبِعَ جَنَازَةً فَلَهُ قِيرَاطٌ، فَقَالَ أَكْثَرَ أَبُوهُرَيْرَةَ عَلَيْنَا (١٣٢٣)، فَصَدَّقَتْ يَعْنِي عَائِشَةَ أَبَا هُرَيْرَةَ وَقَالَتْ سَمِعْتُ رَسُولَ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُهُ. فَقَالَ ابْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُما لَقَدْ فَرَّطْنَا فِي قَرَارِيطَ كَثِيرَةٍ (الحديث ١٣٢٤)[٤٥].

نافیع (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: (عەرزی ئیبنو عومەریان کرد: کە ئەبوهورەیرە دەفەرموێ: پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: (هەرکەسێ شوێن تەرمێ بکەوێ (قیراتێکی بۆ هەیە) ئەویش فەرمووی: (ئەبوهورەیرە پێی لێ هەڵبڕی !).

جا کاتێك ئەمە گەیشتەوە بەعائیشە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: (ئەبوهورەیرە ڕاست دەفەرموێ، منیش ئەمەم لە پێغەمبەر بیستووە) جاکاتێ ئیبنوعومەر فەرمایشتەکەی عائیشەی ژنەوت، فەرمووی: (قیرات گەلێکی زۆرمان لەکیس خۆمان داوە). (بڕوانە: تاج/١/٥٥٧/١ز - ٢١٠).

## ئەو شوێنانەی کە نوێژیان تیا باش نییە

٦٣٥- عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْها عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: فِي مَرَضِهِ الَّذِي مَاتَ فِيهِ: (لَعَنَ اللّٰهُ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى اتَّخَذُوا قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ مَسْجِدًا) قَالَتْ: وَلَوْلاَ ذَلِكَ لأَبْرَزُوا قَبْرَهُ، غَيْرَ أَنِّي أَخْشَى أَنْ يُتَّخَذَ مَسْجِدًا. (الحديث ١٣٣٠)[٤٦].

---

(٤٥) أخرجه مسلم في عدة مواضيع (عيني/ ٨/١٢٧). -المترجم-

(٤٦) أخرجه مسلم في المساجد ومواضع الصلاة، باب: النهي عن بناء المساجد على القبور، رقم:٥٢٩.

عائیشه (رەزای خوای لێ بێ) کاتێ فریشتەی مەرگ هات بۆ خزمەتی حەزرەت دروودی خوای لەسەر بێ لەکاتی سەرەمەرگدا، حەزرەت دروودی خوای لەسەر بێ پارچەیەکی گوڵ گوڵی، دابوو بەسەر ڕووی خۆیدا، ناوبەناو کە پارچەکە خەفەو تەنگەنەفەسی دەکرد، ڕووی خۆی لادەدا وەلەم کاتی سەرەمەرگەدا فەرمووی: (لەعنەت و نەفرینی خودا لە جوولەکەو گاوربێ، کەگۆڕی پێغەمبەرەکانی خۆیان کردووە بەمزگەوت). پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێ بەمە هەڕەشەی لەم کردارە ناپەسەندەیان دەکرد نەبادا موسوڵمانەکانیش چاو لەوان بکەن و گۆڕی پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێ بکەن بە مزگەوت و نوێژو پەرستشی تێدابکەن و بەرەبەرە لەپاش ڕۆژگارێکی دوورو درێژ گۆڕەکە خۆیشی بپەرستن. عائیشە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: دەی ئەگەر لەبەر ئەم مەترسییە نەبوایە گۆڕەکەی پێغەمبەریان دروودی خوای لەسەر بێ دەرئەخست خانوویان بەسەرەوە نەدەکرد، گەرچی من هەرمەترسی ئەوەم هەیە کە گۆڕەکەی بکرێت بە مزگەوت) سوپاس بۆخوا کەهەتا ئێستا گۆڕەکەی ئەوپەڕی ڕێزی ئایینی لێ دەگیرێ، بەڵام ئەوەی عائیشە مەترسی لێ کردووە، لەسایەی خواوە ڕووی نەداوە. (بڕوانە: تاج /١/٣٦٦/١+٢+٣).

## نوێژ خوێن لە کوێی تەرمەوە دەوەستێ

٦٣٦- عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: (صَلَّيْتُ وَرَاءَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى امْرَأَةٍ مَاتَتْ فِي نِفَاسِهَا فَقَامَ عَلَيْهَا وَسَطَهَا). (الحديث ١٣٣١) [٤٧]:

(٤٧) أخرجه مسلم في الجنائز، باب: أين يقوم الإمام، رقم: ٩٦٤.

سەمووڕەی کوڕی جوندوب (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەپشتی پێغەمبەرەوە -درودی خوای لەسەر بێ- نوێژی مردووم بەکۆمەڵی (بەجەماعەت) لەسەر تەرمی ژنێك کرد، لە زەیستانیدا مردبوو، پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- لەنوێژەکەدا لەناوەڕاستی تەرمەکەدا وەستا بوو (تاج/١/٥٥٨/٢ - ش/د/ت/ن).

٦٣٧- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّهُ صَلى عَلَى جَنَازَةٍ، فَقَرَأَ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ، فَقَالَ: لِيَعْلَمُوا أَنَّهَا سُنَّةٌ. (الحديث ١٣٣٥)[48]:

تەلحەی کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: لەسەر تەرمێ لەپشتی ئیبنو عەباسەوە نوێژی مردووم بەجەماعەت (بەکۆمەڵی) کرد، لەپاش ئەڵڵاو ئەکبەری نوێژ دابەستن سوورەتی فاتیحای خوێند، کە دێباچەو سەرەتای قورئانی پیرۆزە، لەپاشا کەلێ بووەوە فەرمووی: (بۆیە وام کرد تاموسوڵمانان بزانن کە خوێندنی فاتیحا لەنوێژی مردوودا یاساو ڕەفتارو ڕێبازی پێغەمبەر خۆیەتی) (تاج/١/٥٥٢/٤ — ب/د/ت/ن).

## مردوو لە ناو گۆڕدا شت دەبیستێ و گفتوگۆ دەکا

٦٣٨- عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (الْعَبْدُ إِذَا وُضِعَ فِي قَبْرِهِ وَتُوُلِّيَ وَذَهَبَ أَصْحَابُهُ، حَتَّى إِنَّهُ لَيَسْمَعُ قَرْعَ نِعَالِهِمْ أَتَاهُ مَلَكَانِ فَأَقْعَدَاهُ فَيَقُولَانِ لَهُ: مَا كُنْتَ تَقُولُ فِي هَذَا الرَّجُلِ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَيَقُولُ: أَشْهَدُ أَنَّهُ عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ، فَيُقَالُ: انْظُرْ إِلَى مَقْعَدِكَ مِنْ النَّارِ أَبْدَلَكَ اللَّهُ بِهِ مَقْعَدًا مِنْ الْجَنَّةِ، قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (فَيَرَاهُمَا

(٤٨) لم يُوافقه مسلم علي تخريجه (فتح /٣ ص ٣٠٦ حديث رقم: ١٣٩٤، خاتمة كتاب الجنائز). -المترجم-

جَمِيعًا، وَأَمَّا الْكَافِرُ، أَوْ الْمُنَافِقُ، فَيَقُولُ: لَا أَدْرِي، كُنْتُ أَقُولُ مَا يَقُولُ النَّاسُ، فَيُقَالُ: لاَ دَرَيْتَ، وَلاَ تَلَيْتَ، ثُمَّ يُضْرَبُ بِمِطْرَقَةٍ مِنْ حَدِيدٍ ضَرْبَةً بَيْنَ أُذُنَيْهِ، فَيَصِيحُ صَيْحَةً يَسْمَعُهَا مَنْ يَلِيهِ إِلاَّ الثَّقَلَيْنِ).(الحديث ١٣٣٨- طرف في:١٣٧٤)[٤٩]:

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست ـدروودی خوای لەسەر بێـ فەرمووی: (کاتێ بەندە دایدەنێن لەناو گۆڕەکەیداو هاوڕێکانی بەرەو دواوە دەگەڕێنەوە، هێشتا گوێی لەچرپەی کەوشەکانیانە، دوو فریشتە (کە ناویان نەکیرو مونکیرە) دەگەنەسەری و دایدەنیشێنن و پێی دەڵێن: باوەڕت چییە دەربارەی ئەم پیاوە ؟ واتە: باوەڕت چییە دەربارەی موحەمەد ـدروودی خوای لەسەر بێـ فەرمووی: (جائەوەی موسوڵمان بێ دەڵێ: ئاگادارم کە ئەم پیاوە کە ناوی موحەمەدی کوڕی عەبدوڵلایە، بەندەو پێغەمبەری خودایە، ئەوجا پێی دەگوترێ: ئا ئەوە جێگەی تۆ بوو لە ئاگری دۆزەخا، سەیری کە، خودا بۆی گۆڕیتەوە بەو شوێنە خۆشە لە بەهەشتا، جائەویش هەردوو جێگەکە بەچاوی خۆی دەبینێ) حەزرەت ـدروودی خوای لەسەر بێـ فەرمووی: (بەلام بێبڕوا) یافەرمووی: (بەلام ناپاك = مونافیق = دوو ڕوو، کەهەمان پرسیاری لێ دەکەن دەڵێ: ئاگام لەهیچ نییە، ئەوەندە هەیە سەیری دەمی خەڵکم کردووە، ئەوان چییان گوتووە منیش ئەوەم گوتووە! ئەوجا دەڵێن دەك هەرنەزانیت ! ئیتر یەك گورزی ئاسنینی لێ دەدەن، دەدەن لەنێوانی هەردوو گوێی، ئەوسا یەك قیژە دەکا هەرچی لەدەوروبەریەتی دەیبیستێ، مرۆڤ و جنۆکە نەبێ، ئەم دوو ڕەگەزە نایبیستن !).(تاج/١/٥٨١/٢ - ش/د/ت/ن).

(٤٩) أخرجه مسلم في الجنّة وَصَفةِ نَعيمِها وأهلِها، باب: عرض مقعد الميت مِنَ الجنّةِ أو النارعَلَيهِ، رقم: ٢٨٧٠.

## ئەم فەرموودەیە لەگەڵ فەرموودەکەی دوای، بەڵگەیەکی ڕۆشنە لەسەر ئەم بابەتانە

- سزای گۆڕ ڕاستەو هەیە.
- پرسیاری نەکیرو مونکیر هەقە.
- مردوو لەناو گۆڕدا دەبیستێ، قسە دەکا، دادەنیشێ دەبینێ، قیژەو هاتوو هاوار دەکا، چاوو گوێ و زمان و ئەندامی تری هەیە، جەستەی هەیە، شتی بە باشی لە بیر دەمێنێ، فریشتە دەبینێ، شایەتوومانی سوودی هەیە بۆی، پێلێنانی لەسەر تاوانی خۆی لەسەری دەکەوێ !
- گیانلەبەرانی تر خوا پەنامان بدات. ئامین ـ بێجگە لە ئادەمیزادو جنۆکە ـ دەنگی مردوو دەبیستن.
- بەهەشت و دۆزەخ ئێستا هەن و دروستکراون.
- دوعای خێرو شەڕ لەپاش مردنیش کاریگەرییان هەیە.
- ناشتن لە شوێنی پیرۆزو شوێنی چاکدا پەسەندە.

٦٣٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ قَالَ: (أُرْسِلَ مَلَكُ الْمَوْتِ إِلَى مُوسَى رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ فَلَمَّا جَاءَهُ صَكَّهُ، فَرَجَعَ إِلَى رَبِّهِ، فَقَالَ: أَرْسَلْتَنِي إِلَى عَبْدٍ لَايُرِيدُ الْمَوْتَ، فَرَدَّ اللّٰهُ عَلَيْهِ عَيْنَهُ، وَقَالَ: ارْجِعْ فَقُلْ لَهُ يَضَعُ يَدَهُ عَلَى مَتْنِ ثَوْرٍ، فَلَهُ بِكُلِّ مَاغَطَّتْ بِهِ يَدُهُ بِكُلِّ شَعْرَةٍ سَنَةٌ. قَالَ: أَيْ رَبِّ ثُمَّ مَاذَا؟ قَالَ: ثُمَّ الْمَوْتُ: قَالَ: فَالْآنَ، فَسَأَلَ اللّٰهَ أَنْ يُدْنِيَهُ مِنْ الْأَرْضِ الْمُقَدَّسَةِ رَمْيَةً بِحَجَرٍ). قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (فَلَوْ كُنْتُ ثَمَّ لَأَرَيْتُكُمْ قَبْرَهُ إِلَى جَانِبِ الطَّرِيقِ عِنْدَ الْكَثِيبِ الْأَحْمَرِ). (الحديث ١٣٣٩- طرف في: ٣٠٤٧)[٥٠]:

---

(٥٠) أخرجه مسلم في الفضائل، باب: من فضائل موسي رَضِي اللهُ عَنهُ رقم: ٢٣٧٢

ئەبو هوریرە -درروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی کە پێغەمبەر -درروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (فریشتەی گیان کێشان بەفەرمانی خودا دەچێ بۆ لای پێغەمبەر موسا -درروودی خوای لەسەر بێ- کاتێ دەگاتە خزمەتی، مووسا مستەکۆڵەیەکی لێ دەدا، چاوێکی قەلپووچ دەکا، جا فریشتەکە دەگەڕێتەوە بۆلای خوداو دەفەرموێ: تۆ منت ناردووە بۆ لای بەندەیێ کە نایەوێ بمرێ ! جا خودا چاوی چاك دەکاتەوەو، دەفەرموێ: بچۆرەوە بۆ لای و پێی بڵێ: دەستت دابنێ لەسەر پشتی جوانە گایێ، چەند موو بوو بەژێر دەستتەوە لەباتی هەر موویێ، لەو مووانە ساڵێ تریش بژی، مووسا فەرمووی: ئەی پەروەردگارم ! لەپاش ئەوە چی؟ فەرمووی: لەپاش ئەوەش هەر مردنە، مووسا فەرمووی: کەواتە با ئێستا بێ، بەڵام داوای لە خودای گەورە کرد کەوا نزیکی بکاتەوە لەخاکی پیرۆزەوە کە بە قەد یەك بەردە هاوێژی بمێنێ بۆی ! جا خۆشەویست -درروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: ئەگەر ئێستا من لەوێ بوومایە گۆڕەکەیم نیشان دەدان، کەوا لە تەنیشت ڕێگەکەوە لە بن تەپۆڵکە لە سوورەکەدایە، بەردە هاوێژێکی دەمێنێ بۆ بەیتول مەقدیس) (تاج/٤/٣٨١ - ش):

بەڵگەیە لەسەر ناشتنی تەرم لە شوێنی پیرۆزدا، هەروا لە تەنیشت گۆڕی پیاوچاکانەوە.

ئەم جۆرە فەرموودەیە جۆرە غەیبییەتێکی وا تیادا، باش وایە بەبێ عیلم قسەی لێ نەکرێ.

## نوێژ لەسەر تەرمی شەهید

٦٤٠- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللّٰهِ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَجْمَعُ بَيْنَ الرَّجُلَيْنِ مِنْ قَتْلَى أُحُدٍ، فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ، ثُمَّ يَقُولُ: (أَيُّهُمْ

أَكْثَرُ أَخْذًا لِلْقُرْآنِ)، فَإِذَا أُشِيرَ لَهُ إِلَى أَحَدِهِمَا قَدَّمَهُ فِي اللَّحْدِ، وَقَالَ: (أَنَا شَهِيدٌ عَلَى هَؤُلَاءِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ)، وَأَمَرَ بِدَفْنِهِمْ فِي دِمَائِهِمْ وَلَمْ يُغَسَّلُوا، وَلَمْ يُصَلِّ عَلَيْهِمْ. (الحديث ١٣٤٣- اطرافه في ١٣٤٥، ١٣٤٦، ١٣٤٧، ١٣٤٨، ١٣٥٣، ٤٠٧٩)[٥١]:

جابیری كوڕی عەبدوڵلا (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) شەهیدەكانی شەڕی ئوحودی، دوو پیاو، دوو پیاو، دەخستە ناو یەك لۆ جلەوە لەباتی كفن، ئەوجا دەیفەرموو: (كامیان لەم دووانە، زیاتر قورئانی لەبەر بووە، ئەوەیانی لە ئەلحەدەكەدا دەخستە لای قیبلەوە !).

وەفەرمووی (رەزای خوای لێ بێ) (لە ڕۆژی قیامەتا من خۆم ئاگاداری ئەمانە دەكەم و دەبم بە شایەت بۆیان و شایەتیان بۆ دەدەم كە گیانی شیرینی خۆیان، لەپێناوی خودادا بەخت كردووە، لەپاشدا فەرمانی فەرموو كە هەر بەخۆێن و خوڕەكەی خۆیانەوە ناشتیانن، نە شۆردران و نە نوێژیان لەسەر كرا) (تاج/١/٥٤٧/ - ب/د/ت/ن).

٦٤١- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَرَجَ يَوْمًا فَصَلَّى عَلَى أَهْلِ أُحُدٍ صَلَاتَهُ عَلَى الْمَيِّتِ، ثُمَّ انْصَرَفَ إِلَى الْمِنْبَرِ، فَقَالَ: (إِنِّي فَرَطٌ لَكُمْ، وَأَنَا شَهِيدٌ عَلَيْكُمْ، وَإِنِّي وَاللَّهِ لَأَنْظُرُ إِلَى حَوْضِي الْآنَ وَإِنِّي أُعْطِيتُ مَفَاتِيحَ خَزَائِنِ الْأَرْضِ أَوْ مَفَاتِيحَ الْأَرْضِ وَإِنِّي وَاللَّهِ مَا أَخَافُ عَلَيْكُمْ أَنْ تُشْرِكُوا بَعْدِي، وَلَكِنْ أَخَافُ عَلَيْكُمْ أَنْ تَنَافَسُوا فِيهَا). (الحديث ١٣٤٤ – اطرافه في: ٣٥٩٦، ٤٠٤٢، ٤٠٨٥، ٦٤٢٦، ٦٥٩٠)[٥٢]:

---

(٥١) لم يوافِقْهُ مُسلِمَ علي تخريجه (فتح / ٣ / ٣٠٦ ح / ١٣٩٤ خاتمة) ـ المترجم

(٥٢) أخرجه مسلم في فضائل النبي صَلى اللهُ عليهِ وَسَلمَ ، باب:حوض نبينا صَلى اللهُ عَليهِ وَسَلمَ وصفته (ج/ ١٥ ص٥٧/طبقة/٢ـ شرح صحيح مسلم للنووي). ـ المترجم

عوقبەی کوری عامر (رەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: ڕۆژێ پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- لەپاش هەشت ساڵ لە شەهید بوونی شەهیدانی ئوحود، لەماڵ دەرچوو، ڕۆیشت نوێژی مردووی لەسەر شەهیدانی غەزای ئوحود کرد، لەپاشا کەگەڕایەوە بۆ مەدینە -درودی خوای لەسەر بێ- ڕۆیشتە سەر دوانگەکەو، وەك خواحافیزی لەزیندووان و مردووان بکا، فەرمووی: (خۆم بەرایی و پێشڕەوتانم لەپێش گەلی ئیسلامی خۆمەوە دەڕۆم، تائەوان دێن حەوزی کەوسەریان بۆ ئامادە دەکەم، خۆم چاودێرم بەسەرتانەوە لەهەردوو جیهاندا کردەوەکانی ئێوەم پێ نیشان دەدرێ و لە قیامەتدا شایەتیتان بۆ دەدەم، سوێندم بەخودا من ئێستاکە لەم دەمەدا حەوزی کەوسەر – کە حەوزی تایبەتی خۆمەو ژوانگەی خۆم و ئۆمەتمەو پێشوازیی ئۆمەتمی لە بەهەشتا لەسەر دەکەم - ئا ئێستا وا لەبەرچاوم و، بەچاوی سەر تەماشای ئەو حەوزە دەکەم، بێگومان کلیلەکانی گەنجینەکانی زەوی هەموو خەڵاتکراون بە من، یا فەرمووی: کلیلەکانی زەوی دراون بە من، کەواتە: زوو یادرەنگ گەلی ئیسلام دەست دەگرن بەسەر ئەو وڵاتانەدا، بەخودا تازە من مەترسیم لەوە نەماوە کە ئێوە خوا نەخواخستە، لەپاش مەرگی من بچنەوە سەر بتپەرستی و فرەخودایی و شتی واو دەست بکەنەوە بە بتپەرستی، بەپشتی خودا شتی واتازە لەتێکڕای ئۆمەتم ڕوونادات‌ەوە، تاك و تەرایش ئەو گرنگیەی نییە، بەڵام ترسی ئەوەم لێتان هەیە، کەئێوەش وەك نەتەوەکانی تری پێش خۆتان، کە لەسەر پڕوپیتی دنیا، لەناو خۆتانا بچن بەگژ یەکاو تێك بەربن و لەناوبچن وەك چۆن ئەوان لەسەر شتیوا لەناوچوون). (تاج /٣٦٨/٤ + تاج/١٠ ل/٥٦/١/٥٦).

## داوای ئیمان هێنان لەمناڵ دەکرێ

٦٤٢- عَنْ عَبْدِاللّٰهِ ابْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُما أَخْبَرَهُ أَنَّ عُمَرَ انْطَلَقَ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي رَهْطٍ قِبَلَ ابْنِ صَيَّادٍ، حَتَّى وَجَدُوهُ يَلْعَبُ مَعَ الصِّبْيَانِ، عِنْدَ أُطُمِ بَنِي مَغَالَةَ، وَقَدْ قَارَبَ ابْنُ صَيَّادٍ الْحُلُمَ، فَلَمْ يَشْعُرْ حَتَّى ضَرَبَ النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِيَدِهِ، ثُمَّ قَالَ لِابْنِ صَيَّادٍ: (تَشْهَدُ أَنِّي رَسُولُ اللّٰهِ)، فَنَظَرَ إِلَيْهِ ابْنُ صَيَّادٍ، فَقَالَ: (أَشْهَدُ أَنَّكَ رَسُولُ الْأُمِّيِّينَ)، فَقَالَ: ابْنُ صَيَّادٍ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (أَتَشْهَدُ أَنِّي رَسُولُ اللّٰهِ)، فَرَفَضَهُ، وَقَالَ (آمَنْتُ بِاللّٰهِ وَبِرُسُلِهِ)، فَقَالَ لَهُ: (مَاذَا تَرَى ؟) قَالَ ابْنُ صَيَّادٍ: يَأْتِينِي صَادِقٌ وَكَاذِبٌ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (خُلِّطَ عَلَيْكَ الْأَمْرُ). ثُمَّ قَالَ لَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنِّي قَدْ خَبَأْتُ لَكَ خَبِيئًا). فَقَالَ ابْنُ صَيَّادٍ: هُوَ الدُّخُّ، فَقَالَ: (اخْسَأْ، فَلَنْ تَعْدُوَ قَدْرَكَ)، فَقَالَ عُمَرُ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ: دَعْنِي يَا رَسُولَ اللّٰهِ أَضْرِبْ عُنُقَهُ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنْ يَكُنْهُ فَلَنْ تُسَلَّطَ عَلَيْهِ وَإِنْ لَمْ يَكُنْهُ فَلَا خَيْرَ لَكَ فِي قَتْلِهِ). (الحديث ١٣٥٤- اطرافه في: ٣٠٥٥، ٦١٧٣، ٦٦١٨).

وَقَالَ سَالِمٌ سَمِعْتُ ابْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُملا، يَقُولُ: انْطَلَقَ بَعْدَ ذَلِكَ رَسُولُ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ، إِلَى النَّخْلِ الَّتِي فِيهَا ابْنُ صَيَّادٍ، وَهُوَ يَخْتِلُ أَنْ يَسْمَعَ مِنْ ابْنِ صَيَّادٍ شَيْئًا، قَبْلَ أَنْ يَرَاهُ ابْنُ صَيَّادٍ، فَرَآهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ مُضْطَجِعٌ، يَعْنِي فِي قَطِيفَةٍ، لَهُ فِيهَا رَمْزَةٌ أَوْ زَمْرَةٌ، فَرَأَتْ أُمُّ ابْنِ صَيَّادٍ رَسُولَ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ يَتَّقِي بِجُذُوعِ النَّخْلِ، فَقَالَتْ لِابْنِ صَيَّادٍ: يَا صَافِ وَهُوَ اسْمُ ابْنِ صَيَّادٍ، هَذَا مُحَمَّدٌ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَثَارَ ابْنُ صَيَّادٍ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (لَوْ تَرَكَتْهُ بَيَّنَ).(الحديث ١٣٥٥- اطرافه في: ٢٦٣٨، ٣,٣٣، ٦١٧٤، ٣٠٥٦) [٥٣].

---

(٥٣) أخرجَهُ مسلمٌ في الفتنِ وأشراطِ السّاعَةِ، باب: ذكر إبن صيّاد رقم: ٢٩٣٠، ٢٩٣١

عەبدوڵلاّی كوڕی عومەر «رەزای خوایان لێ بێ» فەرمووی: عومەری كوڕی خەتتاب (رەزای خوای لێ بێ) لەگەڵ دەستەیێ لەیارانی پێغەمبەردا «دروودی خوای لەسەر بێ» لەخزمەتی حەزرەتدا دەرچوون «دروودی خوای لەسەر بێ» بۆ سووسەكردنی باسی ئیبنوصەیاد، كە دەیدۆزنەوە، دەڕوانن لەناو دەستەیێ منالاّ یاری دەكات لەلای قەلاّكەی بەنی مەغالە لەمەدینە، ئەوكاتە ئیبنو صەییاد نزیكی ڕەسییدە بوون بوو، ئیبنوصەییاد بەخۆی نازانێ هەتا پێغەمبەر «دروودی خوای لەسەر بێ» لەپشتەوە دەستێ دەماڵێ بە پشتیدا، لەپاشا فەرمووی: (ئایا شایەتی دەدەی كە من پێغەمبەری خودام ؟) جا ئیبنوصەییاد تەماشای پێغەمبەری كردو گوتی: شایەتی دەدەم كەتۆ پێغەمبەری عەرەبە نەخوێندەوارە بێ سەوادەكانی، ئەنجا گوتی: ئەی تۆ شایەتی دەدەی كە من پێغەمبەری خودام؟ پێغەمبەریش «دروودی خوای لەسەر بێ» شتی وای نەسەلماندو فەرمووی: (باوەڕم بەخوداو پێغەمبەرانی خودا هەیە) ئەنجا پێغەمبەر «دروودی خوای لەسەر بێ» پێی فەرموو: (لەهەواڵە نهێنییەكان، لە دەنگوباسی غەیب چی لێ دەزانی ؟) گوتی: ڕاستیشم بۆ دێ و درۆیشم بۆ دێ.

پێغەمبەر «دروودی خوای لەسەر بێ» فەرمووی: (سەریان لێ شێواندووی) لەپاشا پێغەمبەر «دروودی خوای لەسەر بێ» فەرمووی پێی: (من شتێكم بۆ گرتوویتە ناو دڵم، ئایا دەتوانی كە هەڵی بهێنی و بزانی چی وا لەدڵما) گوتی: ئەوە دوخخە ! پێغەمبەر «دروودی خوای لەسەر بێ» پێی فەرموو: (چغەت لێ بێ ! ڕادەت ناكەوێ لە پلەوپایەی خۆت — كە پلەی كوڵەنانی و كاهینییە - سەركەویت و پەی بەغەیبی خودایی ببەی و بچیتە پایەی پێغەمبەران).

عومەری كوڕی خەتتاب (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: (ئەی پێغەمبەری خودا لێم گەڕێ با لەگەردنی بدەم، پێغەمبەر «دروودی خوای لەسەر بێ» فەرمووی: (ئەگەر ئەو بێ - واتە: ئەگەر ئیبنو صەییاد جەجاڵ بێ - تۆ دەرەقەتی نایەی،

خۆ ئەگەر ئەویش نەبێ خێر لەکوشتنیدا نییە بۆ تۆ). (تاج/١٠-٢٤٨- ز - ٩٦ - ش د ت).

عەبدوڵلای کوڕی عومەر -رەزای خوایان لێ بێ- فەرمووی: لەپاشدا جارێکی تریش پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- خۆی و ئوبەیی کوڕی کەعب چوون بۆناو ئەوباخە خورمایەی کە ئیبنوصەییاد لەوێ بوو، پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- خۆی دەدایە پەنا بنکی دارەخورماکان و لەپاڵ قەدی دارەخورماکانەوە، بەماتە مات بەئەسپایی دەچووە پێشەوە، بەڵکو پێش ئەوەی کەلە ئیبنوصەییاد ئاشکرا ببێ، بەدزە شتێکی لێ ببیستێ، ئیبنو صەییاد لەسەر رایەخێ پاڵ کەوتبوو، لەناو پارچەیێ قەیفەدا بوو، لەبەر خۆیەوە لەناو قەدیفەکەدا ورتە ورتی بوو، دایکی ئیبنوصەییاد لەوکاتەدا پێغەمبەری بینی، کەوا خۆی دەداتە پەنا قەدی دارخورماکان، لەبەر ئەوە کوڕەکەی ئاگادار دەکاتەوەو بانگی دەکا: صافی ! ئەوە موحوممەدە. ئیبنوصەییاد ڕادەپەڕێ، پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (ئەگەر دایکی لێی بگەڕایێ خۆی ئاشکرا دەکرد).

٦٤٣- عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ قَالَ: (كَانَ غُلَامٌ يَهُودِيٌّ، يَخْدُمُ النَّبِيَّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَمَرِضَ، فَأَتَاهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَعُودُهُ، فَقَعَدَ عِنْدَ رَأْسِهِ، فَقَالَ لَهُ: (أَسْلِمْ) فَنَظَرَ إِلَى أَبِيهِ وَهُوَ عِنْدَهُ، فَقَالَ لَهُ: أَطِعْ أَبَا الْقَاسِمِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَأَسْلَمَ، فَخَرَجَ النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ يَقُولُ: (الْحَمْدُ لِلّٰهِ الَّذِي أَنْقَذَهُ مِنْ النَّارِ). (الحديث ١٣٥٦- طرفه في: ٥٦٥٧) [٥٤]

ئەنەس (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جاران لەمەدینە کوڕێکی جوولەکە هەبوو، خزمەتی پێغەمبەری دەکرد، کوڕەکە نەخۆش کەوت، پێغەمبەر

(٥٤) لم يوافقهُ مُسلمٌ علي تخريجه (فتح / ٣ / ٣٠٦ ح / ١٣٩٤ خاتمة). -المترجم-

دروودی خوای لەسەر بێ چوو بۆ سەردانی، لە سەرینیەوە دانیشت و پێی فەرموو: (موسوڵمان ببە) کوڕەکەیش باوکی لەلایەوە بوو سەیرێکی باوکی کرد، باوکیشی پێی گوت: بەگوێی ئەبو القاسم بکە، جا ئەویش موسوڵمان بوو، پێغەمبەریش -دروودی خوای لەسەر بێ- کە تەشریفی هەڵساو ڕۆیشت فەرمووی: (سوپاس بۆ خودا کە لەئاگری دۆزەخ رزگاری کرد). (تاج/٤/١٨٥).

٦٤٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَا مِنْ مَوْلُودٍ إِلَّا يُولَدُ عَلَى الْفِطْرَةِ، فَأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِهِ، أَوْ يُنَصِّرَانِهِ، أَوْ يُمَجِّسَانِهِ، كَمَا تُنْتَجُ الْبَهِيمَةُ بَهِيمَةً جَمْعَاءَ، هَلْ تُحِسُّونَ فِيهَا مِنْ جَدْعَاءَ). ثُمَّ يَقُولُ أَبُو هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: (فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ). (الحديث ١٣٥٩- اطرافه في: ١٣٥٨، ١٣٨٥، ٤٧٧٥، ٦٥٩٩) [٥٥]:

ئەبو هورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: (لە پێغەمبەری خۆشەویستەوە -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: (هەموو منداڵێ کاتێ لەدایك دەبێ، بەسروشت، بەخودا کرد ئامادەیە بۆ قەبوڵی ئاییني پاك، ئەگەر وازی لێ بهێنرێ بەردەوام دەبێ لەسەر خوداناسی، بەڵام لەوەودوا باوك و دایکی و نەریت و دەستوورو باوی ناو کۆمەڵ دەیگۆڕن و لەڕێ دەری دەکەن، جاهەیە دەیکەن بە جوولەکە، هەیە دەیکەن بەگاور، هەیە دەیکەن بە ئاگرپەرست، هەیە دەیکەن بەجۆرێ تر، بەڵێ هەموومنداڵێ، هەروەك چۆن بەچکەی ئاژەڵ و ماڵات لە سەرەتاوە، بەتەواوی و بەبێ کەم و کوڕی لەدایك دەبن: ئەوەتانێ نابینن کە بەچکەیێ لەو بەچکانە، لەکاتی لەدایکبووندا، لووتی بڕابێ، یا گوێی قرتابێ، یاکەمی و کورتی و ناتەواوییەکی هەبێ، بەڵام

(٥٥) أخرجه مسلم في القدر، باب: مَعْني كلِّ مولودٍ يُولدُ عَلي الفِطرَة، رقم: ٢٦٥٨.

پاش لەدایك بوون، لێیان كوڵ دەكرێ، یان لووت و گوێ و دەست و قاچییان، هی هەندێكیان دەقرتێ !) ئینجا ئەبو هورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەگەر حەزیش دەكەن بۆ پشتیوانی ئەم باسە ئەم ئایەتە بخوێننەوە: ﴿فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ –٣٠/٢٠﴾

واتە: ئەو ڕەوشت و سروشتە پاكە خودا كردە بگرن، كە خودای گەورە لە سەرەتاوە، بەنی ئادەمیزادی لەسەر دروست كردووە، ئەوە ئایینی ڕاستی دروستی دەستكردی خودا خۆیەتی، بۆیە هەرگیزو هەرگیز گۆڕینی بۆ نییە).(تاج/١/٣٨/- س/د/ت).

## داوای باوەڕ هێنان لە بێ بڕوا لەكاتی سەرە مەرگا

٦٤٥– عَنْ سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ رَحِمَهُ اللَّهُ عَنْ أَبِيهِ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ أَنَّهُ أَخْبَرَهُ أَنَّهُ: لَمَّا حَضَرَتْ أَبَا طَالِبٍ الْوَفَاةُ، جَاءَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَوَجَدَ عِنْدَهُ أَبَا جَهْلِ بْنَ هِشَامٍ، وَعَبْدَ اللَّهِ بْنَ أَبِي أُمَيَّةَ بْنِ الْمُغِيرَةِ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِأَبِي طَالِبٍ: (يَا عَمِّ ! قُلْ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، كَلِمَةً أَشْهَدُ لَكَ بِهَا عِنْدَ اللَّهِ) فَقَالَ أَبُو جَهْلٍ، وَعَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي أُمَيَّةَ: (يَا أَبَا طَالِبٍ، أَتَرْغَبُ عَنْ مِلَّةِ عَبْدِالْمُطَّلِبِ، فَلَمْ يَزَلْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَعْرِضُهَا عَلَيْهِ، وَيَعُودَانِ بِتِلْكَ الْمَقَالَةِ، حَتَّى قَالَ أَبُوطَالِبٍ آخِرَ مَا كَلَّمَهُمْ هُوَ عَلَى مِلَّةِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، وَأَبَى أَنْ يَقُولَ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (أَمَا وَاللَّهِ لَأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ مَا لَمْ أُنْهَ عَنْكَ)، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى فِيهِ: (مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ) الْآيَةَ. (الحديث ١٣٦٠– اطرافه في: ٣٨٨٤، ٤٦٧٥، ٤٧٧٢، ٦٦٨١)[٥٦].

(٥٦) أخرجه مسلم في وفاة أبي طالب، انظر شرح صحيح مسلم للنووي ج / ١ ص٢١٣، باب الدليل علي صحة إسلام من حضره الموت.. -المترجم-

سـەعیدی کـوڕی موسـویب (رەزای خـوای لێ بـێ) فـەرمووی: بـاوکم (رەزای خـوای لێ بـێ) فـەرمووی: کـاتێ نیـشانەی مـردن لـە ئـەبوتالیب دیاریـداو هاتـە سـەرمردن، پێغەمبـەر -درودی خوای لەسەر بێ- چـوو بـۆلای، لەوکاتـەدا ئەبوجـەهل و عەبـدوڵڵای کـوڕی ئـەبو ئومەییـەی کـوڕی مـوغیرەی لـەلا بـوون، پێغەمبـەر -درودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (ئەی مامە بڵێ: لا الـه الا الله، دەیکـەم بەبەڵگەی بـاوەڕو شایەتیت بـۆ دەدەم لـەلای خـودا لەسـەرئەوە کـە تـۆ ئـەم ووشـە پیرۆزەیـەت قـەبووڵ کـردووە). بـەلام ئەبوجـەهل و عەبـدوڵڵای کـوڕی ئومەییـە - کـە لـەو کاتـەدا لـەوێ بـوون - چـوونە بـن کلێشەی و پێیـان گـوت: ئـەی ئـەبوتالیب ! دەتـەوێ لـەئایینی عەبدولموتـەلیب و باووبـاپیری خـۆت لابـدەیت و حاشـای لێ بکـەیت ؟ ئـیتر ئەمانـە گـەلێ قسەیان لـەم باریـەوە لەگـەڵداکردو دڵیـان سـاردەرکردەوە، هەمووجارێ کـە پێغەمبـەر -درودی خوای لەسەر بێ- دەیـدا بەگوێیـدا کەشایەتمان بهێنـێ، ئەوانیش وەك شمڵی شـەڕ بەرپەرچییان دەدایـەوەو دووبـارە دەیانگوتـەوە: ئـای حاشـا دەکـەی لـە میللـەت و ئـایینی بـاوو بـاپیری خـۆت، هـەتاکوو دواقـسەی ئـەوەبوو گـوتی پێیـان: کـە ئـەو لەسـەر ئـایینی عەبدولموتـەلیبی بـاوکێتی، وە قایل نـەبوو کـە بڵێ: لا الـه الا الله. ئـیتر پێغەمبـەر -درودی خوای لەسەر بێ- فـەرمووی: (ئـەدیی بـەخودا هـەربۆت دەپاڕێمـەوەو داوای لێخـۆش بوونـت لـەخودا بـۆ دەکەم، بەمەرجێ خودا ئەوەم لێ قەدەغە نەکات جاخودای گـەورەو مـەزن ئـەم ئایەتـەی نـاردە خوارەوە،کەدەفـەرموێ: ﴿مَـا كَـانَ لِلنَّبِـيِّ وَالَّـذِينَ آمَنُـواْ أَن يَسْتَغْفِرُواْ لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُواْ أُوْلِي قُرْبَى مِن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُـمْ أَنَّهُـمْ أَصْـحَابُ الْجَحِيمِ. (١١٣) سورة التوبة﴾. (تاج/٦ ل-٢١٢-ش).

## راڤەو شیکردنەوە:

١. ئـەبو تالیـب کـە مامـەی هـەقی پێغەمبـەرە، واتـە: بـرای دایـك و

باوکیەتی، ناوی عەبدولەنافی کوڕی عەبدول موتەلیبە، باوکی ئیمامی عەلییە.

٢. ئەبو جەهل بەکافری کوژراوە لەغەزای بەدردا (بڕ/تاج/٨ ل /٢٠٨).

ناوی عەمری کوڕی هشامی کوڕی موغییرەی مەخزوومیە، کەمێ خێل بوو، مابون بوو واتە: بەدناو بوو، مەشهورە بەفیرعەونی ئەم ئوممەتی ئیسلامە، کاتێ پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- هەواڵی کوشتنی بیست، خۆی چوو بۆ سەر لاشەکەی تابزانێ ڕاستە کوژراوە، کە بینی تۆپاوە، ڕاوەستا لەسەری و فەرمووی: (سوپاس بۆ خودا کە بەهۆی کوشتنی ئەم ستەمکارەوە ئیسلام و موسوڵمانانی سەربەرزکرد) سێجار وای فەرموو. ئەبوجەهل زۆر ئازاری پێغەمبەرو موسوڵمانانی دەدا (بڕوانە: بەرگی یەکەم لەم کتێبە پیرۆزە فەرموودەی ژمارە —١٧٢). ئەم مەلعوونە یەکەم کەس بوو، کە لەسەردەمی ئیسلامدا سەری بڕێ، کاتێ پێغەمبەر بە کوژراوی چووە سەر لاشەکەی فەرمووی: (ئەی دوژمنی خودا ! سوپاس بۆ ئەو خودایەی کە ڕیسوای کردی، ئەمە فیرعەونی ئەم ئوممەتە بوو، سەرۆکی پێشەوایانی بێبڕواکانە) ئەوجا کوڕنوشێکی سوپاسی بۆ خودا برد، لاشەکەی تووڕ درایە بیرەکەی بەدرەوە.

١. عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئومەییە، گەرچی لەپێشدا زۆر ئازاری موسوڵمانانی داوەو، دوژمنایەتییەکی سەختی بەرابەر بەپێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- ئەنجامداوە، بەڵام لەپێش ئازادکردنی شاری مەککەدا ئیسلام بووە، وەئیسلامێکی جوانی لێ دەرچوو، پورزای پێغەمبەرە -دروودی خوای لەسەر بێ- دایکی ناوی عاتیکەی کچی عەبدولموتەلیبە، برای باوکی حەزرەتی ئوموسەلەمەی هاوسەری پێغەمبەرە -دروودی خوای لەسەر بێ- لە خزمەت پێغەمبەردا ئامادەی فەتحی مەککەو غەزای حونەین و غەزای تائیف

بووه، له غەزای تائیف تیرێ بەری دەکەوێ، بەو تیرە شەهید دەبێ.(بڕ: تاج/٣ ل/١٣٩ ف/٦).

٢. سەعیدی کوڕی موسەییەبی کوڕی حەزن. سەعید تابیعییە، باوکی و باپیرەی صەحابی بوون، لەمەککەوە کۆچیان کرد بۆ مەدینە، موسەییەب بازرگان بوو، لەو کۆمەڵەیە، کە لەژێر درەختەکەی شەجەرەتوول ریضواندا پەیمانی بەست لەگەڵ پێغەمبەردا، حەوت فەرموودەی گێڕاتەوە، سیانیان لەبوخاری پیرۆزدا هەیە. حەزن ڕۆژی ئازادبوونی مەککە ئیسلام بوو، یەکێك بوو لە پیاوماقوڵانی قوڕەیش، ئامادەی شەڕی یەمامە بوو، لەکاتی جێنشینی ئەبوبەکردا لە ڕۆژەکەی شەڕی یەمامەدا شەهیدکرا، ڕەزاو ڕەحمەتی خوداو بەرەکەتی خودا لەخۆی و لە موسەییەبی کوڕی و سەعیدی کوڕەزای. سەعید تابیعییە، یەکێکە لەرجالی صەحیحەین یەکێکە لە مەلا گەورەکانی مەدینە، کە ناوداران بە (فقهاء المدينة) لەنزیکەی چل هاوڕێی پێغەمبەرەوە فەرموودەی گێڕاوەتەوە، دادەنرێ بە سەروەری تابیعین، لەساڵی سێیەمی جێنشینی عومەری کوڕی خەتتابدا لە دایك بووە، لە ساڵی نەوەدو چواری کۆچییدا لەسەردەمی جێنشینیی وەلیدی کوڕی عەبدولمەلیك دا، فەرمانی هەقی بەجێهێناوەو مردووە، ڕەزاو ڕەحمەتی خوا لەم کوڕو باوك و باپیرە بێ. (بڕوانە: تاج / ٥ ل — ٣٣١ + تاج/١٠ل - ١٦١ف— ١+ عمده القاری و/ ٨ ص١٨٠ العمده / ٢٢ ص ٢٠٧ + ئیصابەو ئیستیعاب، لە ناوی (حزن و مسیّب) دا.

٣. ئەم فەرموودەیە:

أ- دادەنرێ بەمورسەلی صەحابی، چونکە لەکاتی ئەم ڕووداوەدا، کە ئەم گفتوگۆیە لەنێوانی پێغەمبەرو ئەبوتالیب و ئەواندا ڕوویداوە، نە موسویب و نە حەزنی باوکی موسوڵمان نەبوون و، موسەییبیش ڕوونی

نەکردوەتـەوە کـە ئـەم فەرموودەیـەی لـەکێ بیـستووە، بـەڵام مورسـلی صەحابی بڕیاری مەرفووعی هەیە، چونکە صەحابە هەموویان عدولن.

ب- ئەم فەرموودەیە کە بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتـەوە، دادەنـرێ بەیەکێ لە فەرموودە ئەفرادەکانی صەحیحەین چونکە ئەم فەرموودەیە کـە موسـەییب دەیگێڕێتـەوە، موسـەیب یـەك ڕاوی هەیـە، کـە سـەعیدی کوڕیەتی، بەلایەنی کەمەوە بۆ ئەوەی رەفعی جەهالە، لـە ڕاوی ببـێ دەبـێ دوو ڕاوی ببێ، بـەڵام چـونکە صـەحابە هـەموویان دادپـەروەرن تاقـە یـەك ڕاویشی هەبێ بەسە.

## باسی خوێندنەوەی ئامۆژگاری لەسەر گۆڕو دانیشتن لەدەوری ئامۆژگار

٦٤٦- عَنْ عَلِيّ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: كُنَّا فِي جَنَازَةٍ فِي بَقِيعِ الْغَرْقَدِ، فَأَتَانَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَعَدَ وَقَعَدْنَا حَوْلَهُ، وَمَعَهُ مِخْصَرَةٌ، فَنَكَّسَ، فَجَعَلَ يَنْكُتُ بِمِخْصَرَتِهِ ثُمَّ قَالَ: (مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ، مَا مِنْ نَفْسٍ مَنْفُوسَةٍ، إِلَّا كُتِبَ مَكَانُهَا مِنْ الْجَنَّةِ وَالنَّارِ، وَإِلَّا قَدْ كُتِبَ: شَقِيَّةً، أَوْ سَعِيدَةً) فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَفَلَا نَتَّكِلُ عَلَى كِتَابِنَا وَنَدَعُ الْعَمَلَ، فَمَنْ كَانَ مِنَّا مِنْ أَهْلِ السَّعَادَةِ فَسَيَصِيرُ إِلَى عَمَلِ أَهْلِ السَّعَادَةِ وَأَمَّا مَنْ كَانَ مِنَّا مِنْ أَهْلِ الشَّقَاوَةِ فَسَيَصِيرُ إِلَى عَمَلِ أَهْلِ الشَّقَاوَةِ ؟ قَالَ: (أَمَّا أَهْلُ السَّعَادَةِ فَيُيَسَّرُونَ لِعَمَلِ السَّعَادَةِ، وَأَمَّا أَهْلُ الشَّقَاوَةِ فَيُيَسَّرُونَ لِعَمَلِ الشَّقَاوَةِ). ثُمَّ قَرَأَ: (فَأَمَّا مَنْ أَعْطَى وَاتَّقَى، وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَى ...) الْآيَةَ. (الحديث ١٣٦٢- اطرافه في: ٤٩٤٥، ٤٩٤٦، ٤٩٤٧، ٤٩٤٨، ٤٩٤٩، ٦٢١٧، ٦٦٠٥، ٧٥٥٢) [٥٧]:

---

(٥٧) أخرجه مسلم في القدر، باب: كيفية خلق الآدمي في بطن امه وكتابة رزقه.. رقم: ٢٦٤٧.

پێشەوا عەلی (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەگەڵ تەرمێك بووین، لەگۆڕستانی بەقیعول غەرقەد، پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- تەشەریفی هات بۆلامان، پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- تەشریفی دانیشت، ئێمەیش لەدەوری دانیشتین، حەزرەت دار دەستێکی بەدەستەوە بوو، سەری دانەواندو مات بوو، خۆش خۆش داردەستەکەی دەخشاند لە عەرزەکە، وەك کەسێ پەرۆشی شتێ بێو بیر بکاتەوە، ئەوجا فەرمووی: (یەك بەیەکتان، یەك بەیەکی دروست کراوان، لەسەرەتاوە، لە ئەزەلدا جێگەی هەم لە بەهەشت و هەم لە دۆزەخدا نووسراوە، هەروا نووسراوە کە بەدبەختە یا بەختەوەرە). پیاوێکیش لەیاران فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا ! جا کەوایە بۆ بەو نووسراوەمان پشت نەبەستین و پشتی لێ نەدەینەوەو ئیتر واز لە کاروکردەوەی چاکە بهێنین، ئێمە چی بکەین و چی نەکەین، بێ سوودە، چونکە جێگەمان لە بەهەشتا، لەدۆزەخدا لەپێشدا، لە ئەزەلەوە دیاریکراوە. فەرمووی -دروودی خوای لەسەر بێ-: ئێوە لەکاری چاکە سارد مەبنەوەو کارو کردەوەی خۆتان بکەن، قەدەر سرێکی خودایە، چارەنووس ڕازێکی خودایە، هۆش و ئەقڵی ئێوە دەرکی حیکمەت و دانایی ئەو نهێنییە ناکات، هەرکەسێ لەئەزەلدا، لەزانستی خودادا بۆ کوێ دروست کرابێ، ڕێگەی ئەوێ دەگرێ، جا لەسەر ئەم بنیاتە بەختیار ڕێگەی چاکە دەگرێ و بەدکار ڕێگەی خراپە، بەم پێیە کاری باش نیشانەی بەهەشت و خراپ نیشانەی دۆزەخە).

ئینجا پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- لە بۆ پشتییوانی ئەم مەسەلەیە، ئەم ئایەتەی خوێندەوە کە دەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا مَنْ أَعْطَى وَاتَّقَى وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَى ... -٩٢-٥-٧﴾.

واتە: جا هەرکەسێ ماڵی خۆی لەرێگەی خوادا بداو، زەکات و

سەرفیترەو بەشی بەشدارانی لێ بداو، لەخودا بترسێ و کۆ لەگوناه و تاوان بکاتەوە، پەلاماری سەرو نامووس و ماڵی خەڵکی نەدا، وە لە هەمان کاتدا پێی وابێ کە چاکە چاکەیەو خراپە خراپەیە، ئەوە ئێمەش کە خودای بەهەقی ئێوەین ئەو کەسە دەخەینە سەر ڕێگەی چاکەو، ئامادەی دەکەین بۆ گەیشتن بەپلەی باش کە شادبوونە بە دیداری خودای مەزن و چوونە ناو بەهەشتی بەرینە !). (بڕ: تاج/٧ ل/٢٥٣ ف/١).

## باسی خۆ کوشتن

٦٤٧- عَنْ ثَابِتِ بْنِ الضَّحَّاكِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (مَنْ حَلَفَ بِمِلَّةٍ غَيْرِ الْإِسْلَامِ، كَاذِبًا مُتَعَمِّدًا فَهُوَ كَمَا قَالَ، وَمَنْ قَتَلَ نَفْسَهُ بِحَدِيدَةٍ عُذِّبَ بِهِ فِي نَارِ جَهَنَّمَ). (الحديث ١٣٦٣- اطرافه في: ٤١٧١، ٤٨٤٣، ٦٠٤٧، ٦١٠٥، ٦٦٥٢) [٥٨]

ثابتی کوڕی ضحاك (ڕەزای خوای لێ بێ) لەپێغەمبەرەوە -درودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: هەرکەسێ سوێند بخوا بەمیللەتی غەیری ئیسلام، وەك ئەوە بە قەستی دڵ بڵێ: ئەگەر ناپاکی لەگەڵی خۆم بکەم جوولەکە بم، وە لەپاشا درۆزن دەرچێ و ناپاکی لەگەڵی خۆی بکا، ئەوە وەك خۆی دەڵێ وایە، بەو قسەیەی کافر دەبێ، وە کەسێ بە شتێ خۆی بکوژێ لەناو ئاگری دۆزەخیشا، دیسانەوە بەو شتەیە سزا دەدرێتەوە، لەعنەت و نەفرەت کردنیش لە موسوڵمان بە قەد کوشتنەکەی گوناهەو، موسوڵمان چی لەعنەتی لێ بکەیت و چی بیکوژی چوون یەکە، وە ئەو کەسەی بەموسوڵمان بڵێ: ئەی بێ بڕوا ! ئەی کافر ! ئەوە وەك بیکوژی وایە) (تاج/٣ ل/٣٢٥ ف/٣ - ش/د/ت/ن).

---

(٥٨) أخرجَهُ مُسلِم في الإيمان، باب: غلظ تحريم قتل الإنسان نفسه، رقم: ١١٣.

## راڤەو شیکردنەوە:

ثـابیتـی کـوڕی ضـحاك ئەنـصاریه، لەکۆمـەڵی اصـحاب الـشجرەیه، کـە پێیـان دەوترێـت: تاقمـەی بەیعـەتولرپیزوان، بـەڵام ئەوکاتـە منـاڵ بـووە، ئامادەی غەزای بەدرو صوڵحی حودەیبییـەو غـەزای خەنـدەق وحـەمرائول ئەسەد بووە. لە اصابەدا دەفەرموێ: لەساڵی سێی بیعثەتـدا لـەدایك بـووە، واقیـدی دەفـەرموێ: لـە سـێی کۆچـییدا لـەدایك بـووەو لـە چـل و پێـنج دا مـردووە.

٦٤٨- عن جندب رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ عن النبي صَلّٰى اللّٰـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلّٰمَ قـال: (كَانَ بِرَجُلٍ جِرَاحٌ فَقَتَلَ نَفْسَهُ فَقَالَ اللّٰـهُ بَـدَرَنِي عَبْـدِي بِنَفْـسِهِ حَرَّمْـتُ عَلَيْـهِ الْجَنَّةَ). (الحديث ١٣٦٤- طرفه في: ٣٤٦٣) [٥٩]:

جونـدوب (رەزای خوای لێ بێ) لـە پێغەمبـەرەوە -درودی خوای لەسەر بێ- دەفـەرموێ (لـە نەتـەوەکانی پـێش ئێـوە کـابرایێ دەبـێ، زامـار دەبـێ، جـا ئـارامی لێ هەڵـدەگیرێ و چـەقۆیی دێنـێ و دەسـتی خـۆی پـێ لـەت لـەت دەکـا، ئـیتر خوێنەکـەی ناگیرسـێتەوە، تـادەمرێ، خـوای گـەورەیش دەفـەرموێ: (ئـەم بەندەیەم دەست پێشکەری لێ کردم و پەلەی لەمردنی خۆی کـردو ئـارامی نـەگرت لـەژێرباری خـودادا، وامنـیش لەسـەر ئـەوە بەهەشتم لـەو حـەرام کرد). (تاج /٩/٣٩ فتـ١):

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

جنـــدوبی کـــوڕی عەبـــدوڵڵای کـــوڕی ســـوفیانی بوجـــەلی، لەکۆفـــە دادەنیشت، لەپاشا لەبەصرە، ناوداربوو بەجوندبی خێر، لەپاش فیتنەکـەی

(٥٩) أخرَجَهُ مُسلِم في الإيمان، باب: فيمَن يثني عليه خيراً أو شر.. رقم: ١١٣.

ئیبنو زووبەیر مردووە، (رەزای خوای لێ بێ).

٦٤٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (الَّذِي يَخْنُقُ نَفْسَهُ يَخْنُقُهَا فِي النَّارِ، وَالَّذِي يَطْعُنُهَا يَطْعُنُهَا فِي النَّارِ). (الحديث ١٣٦٥- طرفه في: ٥٧٧٨) [٦٠]

ئەبو هوریرە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (هەرکەسێ لەم جیهانەدا بە هەرشتێ، یا بە هەرجۆرێ خۆی بکوژێ لەقیامەتیشدا دیسانەوە بەو شتە سزا دەدرێ، بەوێنە کەسێ بەخنکان خۆی بکوژێ لەناو ئاگری دۆزەخیشا سزاکەی ئەوەیە کە خۆی دەخنکێنی هەروا ئەگەر بەچەکێ خۆی بکوژێ).

## باسی بەچاکە ناو هێنانی مردوو

٦٥٠- عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ يَقُولُ: (مَرُّوا بِجَنَازَةٍ، فَأَثْنَوْا عَلَيْهَا خَيْرًا، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (وَجَبَتْ)، ثُمَّ مَرُّوا بِأُخْرَى فَأَثْنَوْا عَلَيْهَا شَرًّا، فَقَالَ: (وَجَبَتْ)، فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ مَا وَجَبَتْ ؟ قَالَ (هَذَا أَثْنَيْتُمْ عَلَيْهِ خَيْرًا فَوَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ، وَهَذَا أَثْنَيْتُمْ عَلَيْهِ شَرًّا فَوَجَبَتْ لَهُ النَّارُ، أَنْتُمْ شُهَدَاءُ اللَّهِ فِي الْأَرْضِ). (الحديث ١٣٦٧- طرفه في: ٢٦٤٢) [٦١]:

ئەنەس کوڕی مالیك (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەرو -دروودی خوای لەسەر بێ- کۆمەڵێ لە هاوڕێیانی دانیشتبون، تەرمێ لەلایانەوە تێپەڕی، خەڵکەکە

(٦٠) من أفراد البخاري من هذا الوجه، و أخرجه في الطب من طريق الأعمش عن أبي صالح عن أبي هريرة.. ومن ذلك الوجه أخرجه مسلم: (عيني / ٨/ ١٩٢) -المترجم-

(٦١) أخرجه مسلم في الجنائز، باب: فيمن يثني عليه خيراً أو شر.. من الموتي، رقم:٩٤٩.

وەسفی باشی ئەویان کرد، پێغەمبەری خودایش ـدروودی خوای لەسەر بێـ و سەروماڵ و منداڵ هەست و نەست بە قوربانی گەردی سەرگۆڕی پیرۆزی بێ — فەرمووی: (پێویست بوو) جا تەرمێکی تریش لەلایانەوە تێپەڕی، خەڵکەکە بەخراپە ناویان هێنا، پێغەمبەریش ـدروودی خوای لەسەر بێـ فەرمووی: (پێویست بوو). عومەری کوڕی خەتتابیش (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا ! باوك و دایکم بەقوربانت بن، چی پێویست بوو، مەبەستت چییە لەوە کە دەفەرمووی پێویست بوو؟ فەرمووی: (ئەوکەسەی کەئێوە وەسفی باشیی ئەوبکەن بەهەشت پێویست دەبێ بۆی، وە ئەو کەسەی ئێوە وەسفی خراپی ئەو بکەن، دۆزەخ پێویست دەبێ بۆی، ئێوە شایەتانی خودان لەسەر زەوی، ئەوەی شایەتی باشی بۆ بدەن، بەهەشت بۆ خۆی دابین دەکا، ئەوەی شایەتی خراپی لێ بدەن، دۆزەخ مسۆگەر دەکا بۆ خۆی). (تاج/١/٥٦٤/٢ + ریاض/٣ ل/٧٧٢ ز/١٦٣ ف/١).

٦٥١- عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَيُّمَا مُسْلِمٍ شَهِدَ لَهُ أَرْبَعَةٌ بِخَيْرٍ، أَدْخَلَهُ اللَّهُ الْجَنَّةَ) فَقُلْنَا: وَثَلَاثَةٌ ؟ قَالَ: (وَثَلَاثَةٌ). فَقُلْنَا: وَاثْنَانِ ؟ قَالَ: (وَاثْنَانِ) ثُمَّ لَمْ نَسْأَلْهُ عَنْ الْوَاحِدِ. (الحديث ١٣٦٨- طرف في:٢٦٤٣) [٦٢]:

ئەبولئەسوەد (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: چووم بۆ مەدینە، پەتایێ داکەوتبوو، زوو زوو خەڵك دەمردن، لەخزمەتی عومەردا دانیشتم، تەرمێ لەوێوە ڕەتبوو، خەڵکەکە وەسفی چاکەیان دەکرد، عومەریش (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: (مسۆگەر بوو) لەپاشا تەرمێکی تریش تێپەڕ بوو، خەڵکەکە وەسفی خاوەن تەرمەکەیان بە باشە دەکرد، عومەریش (رەزای خوای لێ بێ)

(٦٢) لم يوافقْهُ مُسْلِمٌ علي تخريجه (فتح / ٣ / ٣٠٦ خاتمة) ـ المترجم

فەرموویەوە: (مسۆگەر بوو) لەپاشا تـەرمێکی سێیەم ڕەت بـوو، خەڵکەکە باسـی خاوەنەکـەیان بـە خراپـە دەکـرد، وەك ئـەوە دەیـانگوت: بەڕاسـتی پیاوێکی بەد بوو، عومەریش گوتییەوە: (مسۆگەربوو).

ئەبولئەسـوەد دەفـەرموێ: منـیش سـەرم لـەم فەرمایـشتەی عومـەر سوڕما، چۆن سەبارەت بە کەسێ مەدحی بکەن هـەردەڵێ: (مـسۆگەر بـوو) هەروا سەبارەت بە کەسێکیش زەمی بکەن هەر دەڵێ (مسۆگەر بوو) لەبـەر ئـەوە لێـیم روونکـردەوەو گـوتم: ئـەی فـەرمانڕەوای موسـوڵمانان ! چـی مسۆگەر بوو، وە ئـەم فەرمایشتە واتـای چییە ؟ فـەرمووی: (ئـەو گوتەیـە دەڵـێم کـە پێغەمبـەر خـوای دروودی خوای لەسەر بێ لەوێنـەی ئـەم شـوێنەدا دەیفـەرموو، کـە ئـەم گوتـە پیرۆزەیـەتی: (هـەر موسـوڵمانێ چوار کـەس شایەتی خێری بۆ بدەن، خودای گەورە دەیباتە بەهەشـتەوە). ئێمـەش کـە لە خزمەتیدا بووین، عەرزمان کرد، ئەی ئەگەر کەسێ سێ کـەس شـایەتی بۆ بـدەن چۆنە ؟ فـەرمووی: (سێ کەسـیش شـایەتی بـۆ بـدەن هەروایـە). گوتمان ئەی دووان ؟ فـەرمووی: (دوانـیش هـەروا). بـەڵام بـۆ یـەك شـایەت لێمان نـەپرسی. (تاج/١/٥٦٤/ ٢ + ریاض/٣ ل/٧٧٥ ز/١٦٣ ف/٢).

## سـزای نـاو گـۆڕ

٦٥٢- عَنْ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ عَـنْ النَّبِـيِّ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِذَا أُقْعِدَ الْمُؤْمِنُ فِي قَبْرِهِ، أُتِيَ، ثُـمَّ شَـهِدَ أَنْ لَـا إِلَـهَ إِلَّـا اللَّـهُ وَأَنَّ مُحَمَّـدًا رَسُـولُ اللَّـهِ، فَـذَلِكَ قَوْلُـهُ: (يُثَبِّـتُ اللَّـهُ الَّـذِينَ آمَنُـوا بِـالْقَوْلِ الثَّابِتِ). (الحديث ١٣٦٩ – طرفه في: ٤٦٩٩)[٦٣]:

(٦٣) أخرجه مسلم في الجنة وصفة نعيمها وأهلها، باب: عرض مقعد.. رقم: ٢٨٧١.

بەراو (رەزای خوای لێ بێ) گوتی پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (موسوڵمان کاتێ دەینێژن، دوو فریشتە - کە ناویان نەکیرو مونکیرە - بۆ تاقیکردنەوە دێنەسەری و دایدەنیشێنن و لێی دەپرسن: خوات کێیە؟ پێغەمبەرت کێیە، لەسەر چی ئاینێکی ؟ خودای گەورەیش توفیقی دەدات و دەڵێ: اشهد ان لا اله الا الله وان محمد رسول الله).

شایەتی دووەم کە هەرخودا خودایەو خودای بەهەقی تر نییەو محمد پێغەمبەری خودایە، خودای من ئەڵلایەو پێغەمبەرم موحەممەدە، جا مەبەست لەم ئایەتە پیرۆزە ئەم پرسیارو وەلامەی ناوگۆڕە، کە لەقورئان دا دەفەرموێ: ﴿ يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ -١٤-٢٧- ﴾.

واتە: خودای گەورە بەهۆی ئەم وتارە دامەزراوە جوانەوە، کە ووشەی (لا اله لا الله محمد رسول الله) یە موسوڵمان رزگار دەکاو دایدەمەزرێنێ لە دنیاو قیامەتدا. (تاج/١/٥٨٠ ف/١) بڕوانە: فەرموودەی ژمارە/٦٣٨ کە لەپێشەوە رابوردن لەم پەڕاوە پیرۆزەدا.

٦٥٣- عَنْ ابْنَ عُمَرَ رَضِي اللَّهُ عَنْهُما أَخْبَرَهُ قَالَ: اطَّلَعَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى أَهْلِ الْقَلِيبِ، فَقَالَ: (وَجَدْتُمْ مَا وَعَدَ رَبُّكُمْ حَقًّا)، فَقِيلَ لَهُ: تَدْعُو أَمْوَاتًا ؟ فَقَالَ: (مَا أَنْتُمْ بِأَسْمَعَ مِنْهُمْ وَلَكِنْ لَا يُجِيبُونَ). (الحديث ١٣٧٠ طرفاه في: ٣٩٨٠، ٤٠٢٦) [٦٤]

ئیبنوعومەر -رەزای خوایان لێ بێ- فەرمووی: حەزرەت -دروودی خوای لەسەر بێ- لەپاش سێ رۆژ، چووە سەرئەو بیرەی کەلاشەی ئەبو جەهل و ئومەییەی کوڕی خەلەف و کۆمەڵێکی تری لەکوژراوانی رۆژی بەدری تێدا بوو، لەسەر

(٦٤) أخرجهُ مسلِم في الجنائز (عمدة القاريء / ٨ / ٢٠١، فتح /٣ / ٣٠٦ -خاتمة-). -المترجم-

لێواری بیرەکە وەستا، دەستی کرد بە بانگکردنی کافرە کوژراوەکانی ناو بیرەکەو یەکە یەکە، بەناوی خۆیان و باوکیانەوە بانگی دەکردن و دەیفەرموو: ئەی ئەبوجەهلی کوڕی هشام ! ئەی ئومەییەی کوڕی خەلەف ! ئەی فیساری کوڕی فیسار ! ئەی ئەوەو ئەی ئەوە ! ئایا پەشیمانیتان حاصل کردو، ئێستا خۆزگە دەخوازن کە ئەم پەندەتان بەخۆتان نەدایەو، لەدنیادا موسوڵمان ببونایەو، لەفرمانی خوداو پێغەمبەری خودا دەرنەچوونایەو، ئەم ڕۆژە ڕەشەتان بەسەر خۆتان نەهێنایە، دەی بزانن ئەوە ئێمە لەسایەی خوداوە بەئاواتی خۆمان گەیشتین و، ئەو مژدەو بەڵێنەی کە خودای خۆمان وادەی پێماندا‌وە، هاتەدی و بەچاوی خۆمان دیمان، دیارە ئێوەش بەتۆڵەی سەختی کاری بەدی خۆتان گەیشتوون و نەو هەڕەشەو ئێش و ئازارەی کەخودا وادەی ئەوەی پێدا بوون، بەچاوی خۆتان بینیتان !) ئیمامی عومەر (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: (قوربان ! قسەی چی لەگەڵ مردووان دەکەی ؟ فەرمووی: (سوێند بەو کەسە کە گیانی موحەممەدی بە دەستە، ئەوانیش وەك ئێوە ئاوا گوێیان لە قسەکانمە، بەلام ناتوانن وەلام بدەنەوە). (تاج /٨/٢٠٠/٦)

٦٥٤- عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْها قَالَتْ: إِنَّمَا قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (إِنَّهُمْ لَيَعْلَمُونَ الْآنَ أَنَّ مَاكُنْتُ أَقُولُ لَهُمْ حَقٌّ). وَقَدْ قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: (إِنَّكَ لاَ تُسْمِعُ الْمَوْتَى). (الحديث ١٣٧١ طرفاه في: ٣٩٧٩، ٣٩٨١):

عائیشەی هاوسەری حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ئەوەی کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەم بارەیەوە فەرموویەتی، کە گوایە قسەی لەگەڵ لاشەکانی ناو بیرەکەی بەدردا کردووە، ئەمەیە کە من دەیڵێم، نەك ئەوەیە کە ئیبنو عومەرو ئەو خەڵکەی تر دەیڵێن پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) تەنیا ئاوای فەرموو بوو: (لەڕاستیدا ئەمانە ئێستا بۆیان دەرکەوتووەو

زۆرباش دەزانن کە ئەو قسانەی من بۆیانم دەکرد، سەبارەت بەڕاست و دروستی ئایینی پیرۆزی ئیسلام، هەموویان هەق بوون)، عائیشە فەرمووی: (ئەوەتا خودای گەورە بەدەقی ئایەتی قورئان، بەپێغەمبەر دەفەرموێ: ﴿إِنَّكَ لَا تُسْمِعُ الْمَوْتَى: واتە: بێگومان دەنگی تۆ ناگات بەمردووان و تۆ ناتوانی گوتەی خۆت بەمردووان ببیستی﴾ واتە: کەواتە چۆن ئەو خەڵکە دەڵێن: پێغەمبەر قسەی لەگەڵ بێبڕواو کوژراوەکانی بیرەکەی بەدردا کردووە؟).

## راڤەو شیکردنەوە:

لێرەدا بەپێی شەرحە گەورەکانی صەحیحی بوخاری و صەحیحی موسلیم، ئەم چەند خاڵە ڕوون دەکەینەوە:

١- پرسیارو وەڵامی ناوگۆڕ هەق و ڕاستە، لەپاش ناشتن دوو فریشتە دێن بۆلای، خودا ڕۆحی دەکاتەوە بەبەرداو ئەو پرسیارو وەڵامانە ڕوودەدەن کە لە فەرموودەی ژمارە (٦٥٢٠) دا رابووردن.

٢- جەماوەری زاناکان فەرموودەکەی ئیبنوعومەر پەسەند دەکەن و رایەکەی عائیشە بەرپەرچ دەدەنەوەو ئایەتەکە ئاوا تەئویل دەکەن: (ئەگەر قسەو گوتەی تۆش ببیستن سوودی نابێ بۆیان).

٣- رای جەماوەر وایە: کە لەکاتی پرسیارو وەڵامی ناو گۆڕدا، گیان دەکرێتەوە بەبەر لەشی مردووەکەدا، نەك وەك هەندێ دەڵێن: پرسیار ئاراستەی گیانی دەکرێ و بەس.

٤- قسەی دروست لەم جۆرە باسانەدا، کە بابەتێکی غەیبی پەتین، ئەوەیە کە دەقی فەرموودە دەیفەرموێ، لەبەرئەوە گوێ بەبۆچوونی

ئەقڵی ڕووت نادرێ. عەسقەلانی- ڕەحمەتی خودای لەسەربێ- لەفەتحول بارێدا بەدەق دەفەرموێ: (هەڵەی ئەمانە لەوەوە هاتووە کە قیاسی غایب لە شاهید دەکەن و کاروباری پاش مردن بەپێوەری پێش مردن دەپێون) بڕوانە: فەرمموودەی ژمارە: ٦٣٨ کە لەپێشەوە ڕابوورد. هەروا بڕوان: ریاض الصالحين/٢ ل/١٣٩ ژ/٤/٥٨٤.

٦٥٥- عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتَ أَبِي بَكْرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَتْ: قَامَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَطِيبًا، فَذَكَرَ فِتْنَةَ الْقَبْرِ الَّتِي يَفْتَتِنُ فِيهَا الْمَرْءُ فَلَمَّا ذَكَرَ ذَلِكَ ضَجَّ الْمُسْلِمُونَ ضَجَّةً. (الحديث ١٣٧٣):

ئەسمای کچی ئەبوبکر (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژێ پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- هەڵسایەوە، وتارێکی پڕ سۆزو کاریگەری فەرموو، بەدوورو درێژی باسی ئەو ئەزموونەو تاقیکردنەوە سامناکەی فەرموو، کە لەپاش مردن لە گۆڕدا بۆ مرۆڤ ئەنجام دەدرێ، جا ئەوەندە بەسامناکی باسی کرد، موسوڵمانان زۆر شڵەژان و لە تاوان هاواریان لێ هەڵسا).

## پەناگرتن بەخودا لە سزای گۆڕ

٦٥٦- عَنْ أَبِي أَيُّوبَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: خَرَجَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: وَقَدْ وَجَبَتْ الشَّمْسُ، فَسَمِعَ صَوْتًا، فَقَالَ: (يَهُودُ تُعَذَّبُ فِي قُبُورِهَا). (الحديث: ١٣٧٥) [٦٥]:

ئەبو ئەیووبی ئەنصاری (رەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: جارێ پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- لەپاش خۆرئاوا بوون تەشریفی دەرچوو بۆ دەرەوەی مەدینە جادەنگێکی سامناکی بیست، لەبارەیەوە فەرمووی: (ئەوە جوولەکەن

(٦٥) أخرجَهُ مسلم في الجنّةِ وَصِفَةِ نَعيمِها وَأهلِها، باب: عرض المقعد.. رقم: ٢٨٦٩

لەگۆڕەکانیانا سزاو ئازار دەدرێن).

٦٥٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَدْعُو وَيَقُولُ: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَمِنْ عَذَابِ النَّارِ، وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ، وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ). (الحديث ١٣٧٧) [٦٦]:

ئەبوهورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەردەوام پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- ئەم نزایەی دەکرد: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَمِنْ عَذَابِ النَّارِ، وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ، وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ: خودایە! پەنا دەگرم بەتۆ لەسزای گۆڕو، لەسزای ئاگری دۆزەخ و، لەفیتنەو ئاژاوەی ژیان و مردن و، لەفیتنەو ئاژاوەی جەجاڵە کوێرەی هەلاتباز). (تاج /١/٥٨٤- ش-/ن).

## مردوو لەگۆڕا، بەیانیان و ئێواران جێگەی خۆی پیشان دەدرێ

٦٥٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا مَاتَ، عُرِضَ عَلَيْهِ مَقْعَدُهُ بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ، إِنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ، فَمِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ، وَإِنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ، فَمِنْ أَهْلِ النَّارِ، فَيُقَالُ: (هَذَا مَقْعَدُكَ حَتَّى يَبْعَثَكَ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ). (الحديث ١٣٧٩- طرفاه في: ٣٢٤، ٦٥١٥) [٦٧]:

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر -رەزای خوایان لێ بێ- فەرمووی: پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (ئێوە کاتێ دەمرن، گشت ڕۆژی بەیانیان و ئێوارانن هەر کەسەتان جێگەی خۆی پیشان دەدرێ، جا ئەگەر بەهەشتی بێ ئەوا

---

(٦٦) أخرَجَهُ مسلم في المساجد وَمواضع الصَّلاة، باب: نا يستعاد منه الصَّلاة، رقم: ٥٨٨

(٦٧) أخرَجَهُ مسلم في الجنّةِ وَصِفَةِ نعيمِها وأهلِها، باب: عرض المقعد الميت.. رقم:٢٨٦٦.

جێگەی خۆی لە بەهەشتا دەبینێ، وە ئەگەر دۆزەخی بێ، ئەوا جێگەی خۆی لە دۆزەخا دەبینێ، وەپێی دەڵێن: ئەمە جێگەتە، لە رۆژی قیامەتا، کە خودا زیندووت دەکاتەوە دێیتە ئێرەو ئەمە ماڵی هەتا هەتاییتە). (تاج/١/٥٨٣ -ش-ت-ن).

## منالی بیبروایان، کە بەمندالی دەمرن جیگەیان کوییە؟

٦٥٩- عَنْ الْبَرَاءَ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: لَمَّا تُوُفِّيَ إِبْرَاهِيمُ عَلَيْهِ السَّلَام، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّ لَهُ مُرْضِعًا فِي الْجَنَّةِ). (الحديث ١٣٨٢ - طرفاه في: ٣٢٥٥، ٦١٩٥) [٦٨]:

بەراء (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- مرد. پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (لە بەهەشتا دایەنێکی بۆ دانراوە، شیری دەداتێ، تا لەتەمەنی مەمك خواردنی تێدەپەڕێ). (بڕ: تاج/٥/٢٥٧ /ف/١).

## ئەوەی کە لەبارەی منداڵی ناموسوڵمانەکانەوە لەئاییندا روون کراوەتەوە

٦٦٠- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ أَوْلَادِ الْمُشْرِكِينَ، فَقَالَ: (اللَّهُ إِذْ خَلَقَهُمْ، أَعْلَمُ بِمَا كَانُوا عَامِلِينَ). (الحديث ١٣٨٣- اطرافه في: ١٣٨٤، ٦٥٩٧، ٦٥٩٨، ٦٦٠٠) [٦٩].

ئیبنو عەباس (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەبارەی منداڵی ناموسوڵمان و

---

(٦٨) من أفراد البخاري لم يوافقه مسلم علي تخريجه (العيني/٨/٢١١ ح/١٣٦). -المترجم-

(٦٩) أخرجه مسلم في القدر، باب: معني كلّ مولود يولدُ علي الفطرة، رقم: ٢٦٦٠.

هاوبەش پەیداکەرەکانەوە، لەپێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) پرسیارکرا: ئایا منداڵی ئەمانە کە بەمنداڵی دەمرن، بەهەشتیین یا دۆزەخین ؟ فەرمووی: (خودا خۆی باش دەزانێ ئەو منداڵانە ئەگەر گەورە ببوونایەو تەکلیفیان لەسەر بوایە کاروکردەوەیان چی دەبوو، بەڵام مادەم لەپێش ڕەسیدەبووندا مردوون ئەوە ئەرك و تەکلیيفیان لەسەر نییە، کەواتە لەبەرئەوە بەهەشتیین). (تاج/١٠/٣٥ ف/٣).

٦٦١– عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا صَلَّى صَلَاةً، أَقْبَلَ عَلَيْنَا بِوَجْهِهِ، فَقَالَ: (مَنْ رَأَى مِنْكُمْ اللَّيْلَةَ رُؤْيَا)، قَالَ: فَإِنْ رَأَى أَحَدٌ قَصَّهَا، فَيَقُولُ: (مَا شَاءَ اللَّهُ)، فَسَأَلَنَا يَوْمًا، فَقَالَ: هَلْ رَأَى أَحَدٌ مِنْكُمْ رُؤْيَا، قُلْنَا: لَا، قَالَ: (لَكِنِّي رَأَيْتُ اللَّيْلَةَ رَجُلَيْنِ أَتَيَانِي فَأَخَذَا بِيَدِي فَأَخْرَجَانِي إِلَى الْأَرْضِ الْمُقَدَّسَةِ فَإِذَا رَجُلٌ جَالِسٌ، وَرَجُلٌ قَائِمٌ، بِيَدِهِ كَلُّوبٌ مِنْ حَدِيدٍ)، قَالَ: بَعْضُ أَصْحَابِنَا عَنْ مُوسَى إِنَّهُ يُدْخِلُ ذَلِكَ الْكَلُّوبَ فِي شِدْقِهِ حَتَّى يَبْلُغَ قَفَاهُ، ثُمَّ يَفْعَلُ بِشِدْقِهِ الْآخَرِ مِثْلَ ذَلِكَ، وَيَلْتَئِمُ شِدْقُهُ هَذَا فَيَعُودُ فَيَصْنَعُ مِثْلَهُ، قُلْتُ: مَا هَذَا ؟ قَالَا: انْطَلِقْ، فَانْطَلَقْنَا، حَتَّى أَتَيْنَا عَلَى رَجُلٍ مُضْطَجِعٍ عَلَى قَفَاهُ وَرَجُلٌ قَائِمٌ عَلَى رَأْسِهِ بِفِهْرٍ أَوْ صَخْرَةٍ فَيَشْدَخُ بِهِ رَأْسَهُ فَإِذَا ضَرَبَهُ تَدَهْدَهَ الْحَجَرُ فَانْطَلَقَ إِلَيْهِ لِيَأْخُذَهُ فَلَا يَرْجِعُ إِلَى هَذَا حَتَّى يَلْتَئِمَ رَأْسُهُ وَعَادَ رَأْسُهُ كَمَا هُوَ فَعَادَ إِلَيْهِ فَضَرَبَهُ قُلْتُ مَنْ هَذَا قَالَا انْطَلِقْ فَانْطَلَقْنَا، إِلَى ثَقْبٍ مِثْلِ التَّنُّورِ أَعْلَاهُ ضَيِّقٌ وَأَسْفَلُهُ وَاسِعٌ يَتَوَقَّدُ تَحْتَهُ نَارًا، فَإِذَا اقْتَرَبَ ارْتَفَعُوا، حَتَّى كَادَ أَنْ يَخْرُجُوا، فَإِذَا خَمَدَتْ رَجَعُوا فِيهَا، وَفِيهَا رِجَالٌ وَنِسَاءٌ عُرَاةٌ، فَقُلْتُ: مَنْ هَذَا، قَالَا: انْطَلِقْ، فَانْطَلَقْنَا، حَتَّى أَتَيْنَا عَلَى نَهَرٍ مِنْ دَمٍ، فِيهِ رَجُلٌ قَائِمٌ وَعَلَى وَسَطِ النَّهَرِ – قَالَ يَزِيدُ وَوَهْبُ بْنُ جَرِيرٍ عَنْ جَرِيرِ بْنِ حَازِمٍ – وَعَلَى شَطِّ النَّهَرِ، رَجُلٌ بَيْنَ يَدَيْهِ حِجَارَةٌ، فَأَقْبَلَ الرَّجُلُ الَّذِي فِي النَّهَرِ، فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَخْرُجَ رَمَى الرَّجُلُ بِحَجَرٍ فِي فِيهِ، فَرَدَّهُ حَيْثُ كَانَ، فَجَعَلَ كُلَّمَا جَاءَ لِيَخْرُجَ رَمَى فِي

فِيهِ بِحَجَرٍ، فَيَرْجِعُ كَمَا كَانَ، فَقُلْتُ: مَا هَذَا ؟ قَالَا: انْطَلِقْ، فَانْطَلَقْنَا، حَتَّى انْتَهَيْنَا إِلَى رَوْضَةٍ خَضْرَاءَ، فِيهَا شَجَرَةٌ عَظِيمَةٌ، وَفِي أَصْلِهَا شَيْخٌ وَصِبْيَانٌ، وَإِذَا رَجُلٌ قَرِيبٌ مِنْ الشَّجَرَةِ بَيْنَ يَدَيْهِ نَارٌ يُوقِدُهَا، فَصَعِدَا بِي فِي الشَّجَرَةِ وَأَدْخَلَانِي دَارًا لَمْ أَرَ قَطُّ أَحْسَنَ مِنْهَا، فِيهَا رِجَالٌ شُيُوخٌ وَشَبَابٌ وَنِسَاءٌ وَصِبْيَانٌ، ثُمَّ أَخْرَجَانِي مِنْهَا فَصَعِدَا بِي الشَّجَرَةَ فَأَدْخَلَانِي دَارًا هِيَ أَحْسَنُ وَأَفْضَلُ فِيهَا شُيُوخٌ وَشَبَابٌ قُلْتُ طَوَّفْتُمَانِي اللَّيْلَةَ فَأَخْبِرَانِي عَمَّا رَأَيْتُ قَالَا: نَعَمْ، أَمَّا الَّذِي رَأَيْتَهُ يُشَقُّ شِدْقُهُ، فَكَذَّابٌ، يُحَدِّثُ بِالْكَذْبَةِ فَتُحْمَلُ عَنْهُ حَتَّى تَبْلُغَ الْآفَاقَ فَيُصْنَعُ بِهِ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ، وَالَّذِي رَأَيْتَهُ يُشْدَخُ رَأْسُهُ، فَرَجُلٌ عَلَّمَهُ اللَّهُ الْقُرْآنَ، فَنَامَ عَنْهُ بِاللَّيْلِ، وَلَمْ يَعْمَلْ فِيهِ بِالنَّهَارِ، يُفْعَلُ بِهِ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ، وَالَّذِي رَأَيْتَهُ فِي الثَّقْبِ، فَهُمْ الزُّنَاةُ، وَالَّذِي رَأَيْتَهُ فِي النَّهَرِ، آكِلُوا الرِّبَا، وَالشَّيْخُ فِي أَصْلِ الشَّجَرَةِ، إِبْرَاهِيمُ – عَلَيْهِ السَّلَام – وَالصِّبْيَانُ حَوْلَهُ فَأَوْلَادُ النَّاسِ، وَالَّذِي يُوقِدُ النَّارَ، مَالِكٌ خَازِنُ النَّارِ، وَالدَّارُ الْأُولَى، الَّتِي دَخَلْتَ، دَارُ عَامَّةِ الْمُؤْمِنِينَ، وَأَمَّا هَذِهِ الدَّارُ، فَدَارُ الشُّهَدَاءِ، وَأَنَا جِبْرِيلُ، وَهَذَا مِيكَائِيلُ، فَارْفَعْ رَأْسَكَ، فَرَفَعْتُ رَأْسِي، فَإِذَا فَوْقِي مِثْلُ السَّحَابِ، قَالَا: ذَاكَ مَنْزِلُكَ، قُلْتُ: (دَعَانِي أَدْخُلْ مَنْزِلِي)، قَالَا: (إِنَّهُ بَقِيَ لَكَ عُمُرٌ، لَمْ تَسْتَكْمِلْهُ، فَلَوْ اسْتَكْمَلْتَ، أَتَيْتَ مَنْزِلَكَ).
(الحديث ١٣٨٦)[٧٠]:

سەموورەی کوڕی جوندوب (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: گەلێ جار، پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- کە نوێژی بەیانی بۆ دەکردین، ڕووی تێدەکردین و دەیفەرموو: (کەستان ئەم شەو خەونی نەدیوە؟) ئیتر ئەگەر کەسێ خەونێکی بدیبایە دەیگێڕایەوە بۆی و پێغەمبەریش -درودی خوای لەسەر بێ-

(٧٠) قال العسقلاني: (.. لم يوافقه مسلم علي تخريجه.. ولكن عند مسلم طرف يسيرٌ من أوله: (خاتمة / فتح / ٣٠٦). -المترجم-

ئەوەنـدەی خـودا مـەیلی لەسـەر بوایـە، لێکـی دەدایـەوەو خـەو پـەرژینی دەکـرد، جـا ڕۆژی پرسـی لێمـان و فـەرمووی: (کەسـتان خـەونی دیـوە؟) عەرزمان کرد: نەخەیر، فـەرمووی: (بـەڵام مـن ئـەم شـەو لەخەومـدا، دوو پیاو هاتنە لام و دەستیان گرتم و بردمیان بۆ خاکی پیرۆز، بۆ وڵاتـی شام، لـەوێ، کـە تەماشـام کـرد: وا کـابرایێ دانیـشتووەو پیـاوێکیش قـولاپێکی ئاسنینی بەدەستەوەیەو بەپێوە وەستاوە، خۆش خۆش قولاپەکە دەخاتـە لالغاوەی کابراکـە تـا لەپـشت سـەریەوە دەردەچـێ، ئـەوجا ئـەو لالغاوەکـەی تریشی ئاوا لێ دەکرد، جا هـەتا ئـەم لای والێ دەکـرد، ئەولاکـەی تـری چاك دەبـۆوەو دەنوسایەوە بەیەکـدا، ئـەویش دیـسانەوە وەك جـاری پێـشووی لێ دەکردەوە ! ئیتر هەر بەم دەستوورە، گووتم: ئەمـە چییە؟ دوو فریـشتەکە فـەرموویان: جـارێ بـڕۆ، ڕۆیـشتین تاچـووینە لای کابرایـەکی تـر، لەسـەر گازەرەی پشت ڕاکشابوو، پیاوێکیش خڕکێکی پێبوو یا تـاوێرێکی پـێ بـوو لەسـەر سـەری کابراکـە ڕاوەسـتا بـوو دەیمـاڵی بەتـەپڵی سـەریدا، جـا کـە بەردەکـەی دەکێـشا بەسـەری کابراکـەدا، بەردەکـە هەڵدەبەزییـەوەو خلـۆر دەبۆوە، پیاوەکـەیش دەچـوو دەیهێنایـەوە، تـا دەهاتـەوە سـەری کـابرا وەك خۆی سارێژ دەبـۆوە، جـا ئـەویش دیـسانەوە دەیکێـشایەوە بەسـەریدا، ئـیتر هەروەها ئەمە کاری بوو، گوتم: ئەمە چییە؟.

گوتیان: جارێ بڕۆ !

جـا ڕۆیـشتین هـەتا گەیـشتینە لای شـتێ وەکـوو تەنـدوور وابـوو، لـە سـەرەوە تەسـك و لەبنـەوە پـان و دەڵـپ بـوو، تەماشـام کـرد، پیـاوو ژنـی ڕووتـی زۆری تیادا بوو ئاگر لەژێریدا دەسووتاو بڵێسەی ئاگرەکە نێڵە نێڵی دەهات، جا کە تـاوی دەسـەند ئاوەکـە دەکوڵاو قوڵپـەی دەکـردو چـەپۆکانی دەکـردو زەلامەکانی ناوی وەك دەنکی دانوولەی سەر ئاگر، لەکاتی کوڵانـدا،

بەدەم قوڵتەوە قوڵتەوە بەرز دەبوونەوەو خەریك بوون هەڵبچن ! بەڵام کڵپەی ئاگرەکە گورج کپ دەبۆوە، ئیتر ئەوانیش دەکەوتنەوە بنەکەی ! ئیتر هەروەها ئەمە حاڵیان بوو، گوتم: ئەمە چییە؟ فەرموویان: جارێ برۆ، ڕۆیشتین هەتا گەیشتینە سەر ڕووبارێکی خوێن، کابرایێ لەناویدا بەپێوە ڕاوەستابوو، پیاوێکیش لەسەر لێواری چۆمەکە بوو، بەردێکی زۆری لەبەردەستدا بوو، گشت جارێ کاتێ کابرای ناو چۆمە دەهات کە دەربچێ، کە دەگەیشتە لای ئەو بەردێکی دەکێشا بەناو دەمیداو، تەسی پێ دەکردەوە بۆ شوێنی پێشووی، ئیتر هەموو جارێ تلێکی دەماڵی بە دەم و قەپۆزیاو، کابرا دەگەڕایەوە بۆ شوێنی خۆی، گوتم: ئەی ئەمە چییە؟ فەرموویان جارێ برۆ، جا ڕۆیشتین، تا گەیشتینە لای باخێکی سەوز، درەختێکی گەورەی تیایدا بوو، پیرەمێردێکی نوورانی لەبنیدا دانیشتبوو، کۆمەڵە منداڵی زۆر زۆری لە دەوربوون، پیاوێکی تریش - لەنزیك درەختەکەوە، ئاگرێکی لەبەردەم دابوو، هەر ئاگرەکەی خۆش دەکرد، ئینجا دوو فریشتەکە بەو شێخەڵەدا سەریانخستم و بردمیانە ناو خانوویەکەوە، قەت خانووی واباشم نەدیوە، پڕبوو لەپیاوی پیرو لە لاوو لە ژن و لە منداڵ، ئینجا لەوێ هێنامیانە دەرەوەو دیسان بەشێخەڵەکەدا سەریانخستم و بردمیانە ناو خانوویەکی ترەوە لەوی تر جوانترو باشتر بوو، پڕی بوو لە پیرو لاو.

ئینجا گوتم: ئەم شەو منتان سووڕانەوە، دەپێم بڵێن ئەمەی من دیم چی بوو؟ فەرمویان: بەڵێ باشە، ئەوەی کە دیت: لاڵغاومیان هەڵدەدڕی، ئەوە ئەو درۆزنەیە کە درۆیێ هەڵدەبەستێ و لەدەمی ئەوەوە بەهەر چوارلادا بڵاودەبێتەوە، ئینجا ئەوە هەتا ڕۆژی قیامەت هەروای لێ دەکرێ، ئەوەیش کە بینیت سەریان دەشکاند، ئەوە ئەو جۆرە کەسەیە کە خودا

فێری قورئانی کردووەو لە سایەی خوداوە فێری قورئان بووە، کەچی بە شەو دەخەوێ و دەوری ناکاتەوە، بە ڕۆژیش ڕەفتاری پێ ناکا، تا ڕۆژی قیامەت هەروای لێ دەکرێ و ئەوە حاڵیەتی، ئەوانەیش کە لەناو کونەکەدا دیتن، ئەوانە داوێن پیسەکانن، ئەوەیشی کە لەناو چەمە خوێناوەکەدا دیت، ئەوە سوو خۆر بوو، پیرەمێردەکەی بن درەختەکەیش ئیبراهیم بوو، -دروودی خوای لێ بێ-، منداڵەکانی دەوریشی منالی خەڵکان بوون، کە لەپێش ڕەسیدە بوونیاندا مردوون، ئەو پیاوەیش کە لەنزیکی درەختەکەوە ئاگرەکەی خۆش دەکرد، مالیکی وەردیانی دۆزەخ بوو، خانووی یەکەمیش کەچوویتە ناوی خانەی سەرتاپای موسوڵمانان بوو، ئەم خانووەیش مالی شەهیدانە ! منیش جوبرائیلم و ئەمەیش کەوا لەگەڵمایە میکائیلە، جا سەرهەڵبڕە، کە سەرمم هەڵبڕی لە ژوور سەرمەوە شتێکم دی، وەك پەڵە هەور وابوو، فەرموویان: ئەوەیش هەوارو بارەگای تۆیە، گوتم: دەلێم گەڕێن بابچمە ناو جێگەی دوارۆژی خۆم، فەرموویان: هێشتا تەمەنت ماویەتی، کەی تەمەنت لە جیهاندا تەواو بوو دێیتە ناو مالی خۆت). (تاج/٨/١٠ — ف/١).

## مردنی کوتوپڕی

٦٦٢- عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْها أَنَّ رَجُلًا قَالَ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّ أُمِّي افْتُلِتَتْ نَفْسُهَا، وَأَظُنُّهَا لَوْ تَكَلَّمَتْ تَصَدَّقَتْ، فَهَلْ لَهَا أَجْرٌ إِنْ تَصَدَّقْتُ عَنْهَا ؟) قَالَ: (نَعَمْ). (الحديث ١٣٨٨- طرفه في: ٢٧٦٠) [٧١]:

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: سەعیدی کوڕی عوبیدە (ڕەزای خوای لێ بێ)

(٧١) أخرجه مسلم في الزكاة، باب: وصول ثواب الصّدقة عن الميت إليه، رقم: ١٠٠٤.

عەرزی پێغەمبەری کرد (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! دایکم لە ناکاو مرد، فریانەکەوت کە ڕاسپێری و وەسیەت بکا، تاخێری بۆ بکەین، وەها دەزانم ئەگەر مەودای قسەکردنی ببوایە خێرێکی بڕیار دەدا بۆ خۆی، کە لەپاش مردنی بۆی بکرێ، جا ئایا خێری دەگا ئەگەر من ئێستا لەجیاتی خۆی خێری بۆ بکەم؟ فەرمووی: (بەڵێ خێری دەگا). (تاج/١/ل/٥٩٤ ف/١+ ف/٣ + تاج/١ ل/٩٥ف/١، ٢، ٣ + تاج/٢ ل/٣٧٨ ف/٣ ز/١٨٣).

## باسی گۆڕی پێغەمبەرو ئەبوبەکرو عومەر

٦٦٣- عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْها قَالَتْ: إنْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَيَتَعَذَّرُ فِي مَرَضِهِ: (أَيْنَ أَنا الْيَوْمَ أَيْنَ أَنا غَدًا) اسْتِبْطَاءً لِيَوْمِ عَائِشَةَ، فَلَمَّا كَانَ يَوْمِي قَبَضَهُ اللَّهُ بَيْنَ سَحْرِي وَنَحْرِي، وَدُفِنَ فِي بَيْتِي). (الحديث ١٣٨٩)[٧٢]:

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لە نەخۆشی سەرە مەرگیدا، هەر ڕۆژەی بەسەرە، لەماڵی یەکێ لەژنەکانی دەبوو، ئەڵهای نۆرە ڕۆژی من بوو، دەیفەرموو: ئەمڕۆ من لەکوێم، سبەینێ لەلای کێم لە هاوسەرەکانم، دوو سبەی لەلای کامیانم؟ بۆیە وای دەفەرموو چونکە حەزی لەماڵی من بوو، کە سەرەی ڕۆژی من هات، ئیتر لەلای من گلی خواردەوەو ماڵەو ماڵی نەکرد، بەپێی نۆرە ڕۆژی ژنەکانی، کە لەشەرعی پیرۆزا پێی دەگوترێ: (قەسم) ئیتر لەو ماوەیەدا خۆم خزمەتم

(٧٢) أخرجه مسلم (فضائل أمّ المؤمنين عائشة صَلى اللهُ عَليهِ وَسَلمَ صحيح مسلم شرح النووي/١٥/ص٢٠٧). -المترجم-

دەکرد، هەتا گیانی سپاردو شادبوو بەدیداری پەروەردگاری، ئاوا لە ڕۆژی سەرەی خۆمدا لەباوەشمدا پشتی پیرۆزی دابوو بە سینگ و بەرۆکمەوە کە خودای مەزن گیانی کێشاو ڕۆحی موبارەکی وەرگرت). (تاج/٥/١٥٦ ف/٧ + تاج/٤ ل/٢٩٧ باسی تەمەنی پێغەمبەر و ماوەی پەیامەکەی).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

١- پێغەمبەری خودا ـدروودی خوای لەسەر بێـ زۆر ڕێزو نازی حەزرەتی عائیشەی دەگرت، لەبەر ئەم دوو هۆیە:

یەکەم/ عائیشە ژنێکی ژیرو زرنگ و هۆشیارو هۆشمەندو خانەدان و زاناو دانا بوو، یەکێ بوو لە بلیمەتەکانی مێژوو، زۆر زۆر پێغەمبەری خۆش دەویست و پێغەمبەریش ئەوی زۆر خۆش دەویست.

دووەم/ وەك لەچەند فەرموودەیەکی ساغ و دروستەوە دەردەکەوێ، عائیشە ڕێزوفەزڵی تایبەتی هەبووە لەلای خودا، وە بەسروش پێغەمبەر ـدروودی خوای لەسەر بێـ ئاگادارکراوە: کە عائیشە لەهەردوو جیهاندا ژنی دەبێ، جا لەبەر ئەم دوو هۆیە عائیشە لەلای پێغەمبەر نازدار بوو، بەڵام لەکاتی داستانی بوختیانە گەورەکەدا، کەکرا بۆ عائیشە، حەرزرەتی عائیشە نەخۆش کەوت، ئاگای لەم کەین و بەین و هەڵاتە نەبوو، کەبۆی کرابوو، لەبەرئەوە وەك لەوەوپێش نازی عائیشەی نەدەگرت، تاخودای گەورە پاکانەی بۆ عائیشە کرد، بەناردنی (١٠) دە ئایەتی قورئان، ئیتر پێغەمبەر ـدروودی خوای لەسەر بێـ هیچی لەدڵا نەماو گەڕایەوە سەرحاڵی ئاسایی لەوەو بەری، تەنانەت لە سەرەمەرگیشدا مەبەستی بوو کە شوێنەواری ئەو ڕووداوە ساردوسڕە لەدڵی عائیشەدا بسڕێتەوە، بۆیە لەوماوە ناسکەدا لە ماڵی عائیشە مایەوە تاگیانی پاکی سپارد، وە لەهەمان کاتدا موسوڵمانانیش

تێبگەیەنێ ڕێزی هاوسەری خۆیان بزانن و خاوەنی ڕێزو فەزڵی فەرامۆش نەکەن !

بەندە بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم دوو هەڵوێیستەی پێغەمبەر گوتوومە:

**بولبول ناز دەکا لە گوڵ دەتۆرێ   بۆیە بەنەسری دەسنوێژ دەشۆرێ**

واتە:

حەزرەتی پێغەمبەری خۆشەویست و نازدار درودی خوای لەسەر بێ لەکاتی بوختانە گەورەکەدا کە کرا بۆ عائیشە، کە عائیشە نەخۆشکەوت، لەو نەخۆشینەدا، حەزرەت وەك جاران نازی نەدەگرت، بەلام لەکاتی سەرە مەرگا، بۆ سڕینەوەی ئەو یادگارە ناخۆشە، حەزرەت لە باوەشی عائیشەدا گیانی سپارد، دیارە لەو دەمەدا، عائیشە فرمێسکی زۆری بۆ حەزرەت ڕێژاوە، مەبەست ئەوەیە: چۆن بولبول لەشەودا، کە تاریکی دادێ، خۆی لەگوڵ دەدزێتەوە، بەلام بەیانی زوودەچێ خۆی هەڵدەسوێ لە بۆن و بەرامەو شەونمی گوڵ، وەك داوای چاوپۆشی لێ بکا ئاوا، پێغەمبەریش درودی خوای لەسەر بێ لە بەرەبەیانی ژیانی ناو بەهەشتا دەستنوێژی بە فرمێسکی عائیشە گرتوەو ئەو گەردە کۆنەی لە دڵ سڕیوەتەوە.

٢- وەك چراوگێ بۆ کاریگەری و شوێنەواری ئەو ناکۆکییەی کە لەناو یارانا ڕوویداوە لەناو دڵیانا، ئاماژە دەکەین بۆ ڕاستییەك عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) لە فەرموودەکەی پێش ئەم فەرموودەیەدا، بۆیە ناوی سەعدی کوڕی عوبادە نابا، بەڵکو دەفەرموێ: (پیاوێ لە پێغەمبەری پرسی ... دایکم لە ناکاو مرد.. تاد)، چونکە سەعد لە ڕووداوی ئیفکدا لەسەر عائیشەی نەکردۆتەوە، بەڵکوو لە دژی سەعدی کوڕی موعاز وەستا کە ویستی تۆڵە لە سەرۆکی هەلاتبازەکان بسێنێ، هەروەك لەگەڵ حەزرەتی عەلیشدا

لەبەر هەمان هۆ تا مردن نێوانیان ساز نەبوو !

٦٦٤- عَنْ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ قَالَ: إِنِّي لَا أَعْلَمُ أَحَدًا أَحَقَّ بِهَذَا الْأَمْرِ مِنْ هَؤُلَاءِ النَّفَرِ، الَّذِينَ تُوُفِّيَ رَسُولُ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ عَنْهُمْ رَاضٍ، فَمَنْ اسْتَخْلَفُوا بَعْدِي فَهُوَ الْخَلِيفَةُ، فَاسْمَعُوا لَهُ وَأَطِيعُوا، فَسَمَّى: عُثْمَانَ وَعَلِيًّا، وَطَلْحَةَ وَالزُّبَيْرَ، وَعَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَوْفٍ، وَسَعْدَ بْنَ أَبِي وَقَّاصٍ، رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ. (الحديث ١٣٩٢- اطرافه في:٣٠٥٢، ٣١٦٢، ٣٧٠٠، ٤٨٨٨، ٧٢٠٧) [٧٣]:

عومەری کوڕی خەتاب (رەزای خوای لێ بێ) کاتێ ئەبولوئلوئەی فارسی زاماری کرد، لەپێش شەهیدبوونی دا، وەسێتی بۆ موسوڵمانان کرد، بەشی لە راسپێرییەکەی ئەمە بوو، فەرمووی: (بەپێی ئاگاداری من، کەسی تر وەك ئەم چەند کەسەیە، شایەنی ئەوە نییە کەببێ بەجێنشینی پێغەمبەر لەپاش مردنی من، چونکە ئەم زاتانەی کە من ناویان دێنم، پێغەمبەر درودی خوای لەسەر بێ هەتا وەفاتی کرد هەرلێیان رازی بوو، جا ئەمانە هەرکەسێکیان هەڵبژاردو کردیان بەجێنشین ئیتر گوێڕایەڵی بن و فەرمانبەری بکەن، وەناوی ئەم شەش کەسەی هێنا: عوسمان و عەلی و طەلحەو زوبیرو عەبدولرەحمانی کوڕی عەوف و سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص (رەزای خوای لێ بێ)).

٦٦٥- عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنها قَالَتْ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (لاَ تَسُبُّوا الْأَمْوَاتَ، فَإِنَّهُمْ قَدْ أَفْضَوْا إِلَى مَاقَدَّمُوا). (الحديث ١٣٩٣- الحديث ١٣٩٣- طرفه في: ٦٥١٦) [٧٤]:

(٧٣) لم يخرجه مسلم (انظر: خاتمة / فتح الباري / ٣ ص ٣٠٦) ـ المترجم

(٧٤) لم يخرجه مسلم (فتح الباري / ٣ ـ خاتمة ـ ص ٣٠٦). -المترجم-

عائیشه (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (جنێو بە مردووان مەدەن، چونکە ئەوان رووبەڕوو بوونەتەوە لەگەڵ کردەوەی لەوەپێشی خۆیان، کە لەجیهانا کردوویانە، چ چاك، چ خراپ، وە بەپێی ئەو کردەوە پێشینەیان پاداشی خۆیان وەردەگرن). (تاج/١/٥٥٠-٢).

بسم الله الرحمن الرحيم

مامۆستای عەسقەلانی (رەحمەتی خودای لێ بێ) لە پایانی (نامەی تەرمدا)، بۆمان ڕوون دەکاتەوە: کە نامەی تەرم دوو سەدو دە فەرموودەی بەرزەوەکراوی واتیا، پەنجاو شەشیان بێڕشتەو موتابەعاتن، ئەوانی تریان پەیوەستی تەواون، واتە: مەوصوولن، سەدو نۆ فەرموودەیان دووبارەن، سا یا لەم نامەیە خۆی دا، یا لە بابەتەکانی پێشیدا، سەدو یەکیان پاڵفتەی ئەم نامەیەن و دووبارەنین، پێشەوا موسلیمیش هەموو فەرموودە پاڵفتەکانی گێڕاوەتەوە، بێجگە لەم بیست و چوارەیان:

١. فەرموودەکەی عائیشە: (أَقْبَلَ أَبُوبَكْرٍ عَلَى فَرَسِهِ) رقم ١٢٤١، ١٢٤٢ فتح. لە تەجریدەکەدا نییە.
٢. فەرموودەکەی ئوم عەلا سەبارەت بەداستانی مەرگی عوسمانی کوڕی مەظمون، ژمارە: ١٢٤٣ ف، ٦٠١ ت.
٣. ئەنەس (أَخَذَ الرَّايَةَ زَيْدٌ فَأُصِيبَ) ژ/١٢٤٦ ف/٦٠٤ ت.
٤. فەرموودەکەی ئەنەس (مَا مِنَ النَّاسِ مِنْ مُسْلِمٍ يَتَوَفَّى لَهُ ثَلاثَةٌ) ژ/١٢٤٨/ ف/٦٠٥ ت.
٥. فەرموودەکەی عەبدولرەحمانی کوڕی عەوف (قُتِلَ مُصْعَبُ بْنُ عُمَيْر) ژ/١٢٧٥ ف، لە تەجریدەکەدا نەهاتووە.

٦. فەرمووده‌كەی سەهلی كوڕی سەعد: (إِنَّ امْرَأَةً جَاءَتْ بِبُرْدَةٍ مَنْسُوجَةٍ) ژ/١٢٧٧ ف/٦١٢ ت.

٧. فەرمووده‌كەی ئەنەس: (شَهِدْنَا بِنْتًا لِلنَّبِي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ژ/ ١٢٨٥ ف/٦١٧ ت.

٨. فەرمووده‌كەی ئەبو سەعيد: (إذا وُضِعَتِ الجَنَازَةُ وَاحْتَمَلَهَا الرِّجَال) ژ/١٣١٤ ف/٦٣٢ ت.

٩. فەرمووده‌كەی ئيبنو عەبباس -سەبارەت بەخوێندنی سوورەتی فاتيحا لەنوێژی مردوودا. ژ/١٣٣٥ ف/٦٣٧ ت.

١٠. فەرمووده‌كەی جابير: (زَمِّلُوهُم بِدِمَائِهِم..) ژ/١٣٤٣ ف، لەتەجريدەكەدا لەم جێگەيەدا نييە.

١١. فەرمووده‌كەی صەفيەی كچی شەيبە، سەبارەت بە تەحريمی مەككە ژ/١٣٤٩ ف، لە تەجريدەكەدا لەم جێگەيەدا نييە.

١٢. فەرمووده‌كەی جابير. داستانی شەهيد بوونی باوكی و ناشتنی. ژ/١٣٥١ ف. لە تەجريدەكەدا لەم جێگەيەدا نييە.

١٣. فەرمووده‌كەی ئەنەس: چيرۆكی كوڕە جوولەكەكە. ژ/١٣٥٦ ف/٦٤٣ ت.

١٤. فەرمووده‌كەی ئيبنوعەبباس: (كُنْتُ أَنَا وَأُمِّي مِنَ الْمُسْتَضْعَفِين) ژ/١٥٥٧، لە تەجريدەكەدا نييە.

١٥. فەرمووده‌كەی ئەبو هورەيرە: (سەبارەت بەتاوانی ئەو كەسە كە بەشتێ خۆی بخنكێنێ) ژ/١٣٦٥، ٦٤٩ ت (بڕوانە تەخريجی ژمارە/٦٤٩ + فتح الباری، بەرگی/٣ لاپەڕە/٢٦٨).

١٦. فەرمووده‌كەی عومەر: (أَيُّمَا مُسْلِمٍ شَهِدَ لَهُ أَرْبَعَةٌ بِخَيْرٍ) ژ/١٣٦٨ ف/٦٥١ ت.

١٧. فەرمووده‌كەی ئەبو هورەيرە، لە بارەی پەناگرتن بەخودا لە ئاگری

دۆزەخ و سزای گۆڕ. ژ/١٣٧٧ ف/٦٥٧ ت.

١٨. فەرمووده‌کەی بەراو. کاتێ ئیبراهیم مرد ژ/١٣٨٢ ف/٦٥٩ ت.

١٩. فەرموودەکەی سەموورە. خەونە درێژەکەی پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- ژ/١٣٦٨ ف/٦٦١ ت (بڕوانە ژمارە: ٦٦١).

٢٠. فەرموودەکەی عائیشە: (تُوُفِّي رَسُوْلُ الله صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ الاثْنَين). ژ/١٣٨٧ لە تەجریدەکەدا نییە.

٢١. عائیشە رادەسپێرێ کەلەگەڵ ئەوانا نەنێژرێ. ژ/١٣٩١ ف، لە تەجریدەکەدا نییە.

٢٢. فەرموودەکەی عومەر. راسپێرییەکەی عومەر. ژ/١٣٩٢ ف/٦٦٤ ت.

٢٣. فەرموودەکەی عائیشە: (لا تَسُبُّوا الامْوَات..). ژ/١٣٩٣ ف/٦٦٥ ت.

٢٤. فەرموودەکەی ئیبنوعەبباس. سەبارەت بەگوتەکەی ئەبولەهەب ژ/١٣٩٤ لە تەجریدەکەدا نییە.

هەروا عەسقەلانی -رەحمەتی خودای لێ بێ- فەرمووی: لەم نامەیەدا چل و هەشت بیستراو (أثر) ی واتیادا، کە هەیانە دەچێتەوە سەر هاوڕێیانی پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ-، هەشیانە دەچێتەوە سەر زانایانی دوا ئەوان، شەشیان پەیوەست (موصول)ن، ئەوانی تریان بێ رشتەن (واتە: معلق)ن.

شێخی عەسقەلانی -رەحمەتی خودای لێ بێ- لە پایانی (باسەکانی کارکردن لەناو نوێژدا) دەفەرموێ:

لەم باسەدا سیی‌و دوو فەرموودەی بەرزەوە بووی واتیا، شەشیان بێ ڕشتەن، واتە: موعەللەقن، ئەوانی تریان هەموو پەیوەستن، واتە: موصولن، بیست و شەشیان دووبارەن، ئەوانی تریان کە شەشن پاڵفتەی باسەکەن، پێشەوا موسلیم -رەحمەتی خودای لێ بێ- گشتیانی گێڕاوەتەوە ئەمەیان نەبێ:





١. فەرمووده‌كـه‌ی ئـه‌بو بـه‌رزه سـه‌بارەت بەچـيرۆكی بەلەسـه بـوونی ولأخەكەی ژ/١٢١١ ف.

٢. تەعلیقەكەی عبدالله ی كوڕی عەمر سەبارەت بە فووكردنی پێغەمبەر لەناو كڕنووشی ناو نوێـژی خـۆر گیرانـدا، وا لـەپێش ژمـارە/١٢١٣ وه، خۆی ژمارەی بۆ دانەنراوە.

٣. فەرمووده‌كـه‌ی ئـه‌بو هـورەیرە لـه بابـه‌ت خوێنـدنی سـوورەت لـه‌ناو نوێژی شێواندا.

٤. هەروا شێخی عەسقەلان دەفەرموێ: ئەم باسە شەش بیسراویشی واتیا.

بیستراو ـ واتە: أثـر = ئەسەر.

هـەروا مامۆسـتای عەسـقەلانی ڕەحمەتی خودای لێ بێ لـەكۆتایی (باسـەكانی هەڵەی ناو نوێژدا) دەفەرموێ:

لـەم باسـەدا نـۆزده فـەرموودەی بـەرزەوەكراوی واتیـا، دووانیـان لـەم نۆزدەیە بێ ڕشتە (معلق)ن بۆیـە بـە نـۆزدە فـەرموودە دادەنـرێن، چونكە فەرموودەكـەی كورەیـب (ژمـارە/٥٩٧ ت/١٢٣٣ ف) بـە چـوار فـەرموودە دادەنرێ، ئاوا:

١- كورەیب له عەبدولرەحمانی كوڕی ئەزهەرەوە.

٢- كورەیب له ئیبنو عەبباسەوە.

٣- كورەیب له عەبدولڕەحمانی كوڕی ئەزهەرەوە.

٤- كورەیب له میسورەی كوڕی مەخرەمەوە.

موسلیم -ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێ بێ- گشتیانی گێڕاوەتەوە.

بسم الله الرحمن الرحيم

# ٣٠- نامەی زەکات (كتاب الزكاة)

## باسی پێویستی زەکات

٦٦٦- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: بَعَثَ مُعَاذًا رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ إِلَى الْيَمَنِ، فَقَالَ: (ادْعُهُمْ إِلَى شَهَادَةِ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لِذَلِكَ، فَأَعْلِمْهُمْ أَنَّ اللَّهَ قَدْ افْتَرَضَ عَلَيْهِمْ خَمْسَ صَلَوَاتٍ فِي كُلِّ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لِذَلِكَ فَأَعْلِمْهُمْ أَنَّ اللَّهَ افْتَرَضَ عَلَيْهِمْ صَدَقَةً فِي أَمْوَالِهِمْ تُؤْخَذُ مِنْ أَغْنِيَائِهِمْ وَتُرَدُّ عَلَى فُقَرَائِهِمْ). (الحديث ١٣٩٥ – اطرافه في: ١٤٥٨، ١٤٩٦، ٢٤٤٨، ٤٣٤٧، ٧٣٧١، ٧٣٧٢)[٧٥].

ئیبنو عەباس (رەزای خوای لێ بێ) فەرموی: کاتێ پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- موعازی کوڕی جەبەلی نارد بۆ یەمەن و کردی بە سەرکارو مامۆستایان، لەسەر ئەم شێوەیە فەرمانی پێکردو پێی فەرموو: (ئەوا تۆ دەچیت بۆناو گەلێك، کە ئەهلی کیتاب و خاوەنی نامەن، کاتێ دەچیتە ناویان لەپێشدا داوایان لێ بکە شایەتی بدەن: کە هەر خودا خودایەو خودای تر نییەو موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلا پێغەمبەری خودایە، ئەوجا ئەگەر بۆ ئەمە بە گوێیان کردی ئەوا پێشیان بڵێ: کە خودا -لە هەموو شەوو ڕۆژێکدا- پێنج نوێژی لەسەریان داناوە جا ئەگەر بۆ ئەمەیش بەگوێیان کردی، ئەوا پێشیان بڵێ: کە خودا زەکاتی لەسەریان داناوە، کە لە دەوڵەمەندەکانیان وەردەگیرێ و دەدرێتەوە بە هەژارەکانیان، جا ئەگەر بۆ ئەمەیش بە گوێیان کردی، ئەوا نەکەیت بچیت، نایابی سامان و ماڵەکانیان هەڵبژێری

(٧٥) أخرجه مسلم (صحيح مسلم بشرح النووي ج/ ١ ص١٩٥). -المترجم-

و لەباتی زەکات وەری بگری. وە خۆشت لە نالەو نزای ستەمبار بپارێزە، چونکە ئاهو نزولەی ستەمبار تیرێکی کوشندەیەو لەگەڵ لە کەوان دەرچوو برستی ستەمکار دەبڕێ و هیچ شتێ بەری ناگرێ تاخۆی دەگەیەنێتە بارەگای پەروەردگار !). (بڕ: ریاض الصالحین بەکوردی بەرگی یەکەم چاپی دووەم لاپەڕە/١٩٥ ف/٢٠٨/٦ ز/٢٦).

٦٦٧- عَنْ أَبِي أَيُّوبَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَجُلًا قَالَ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَخْبِرْنِي بِعَمَلٍ يُدْخِلُنِي الْجَنَّةَ، قَالَ: مَا لَهُ مَا لَهُ، وَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَرَبٌ مَا لَهُ تَعْبُدُ اللَّهَ وَلَا تُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا، وَتُقِيمُ الصَّلَاةَ، وَتُؤْتِي الزَّكَاةَ، وَتَصِلُ الرَّحِمَ). (الحديث ١٣٩٦- طرفاه في: ٥٩٨٢، ٥٩٨٣) [٧٦]:

ئەبو ئەیوبی ئەنصاری (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- و سەروماڵ و مناڵ و دایك و باوك و هەست و نەست گشتی بەقوربانی گەردی بەرپێی دینی کەرانی گۆڕی پیرۆزی بێ - بەسواری وشترێ بوو، پیاوێ هات جڵەوی ولاخەکەی گرت و رایوەستان و عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! کارێکم پێ بفەرموو ئەگەر ئەنجامی بدەم بمباتە بەهەشت، بازێ لەیارانیش -رەزای خوایان لێ بێ- فەرموویان: چی چی ! پێغەمبەریش -درودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (خودا بپەرستەو هیچ هاوبەشی بۆ دامەنێ و نوێژ بکەو زەکات بدەو پەیوەندی بەخزم و خوێشەوە بکەو بۆیان باش بەو بەپێی حاڵ پێیان لێ مەبڕەو یارمەتیان بدە، ئینجا پێی فەرموو: دە ئینجا بەری ولاخەکە بەردە بابڕوا لەرێگەی خۆیەوە). (تاج/١٣/٩ ف/١ ز/٤).

٦٦٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ أَعْرَابِيًّا أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ

(٧٦) اخرجه مسلم في الإيمان، باب الإيمان الذي يدخل به الجنة، رقم: ١٣.

وَسَلَّمَ فَقَالَ: (دُلَّنِي عَلَى عَمَلٍ إِذَا عَمِلْتُهُ دَخَلْتُ الْجَنَّةَ، قَالَ: تَعْبُدُ اللَّهَ لَا تُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا، وَتُقِيمُ الصَّلَاةَ الْمَكْتُوبَةَ، وَتُؤَدِّي الزَّكَاةَ الْمَفْرُوضَةَ، وَتَصُومُ رَمَضَانَ، قَالَ وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَا أَزِيدُ عَلَى هَذَا، فَلَمَّا وَلَّى، قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَنْ سَرَّهُ أَنْ يَنْظُرَ إِلَى رَجُلٍ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ فَلْيَنْظُرْ إِلَى هَذَا). (الحديث ١٣٩٧)[٧٧]:

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پیاوێ هاتە خزمەتی پێغەمبەر** دروودی خوای لەسەر بێ: **گوتی: قوربان ! کارێکم پێ نیشان بدە، ئەگەر بیکەم ببم بەبەهەشتی ؟ فەرمووی: (بەس خودا بپەرستەو بەندەیی و پەرستشی بۆ بکەو، هیچ هاوبەشی بۆ بڕیار مەدەو، نوێژە فەرزەکان بکەو، زەکاتی فەرزی سەرت بدەو، ڕۆژوی مانگی ڕەمەزان بگرە). پیاوەکەیش گوتی: بەو کەسە کە گیانی منی بەدەستە، لەمانە زیاتر ناکەم، جا کە ڕۆیشت پێغەمبەر** دروودی خوای لەسەر بێ **فەرمووی: (هەرکەسێ حەزدەکا کە لەم جیهانەدا بەچاوی خۆی پیاوێکی بەهەشتی ببینێ باتەماشای ئەم پیاوە بکا).**
**(تاج/٢ ل- ٥ف -٢ ش/ن)**

٦٦٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: لَمَّا تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَكَانَ أَبُو بَكْرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ وَكَفَرَ مَنْ كَفَرَ مِنْ الْعَرَبِ، فَقَالَ عُمَرُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: (كَيْفَ تُقَاتِلُ النَّاسَ وَقَدْ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، فَمَنْ قَالَهَا فَقَدْ عَصَمَ مِنِّي، مَالَهُ، وَنَفْسَهُ، إِلَّا بِحَقِّهِ وَحِسَابُهُ عَلَى اللَّهِ)، (الحديث ١٣٩٩- اطرافه في: ١٤٥٧، ٦٩٢٤، ٧٢٨٢) فَقَالَ: (وَاللَّهِ لَأُقَاتِلَنَّ مَنْ فَرَّقَ بَيْنَ الصَّلَاةِ، وَالزَّكَاةِ، فَإِنَّ الزَّكَاةَ حَقُّ الْمَالِ، وَاللَّهِ لَوْ مَنَعُونِي عَنَاقًا كَانُوا يُؤَدُّونَهَا إِلَى

---

(٧٧) أخرجه مسلم في الإيمان، باب الإيمان الذي يدخل به الجنة، رقم: ١٤.

رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَقَاتَلْتُهُمْ عَلَى مَنْعِهَا، قَالَ عُمَرُ رَضِيَ اللَّـهُ عَنْـهُ فَوَاللَّهِ مَا هُوَ إِلَّا أَنْ قَدْ شَرَحَ اللَّهُ صَدْرَ أَبِي بَكْـرٍ رَضِـيَ اللَّـهُ عَنْـهُ فَعَرَفْـتُ أَنَّـهُ الْحَقُّ). (الحديث ١٤٠٠- اطرافه في:١٤٥٦، ٦٩٢٥، ٧٢٨٥) [78]:

ئـەبو هـوريره (رەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی: کـاتێ پێغەمبـەر -دروودی خوای لەسەر بێ- کۆچی دوایـی کـرد، وە لـەپاش ئـەو ئەبوبـەکر کـرا بەجێنـشین (واتـە: بـە خەلیفـە) وەئـەو عەرەبانـەی کـە لـە ئـایین هەڵگەڕانـەوە پەیـدابوون، وە ئەبوبەکر ویستی بچێ بەگژیانا، بەم بۆنەیەوە عومەری کوڕی خـەتاب (رەزای خوای لێ بێ) پێـی فـەرموو: تـۆ چـۆن جـەنگ دەکـەی لەگـەڵ ئـەم خەڵکـەداو، بەڵگەت چییە لەم بارەیەوە؟ ئەی چی دەکەی لەوە کە پێغەمبـەر -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: فەرمانم پێکراوە کە شەڕ لەگەڵ ئەو خەڵکەدا بکەم، تـا شایەتمان دێنن و بەزمان دەڵێن: (لا اله الا الله: هـەرخودا خودایـەو بـەس) ئیتر ئەو کەسەی کە ئەمە بڵێ، ئەوا سەروماڵی خۆی لەمن قەدەغە دەکاو، خـوێن و نـامووس و سـەرو سـامانی لـە مـن حـەرام دەبـێ، مەگـەر لەسـەر مـافێکی ڕەوا، کـە لەسـەری بـێ بـە پێـی شـەرعی خـوا، وەئـیتر حیـساب و لێپرسینەوەی لەسەر نیازی دڵی، لەو دنیادا لەسەر خودایە؟ جا بـۆم ڕوون بکەرەوە: ئایا ئەم هەڵوێستەی تـۆ لەگـەڵ ئـەم فەرموودەیـەی پێغەمبـەردا چۆن یەك دەگرنەوە؟

ئەبوبەکریش -بۆ وەڵامی ئەم ڕەخنەیەی عومـەر- فـەرمووی: (ئەمـەی تۆ دەیڵێی ڕاستە، بەڵام مەسەلەکە گەلێ لەم ڕواڵەتکارییە قووڵترە، بـەخودا زۆرباش دەچم بەگژ ئەوانـەدا کـە فـەرقی نوێـژو زەکـات دەکـەن و دەڵێن: نـوێژ فەرزەو دەیکەین و، زەکات فەرز نییەو نایدەین، چونکە زەکـات مـافی

(٧٨) اخرجه مسلم في الإيمان، باب الأمر بقتال الناس حتي يقولوا: لاإله إلا الله، رقم:٢٠.

ماڵە، مافێکە خوا لە سامانا پێویستی کردووە، ئەوەی ئینکاری بکا، ئیکاری لە ئەصڵێ لە ئوصولی ئایین دەکا، جا لەبەرئەوە دەچم بەگژیدا، سوێندم بەخودا ئەگەر لەم لایەنەوە فەرقی من و پێغەمبەر بکەن لێیان قەبووڵ ناکەم، کەواتە ئەگەر لەمەوبەر گێسکە زەکاتێکیان دابێ بەپێغەمبەرو ئێستا بە بڕوبیانووی بێ سەروبەر، نەیدەن بە من، کە جێنشینی پێغەمبەرم و فەرمانڕەوای گشتی موسوڵمانانم، لەسەر نەدانی ئەو گیسکەیە دەچم بە گژیانا. عومەر دەیفەرموو: بەخودا دیاربوو کە کردنی ئەو جەنگە شتێ بوو لە خوداوەو خۆی نابوویە ناو دڵی ئەبوبەکرەوە، وە منیش بۆم دەرکەوت کە فەرمایشتەکەی ئەبوبەکر ڕاست بوو) (تاج/٢/١٢ ف/٤ - ش/د/ت/ن).

## تاوانی زەکات نەدەر

٦٧٠- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ يَقُولُ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (تَأْتِي الْإِبِلُ عَلَى صَاحِبِهَا، عَلَى خَيْرِ مَاكَانَتْ، إِذَا هُوَ لَمْ يُعْطِ فِيهَا حَقَّهَا، تَطَؤُهُ بِأَخْفَافِهَا، وَتَأْتِي الْغَنَمُ عَلَى صَاحِبِهَا عَلَى خَيْرِ مَاكَانَتْ، إِذَا لَمْ يُعْطِ فِيهَا حَقَّهَا، تَطَؤُهُ بِأَظْلَافِهَا، وَتَنْطَحُهُ بِقُرُونِهَا، وَقَالَ وَمِنْ حَقِّهَا أَنْ تُحْلَبَ عَلَى الْمَاءِ).

قَالَ: (وَلَا يَأْتِي أَحَدُكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِشَاةٍ يَحْمِلُهَا عَلَى رَقَبَتِهِ لَهَا يُعَارٌ، فَيَقُولُ يَا مُحَمَّدُ، فَأَقُولُ: (لَا أَمْلِكُ لَكَ شَيْئًا، قَدْ بَلَّغْتُ، وَلَا يَأْتِي بِبَعِيرٍ يَحْمِلُهُ عَلَى رَقَبَتِهِ، لَهُ رُغَاءٌ، فَيَقُولُ: يَا مُحَمَّدُ، فَأَقُولُ: (لَا أَمْلِكُ لَكَ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا قَدْ بَلَّغْتُ). (الحديث ١٤٠٢- اطرافه في: ٢٣٧٨، ٣٠٧٣، ٦٩٥٨) [٧٩].

ئەم فەرموودەیە دوو فەرموودەیە، یەکەمیان لەبەرگی سێی ریاض

(٧٩) أخرجه مسلم في الزكاة، باب: إثمُ مَانِعِ الزَّكَاةِ، رقم: ٩٨٧.

الصالحيندا، زنجيره/٢١٦ ل-٩٠٠ف-٩. تەرجەمە كوردييەكەى ئاوايە:

ئـەبو هـوريره (رەزای خـوای لێ بـێ) فـەرمووى: پێغەمبـەردرود دەفـەرموێ: (ئەوكەسەى خاوەنى زێڕوزيو بـێ و زەكاتى لێ دەرنـەكا، لـەرۆژى قيامـەتا، ئەو زێڕ و زيـوە سـوور دەكرێتـەوە، لـەناو ئـاگرى دۆزەخـا، تـادەبێ بەيـەك پارچـە ئـاگرى سـوور، ئـەوجا تەنيـشتى و ناوچـەوانى و پـشتى و هـەموو لەشى ترى پێى داخ دەكرێ، هەموو جارێ كـە سارد دەبێتـەوە، سـەرلەنوێ سوور سوورى دەكەنـەوە بـۆى و ديـسان واى لێ دەكەنـەوە، ئـيتر لـەو ڕۆژەدا كە پەنجا هـەزار سالْ درێـژە، ئـەو كابرايـە ئەمـە حالْيـەتى، هـەتا دادگايى بەندەكان لەناو خۆيانا لە دادگاى خودادا تەواو دەبێ، ئەوجا ڕێگەى خۆى نيشان دەدرێ، سا يا بۆ بەهەشت، يا بۆ دۆزەخ.

گوتـرا: ئەى پێغەمبەرى خودا ! ئەى وشتر؟

فەرمووى: (وە ئەوەى خاوەنى وشتر بێ و، مافى مافدارانى لێ نەدا، كـە يەكێ لەو مافانەى كـە لـە وشـتردا هـەن ئەوەيـە: ئـەو ڕۆژەى كـە وشـترەكە دەبـرێ بـۆ سـەر ئـاوو ئـاودەدرێ و دە دۆشـرێ، لـەو شيرەى ئـەو ڕۆژەيـشدا مافى هەژارانى واتيادا، وەك خەرمانلۆغەى خـەرمان، ئـەو خـاوەن وشـترەى كە مافى مافدارانى لێ نەدا، لە ڕۆژى قيامەتدا، لـە دەشـتێكى كركـاى كركـا، لەسـەر دەم رايدەخـەن بـۆ ئـەو وشـترانە، وەتـا بلْێيـت زل زل و فيلەتـەن و قەبەن و يەك پارێنەشيان كـەم نييـە، ئـيتر ئـەوانيش بـەپا دەيشێلن و بـە دەم دەيگەزن و قەپى لێ دەگرن، گشت جـارێ كـە دوايىيەكـەيان بەسـەريدا تـێ دەپـەڕێ، ديـسانەوە بەرايەكـەيان دەگێڕنـەوە بـۆ سـەرى ئـيتر ئەمـە حالْيـەتى لـەو ڕۆژەدا، كـە پەنجاهـەزار سـالْ درێـژە هـەتا مەحكەمـەو دادپرسيى ناو بەندەكان تەواو دەبێ، ئەوجار ڕێگەى خۆى پيشان دەدرێ، سايا بۆ بەهەشت يا بۆ دۆزەخ.

گوترا: ئەی پێغەمبەری خودا ! ئەی ڕەشەوڵاخ و مەڕو بزن ؟

فەرمووی: (وە ئەوەی خاوەنی ڕەشەوڵاخ و مەڕوبزن بێـو، مافی هەژارانیان لێ نەداو زەکاتی شەرعیان لێ دەرنەکا، لە ڕۆژی ژینەوەدا، لە قیامەتدا، لەدەشتێکی کرکای کرکا، لەسەردەم بۆیان ڕادەخرێ، ئەو ئاژەڵە لەو کاتەدا، نە تاقە یەکێکیان کەمە، نە شاخبار دراوێکیان واتیادا، نە کۆڵێ، نە شاخ شکاوێ، بەڵکوو هەموو زرت و زیت و بزو ئامادەن بۆ شەڕە شۆق و قۆچ وەشاندن، ئیتر بە شاخ دەیدەنە بەر شۆق و بە سم گێرەی دەکەن، گشت جارێ کە دواییەکەیان بەسەریدا تێ دەپەڕێ، دیسانەوە بەراییەکەیان دەگێڕنەوە بۆ سەری، ئیتر ئەمە حاڵیەتی لەو ڕۆژەدا کە پەنجا هەزارساڵ درێژە، هەتا مەحکەمەی ناوەندە بەندەکان تەواو دەبێ، ئەوجا ڕێگەی خۆی پێ نیشان دەدرێ: جا یا بۆ دۆزەخ، یا بۆ بەهەشت.

گوترا: ئەی پێغەمبەری خودا ! ئەوا بڕیار (حوکم) ی زێڕو زیوو وشترو ڕەشە وڵاخ و بزن و مەڕمان زانی ئەی بڕیاری وڵاخی بەرزە چییەو چۆنە؟

فەرمووی: (وڵاخی بەرزە سێ جۆرە: بۆ هەندێ پیاو مایەی پاداش و خێرە، مایەی تاوان و شەڕە بۆ ئەو پیاوەی کە ڕایدەگرێ بۆ ریاو چاوەو خۆنواندن و شانازی کردن و هەروا بۆ دوژمنایەتی و دژایەتی گەلی ئیسلام و لە دژی موسوڵمانان!

پەردەو تارەیەکی داپۆشەریشە بۆ ئەو پیاوەی کە لەرێگەی خودادا رایدەگرێ و بۆ ڕووسووری هەردوو جیهان، کارو کەسابەتی پێوە دەکاو، ئەو مافەی کە خودا لەسەر ئەو وڵاخەی داناوە، کە بریتیە لە خەباتگێڕان لەسەر پشتی فەرامۆش نەکا، لەکاتی خۆیدا ئاوو ئالیکی دەدا، وچانی دەدا، نایڕەتێنێ، مایەی پاداشی باش و خێری گەورەیشە بۆ ئەو پیاوەی کە

ڕایدەگرێ بۆ غەزا کردن و تێکۆشان لەبەر ڕەزای خودا، بۆ بەرژەوەندیی گەلی ئیسلام، لە مێرگێکدا، یا لە مێرغوزارێکا دەیبەستێتەو، ئیتر ئەو وڵاخە هەرچی بخوات لەو مێرگ و میرغوزارەو، چەندە لەو لەوەڕە بلەوەڕێ، بە ژمارەی ئەوە چاکەو خێرو خێرات بۆ خاوەنەکەی دەنووسرێ، تەنانەت ئەگەر مەڕ بەندەکەی بپسێنێ، یان پەت و گوریسەکەی بپچڕێنێ، وە سەرێ دووسەر غار بکاو، بای باڵی خۆی بداو، یاری بکاو، تەنانەت ئەگەر بەبێ سوارەکەیشی تەراتێن بکا، هەتا لەکاتی وایشدا، خودا بە ژمارەی شوێن سم و بە ژمارەی تەرس و میزەکەی چاکەو خێری بۆ دەنووسرێ.

گریمان خاوەنەکەی بەسەر ئاوێکا بردی، نیازی ئەوەیشی نەبێ کە ئاوی بدا، بەڵام وڵاخەکە لە خۆیەوە دەمی نایە ئاوەکەوەو لێی خواردەوە، ئەوە بە قەد ژمارەی ئەو ئاوەی کە دەیخواتەوە چاکەی بۆ دەنوسرێ!.

گوترا: قوربان ! ئەی گوێدرێژ ؟

فەرمووی: (لەبارەی گوێدرێژەوە هیچ سرووشێکم بەتایبەتی بۆ نەهاتووە، تەنیا ئەم ئایەتە دانسقەو کەم هاوتایە نەبێ، کە تێکڕا گشت جۆرە خەیرێ، کەم و زۆر دەگرێتەوە، کە دەفەرمووێ: ﴿فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ، وَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ. (٧-٨)- زلزلة - ٩٩/٨﴾ واتە: هەر کەسێ بەقەی سەنگی تۆسقاڵێ چاکەی کردبێ پاداشتەکەی وەردەگرێ، هەروا هەرکەسێ بەقەی سەنگی تۆسقاڵێ خراپەی کردبێ، پاداشتەکەی وەردەگرێ..)، (ریاض الصالحین، کوردی/٣/٩٠٠ ف/٩ ش).

فەرموودەی دووەمیان لە بەرگی سێی تاجول ئوصول دا، وەرگەڕاوە کوردییەکەی، لە لاپەڕە/٢٩٦ ز/١٠٩ ف/٢ - دا ئاوایە:

ئــەبو هــورەیرە (ڕەزای خــوای لێ بــێ) فــەرمووی: پێغەمبــەر (دروودی خــوای لەســەر بــێ) هەڵسایەوە، وتارێکی فەرموو بۆمان، باسی ناخونـەك و دەستپیـسی لـەماڵی تالآنی کرد، وە ئەوەی بە تاوانێکی گەڵێ گەورە دانا، وە فەرمووی: (نامەوێ لە ڕۆژی قیامەتدا بەیەکێکتان بگەم سەپێ ماینێ، بەلووشکە لووشك، بـە قەلآندۆشکانیەوە بێ، کە لـە جیهانـا بەناهـەق بەدەسـتی هێنـابی، بێـت بـۆ لام و بڵـێ: ئـەی پێغەمبـەری خـودا دەخیلـتم لـێم قـەوماوە، بەدەسـتی ئەسپەوە پەرێشانم، هـەم شـەکەت و مانـدووم و هـەم ئابڕووم چووە، دەی فریامکـەوە، منـیش پێـی دەڵـێم کـە مـن دەسـەلآتی هیـچم نییـە بـۆت کـە بیکەم، من لە کاتی خۆیدا پێتم ڕاگەیاندوویت، نامەوێ لە ڕۆژی قیامەتـدا بگەم بەیەکێتان مەڕێ، یا بزنێ، بە بارەبارڕو قارە قارڕو باعـە بـاع، بەسـەر نەڕەی شانیەوە بێ، بێ و بڵێ: ئەی پێغەمبـەری خـودا! فریامکـەوە منـیش پێی دەڵێم: من دەسەلآتی هیچم نییە کـە بـۆتی بکـەم، مـن لـەکاتی خۆیـدا پێم ڕاگەیاندووی !

نامــەوێ لــە ڕۆژی قیامەتــدا بەیــەکێکتان کەســێ (بــە هاتووهــاوار قیــژە قیژ) بـە قەلآندۆشـکانیەوە بـێ، بێـت بـۆ لام و بڵـێ: ئـەی پێغەمبـەری خـودا ! فریامکەوە، منیش پێی دەڵێم، من دەسەلآتی هیـچم نییـە کـە بیکـەم بـۆت،من لــەکاتی خۆیــدا پێــتم ڕاگەیانــدووە، نامــەوێ لــەڕۆژی قیامــەتا بگــەم بــە یـەکێکتان نکـالآو جـل و بـەرگ (بەخشخشی) بـە قەلآندۆشکانیەوە بێـت، بـێ بـۆ لام و بڵـێ: ئـەی پێغەمبـەری خـودا ! فریامکـەوە، منـیش پێـی دەڵـێم: مـن دەســەلآتی هیــچم نییــە کــە بیکــەم بــۆ تــۆ، مــن لــە کــاتی خۆیــدا پێــتم ڕاگەیاندووە، نامەوێ لە ڕۆژی قیامەتدا بگـەم بەیـەکێکتان مـردە مـاڵ و زێـڕو زیوی درێتی و گزێتی و فزێتی، بەقەلآندۆشکانیەوە بێت، بێـت بـۆلام و بڵـێ: ئەی پێغەمبەری خودا ! فریامکەوە، منیش پێی دەڵێم: مـن دەسـەلآتی هیـچم

نییــه كــه بیكــەم بــۆت، مــن لــه دنیــادا، ســەبارەت بــەم كاروبــارە، پێــتم ڕاگەیانــدووە. لەگێڕانەوەیەكــدا: ئــەی خەڵكینــە !ئــەی موســوڵمانینە! هــەر كەســێكتان كــران بەســەركارو كاربەدەســتی ئێمــەن لەســەر كــارێ، لــەكاروباری موســوڵمانان، وە بەقــەد دەرزییــەك، یــا زیــاتر، لــەوكارەی لەئێمــە شاردەوەو قولیــدا بــۆ خــۆی و بەدزییــەوە حەشــاریدا، ئــەوە دادەنــرێ بــەگزێتیو دەستپیــسی (غولــل). وە لــه ڕۆژی قیامەتــدا دەینــێ بەســەر شــانیەوەو بەبەرچاوی ئـەو هەمكە عەشاماتەوە دەیهێنــێ بۆ مەیدانن بۆ پای هەق و حساب و لێپرسنەوە ! ئـەوا بەهۆیـەوە بـاش باش تـەریق و ریسواو شـەرمەزار دەبـێ، وەك خـودای گـەورەو مـەزنن لـەم ئایەتـەدا، سـەبارەتی بـەم بابەتـە دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ - ئایـەتی ئـالی عیمـران/١٦١/٣- ﴾ واتە: هەر كەسـێ دەستپیـسی و ناپـاكی و دزی و گـزری لـه مـاڵی دەسكەوتی جـەنگی ئــایینی بكــاو بەناهــەق لێیقــول بــدا بــۆ خــۆی، ئــەوە لــه ڕۆژی هەڵــسانەوەدا كــه ڕۆژی قیامەتــە، دەینــێ بەســەر شــانیەوەو دەیهێنــێ بــۆ مەیــدانی لێپرســنەوەو بەهۆیــەوە بــاش ریسواو شــەرمەزاردەبێ. خــوا پــەنامان بدا. ئـامین. (تـاج/٣/٢٩٦ ف/٢ ز/١٠٩ باسـی بـەرتیل و دیـاری بـۆ كـار بەدەسـت ناڕەوایە: تَحْرِمُ الرِشْوَة والهَدِيَّةُ عَلَى الحَاكِم).

٦٧١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَنْ آتَاهُ اللَّهُ مَالًا فَلَمْ يُؤَدِّ زَكَاتَهُ، مُثِّلَ لَهُ مَالُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ شُجَاعًا أَقْرَعَ، لَهُ زَبِيبَتَانِ يُطَوَّقُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، ثُمَّ يَأْخُذُ بِلِهْزِمَتَيْهِ، يَعْنِي بِشِدْقَيْهِ، ثُمَّ يَقُولُ: أَنَا مَالُكَ، أَنَا كَنْزُكَ، ثُمَّ تَلَا: (وَلَا يَحْسِبَنَّ الَّذِينَ يَبْخَلُونَ.. الْآيَةَ). (الحديث ١٤٠٣ اطرافه في: ٤٥٦٥، ٤٦٥٩، ٦٩٥٧)[٨٠]:

---

(٨٠) اخرجَهُ مُسلِمٌ بالمعني: (ج/٧ ص٦٩ عن ابي هريرة، وَ ص٧٢ عن جابر، صحيح مسلم بشرح النووي ـ مبحث إثم مانع الزّكاة). -المترجم-

ئـەبو هـوريـرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی کـە خۆشەویـست -درودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (هەر کەسێ خودا مـاڵی پـێ بـدات و زەکاتەکـەی نـەدا، لـەڕۆژی قیامەتـدا دەبـێ بـەنێرە حـەفیانێکی سـەرگەڕی زەهـراوی، دووکەڵبـەی دەرپەڕیوی لە دەم دایە، جا وەك کەڵەمە لە ملی گادا، ئـاوا ئەڵقـە دەخـوات بە ملیاو، دەنووسێ بەهەردوو لالغاوەیدا، سەری لـەم لالغـاوەی و کلکـی لـەو لالغاوەکەی تری گیر دەکـاو، بـە تـەوەسـەوە بـۆ زیـادە سزا، پێـی دەڵـێ: مـن ماڵەکەی خۆتم، من گەنجەکەی خۆتم !)

ئینجـا حـەزرەت -درودی خوای لەسەر بێ- بـۆ پـشتیوانی ئـەم فەرموودەیـە ئـەم ئایەتە پیرۆزەی خوێندوە: ﴿لَا يَحْسِبَنَّ الَّذِينَ يَبْخَلُونَ..﴾

واتە: ئەوانەی کە ڕژدی و چروکی دەکەن، لە بـەختکردنی ئـەو مـاڵ و داراییەدا، کە لـە سـایەی خـوداوە پێیـان دراوە، باوانـەزانن کـە ئـەو ڕژدی و ڕەزیلیـیە بۆ ئەوان چاکە، بەڵکوو ئەوە زۆربەدو خراپە بۆ دوارۆژیان، ئـەو بەشە ماڵە لەکوێ سـامانەکانیان، کەهـەقی خـاوەن هەقـانـەو، ئـەوان لەبـەر ڕژدی نایـدەن پێیـان، لـەڕۆژی ڕەسـتاخێزدا، دەکـرێ بەتـەوقی ئاسـنین و دەکرێتە ملیان !) (تاج/٢/١١-٣- ش/ت/ن).

## ئەو ماڵەی زەکاتەکەی بدرێ بەر ئەو (کنز)ە ناکەوێ کە هەڕەشەی سەخت لەخاوەنەکەی کراوە

٦٧٢- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ يَقُولُ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ أَوَاقٍ صَدَقَةٌ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ ذَوْدٍ صَدَقَةٌ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ أَوْسُقٍ صَدَقَةٌ) (الحديث ١٤٠٥- اطرافه في: ١٤٤٧، ١٤٥٩، ١٤٨٤)[81]:

(٨١) أخرَجَهُ مُسلِمٌ فِي أوَّلِ كِتَابِ الزَّكَاة، رقم: ٩٧٩.

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (زیو لە پێنج ئۆقیە کەمتر بێ زەکاتی لێ ناکەوێ، پێنج ئۆقیە دەکاتە دوو سەد درهەم، ژمارەی وشتر لەپێنج وشتر کەمتربێ زەکاتی لێ ناکەوێ، دانەوێڵە لە پێنج ویسق کەمتربێ، زەکاتی لێ ناکەوێ.(تاج/٢/١٥ ف/٤ + ل/٢٥ ف/١).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

١. پێنج وەسق دەکاتە سەد صاع، بەپێوانەی کوردەواری دەکاتە نزیکەی چل و پێنج تەنەکە.

٢. درەمێ شەش دانقە، دە درەم حەوت مسقاڵە، کەواتە: دوو سەد درەم دەکاتە: سەدو چل مسقاڵ.

## خێر کردن لە کەسابەتی پاك

٦٧٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَنْ تَصَدَّقَ بِعَدْلِ تَمْرَةٍ، مِنْ كَسْبٍ طَيِّبٍ، وَلَا يَقْبَلُ اللَّهُ إِلَّا الطَّيِّبَ، وَإِنَّ اللَّهَ يَتَقَبَّلُهَا بِيَمِينِهِ، ثُمَّ يُرَبِّيهَا لِصَاحِبِهِ، كَمَا يُرَبِّي أَحَدُكُمْ فَلُوَّهُ، حَتَّى تَكُونَ مِثْلَ الْجَبَلِ) (الحديث ١٤١٠- طرفه في: ٧٤٣٠):

ئەبو هورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە -درودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: (ئەوەی خێرێ بکا، لە کەسابەتی حەڵاڵ چونکە هەرچی حەڵاڵ نەبێ خودا وەری ناگرێ، ئەوەی خێرێ بکا لەحەڵاڵ، خودای میهرەبان بەدەستی راستی خۆی وەری دەگرێ، وەك چۆن یەکێ لەئێوە جووانووی ماینێ، یا پارینە وشترێ، بۆ خۆی پەروەردەکا، خودایش ئەو خێرە ئاوا پەروەردە دەکا، تا تەواو گەورە دەبێ، وەبەقەد کێوێکی لێ دێ). (تاج/٢/٦ ف/٤).

## تا زوو خێر بکرێ درەنگە

٦٧٤- عَنْ حَارِثَةَ بْنَ وَهْبٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (تَصَدَّقُوا، فَإِنَّهُ يَأْتِي عَلَيْكُمْ زَمَانٌ يَمْشِي الرَّجُلُ بِصَدَقَتِهِ فَلَا يَجِدُ مَنْ يَقْبَلُهَا، يَقُولُ الرَّجُلُ لَوْجِئْتَ بِهَا بِالْأَمْسِ، لَقَبِلْتُهَا، فَأَمَّا الْيَوْمَ فَلَا حَاجَةَ لِي بِهَا). (الحديث: ١٤١١ طرفاه في: ١٤٢٤، ٧١٢٠) [٨٢]:

حاریثە ی کوڕی وەهب (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەگوێی خۆم لەزاری پیرۆزی خۆشەویستم بیست (درودی خوای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (تازوو خێربکەن درەنگە هاکا کەوتنە ڕۆژگارێکی واوە کەستان دەست ناکەوێ، کەخێرتان لێ وەربگرێ، هاکا وای لێهات پیاو بەماڵی خێرەوە بەسەر خەڵکا بسوڕێتەوە، بەڵکوو ئەو کەسەی کەخێرەکەی دەداتێ پێی دەڵێ: ئەگەر دوێنێ بهاتیتایە لێتم وەردەگرت، بەڵام ئێستا کارم پێی نییە، لەبەرئەوە وەری ناگرم ! لەئەنجامدا کەسی دەست ناکەوێ کەخێرەکەی لێ وەربگرێ). (تاج/١٠ ل/٧٣ ف/٤ - ش).

٦٧٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لَا تَقُومُ السَّاعَةُ، حَتَّى يَكْثُرَ فِيكُمْ الْمَالُ فَيَفِيضَ، حَتَّى يُهِمَّ رَبَّ الْمَالِ مَنْ يَقْبَلُ صَدَقَتَهُ، وَحَتَّى يَعْرِضَهُ، فَيَقُولَ الَّذِي يَعْرِضُهُ عَلَيْهِ: لَا أَرَبَ لِي) (الحديث ١٤١٢) [٨٣]:

ئەبو هورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) لە خۆشەویستەوە (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (قیامەت هەڵناسێ، تا ماڵ لەنێوانتانا وا زۆردەبێ، دەبێ بەلێشاو، تەنانەت خاوەن سامان دەکەوێتە مشووری ئەوەوە دەبێ کەسێکی وای دەست بکەوێ،

---

(٨٢) أخرجهُ مُسلِمٌ في الزّكاة أيضاً: (صحيح مسلم بشرح النووي/٧/٩٩). -المترجم

(٨٣) أخرجهُ مُسلِمٌ في الزّكاة، با ب: الترغيب في الصدقة قبل أن رقم: ١٥٧.

کەخێرو زەکاتی لێ وەربگرێ ! هەتا ئەگاتە ئەوە خاوەن سامان خێرو زەکات دەبا بۆ مەردووم، بەلاّم ئەوەی کە بۆی دەبا لێی وەرناگرێ و پێی دەڵێ: کارم پێی نییە.

٦٧٦- عَنْ عَدِيِّ بْنَ حَاتِمٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ يَقُولُ: كُنْتُ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَجَاءَهُ رَجُلَانِ، أَحَدُهُمَا يَشْكُو الْعَيْلَةَ، وَالْآخَرُ يَشْكُو قَطْعَ السَّبِيلِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَمَّا قَطْعُ السَّبِيلِ، فَإِنَّهُ لَايَأْتِي عَلَيْكَ إِلَّا قَلِيلٌ حَتَّى تَخْرُجَ الْعِيرُ إِلَى مَكَّةَ بِغَيْرِ خَفِيرٍ، وَأَمَّا الْعَيْلَةُ، فَإِنَّ السَّاعَةَ لَاتَقُومُ حَتَّى يَطُوفَ أَحَدُكُمْ بِصَدَقَتِهِ لَايَجِدُ مَنْ يَقْبَلُهَا مِنْهُ ثُمَّ لَيَقِفَنَّ أَحَدُكُمْ بَيْنَ يَدَيْ اللَّهِ، لَيْسَ بَيْنَهُ وَبَيْنَهُ حِجَابٌ، وَلَا تَرْجُمَانٌ يُتَرْجِمُ لَهُ، ثُمَّ لَيَقُولَنَّ لَهُ: (أَلَمْ أُوتِكَ مَالاً فَلَيَقُولَنَّ: بَلَى، ثُمَّ لَيَقُولَنَّ: أَلَمْ أُرْسِلْ إِلَيْكَ رَسُولًا ؟ فَلَيَقُولَنَّ بَلَى، فَيَنْظُرُ عَنْ يَمِينِهِ فَلاَ يَرَى إِلَّا النَّارَ، ثُمَّ يَنْظُرُ عَنْ شِمَالِهِ فَلاَ يَرَى إِلاَّ النَّارَ، فَلْيَتَّقِيَنَّ أَحَدُكُمْ النَّارَ، وَلَوْ بِشِقِّ تَمْرَةٍ، فَإِنْ لَمْ يَجِدْ فَبِكَلِمَةٍ طَيِّبَةٍ). (الحديث ١٤١٣- اطرافه في: ١٤١٧، ٣٥٩٥، ٦٠٢٣، ٦٥٣٩، ٦٥٤٠، ٦٥٦٣، ٧٤٤٣، ٧٥١٢)[84]:

عەدی کوڕی حاتەم (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەتی حەزرەتدا بووم دروودی خوای لەسەر بێ- لەو کاتەدا دوو پیاو هاتن بۆ خزمەتی، یەکێکیان سکاڵای لەدەستی هەژاری کرد، ئەوی تریان سکاڵای لەدەستی ڕێگری و جەردەیی کرد. پێغەمبەریش -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (ئەی عەدی ! ئایا شاری حیرەت دیوە؟ گوتم: نەمدیوە، بەلاّم ناوو نیشانیم بیستووە، فەرمووی: (ئەگەر مەرگ مۆڵەتت بداتو تەمەنت درێژبێ، بەچاوی خۆت ئافرەتی کەژاوەنشین دەبینی لە حیرەوە دێ، تەوافی کەعبە دەکا، بەبێ ئەوەی

(٨٤) أخرجه مسلم في الزّكاة، باب: الحث علي الصدقة ولو بشق تمرة. رقم: ١٠١٦.

کەسێکی لەگەڵدا بێ، وە لەو ماوەیەدا لەخودا نەبێ لەکەسی تر ناترسێ، چونکە ئاوا ڕێگەوبان ئەمین و بێترس دەبێ و جەردەو ڕێگر نامێنن، منیش لەدڵی خۆمدا گوتم: ئەی دەشێ ئەو جەردانەی هۆزی طەی چییان بەسەربێ و بۆ کوێ بچن، ئەوانەی کەئێستا ئەم وڵاتەیان کردووە بەئاگر. حەزرەت فەرمووشی: (ئەگەر تەمەنت بەبەریەوە هەبێ گەنجینەکانی کیسرا فەتح دەکرێن و، ئەو گشتە گەنج و سامان و گەوهەرە دەکەونە دەستی مسوڵمانان و مسوڵمانان بەتاڵان دەیانبەن بۆ خۆیان!).

عەرزیم کرد: مەبەستت کیسرای کوڕی هورموزە کەئێستا شای ئێرانە ؟ فەرمووی: بەڵێ، مەبەستم ئەوە، هەروا ئەگەر تەمەنت درێژبێ بەچاوی خۆت پیاو دەبینی بە چنگێ زێڕەوە، یا بە پڕ چنگێ زیوەوە دەسووڕێتەوە، بەڵام لەبەر زۆری پارەو پوول و لێشاوی ماڵ، کەسی دەست ناکەوێ کە ئەو چنگە زێڕو زیوەی لێ وەرگرێ، سوێندم بەزاتی خودا، ئێوە یەك بەیەکتان لە ڕۆژی قیامەتدا کە دەگەنەوە بەخزمەتی خودای خۆتان، هەرکەسەتان بەتەنها خۆی دەچێتە بەردەستی خودا، خودا بەخودی خۆی بەبێ پەردەو بەبێ تەرجومان و زمانزان قسەتان لەگەڵ دەکا، دەفەرموێ بەبەندە لەو گفتوگۆیەدا: ئایا لە دنیادا پێغەمبەرم نەنارد بۆ سەرت، هەتا فەرمانی منت پێ ڕاگەیەنێ؟ بەندە دەڵێ: با، بەڵێ، دەفەرموێ: ماڵ و منداڵم دابوو پێت یا نا؟ خێرو بێرێکی زۆرم ڕژاندبوو بەسەرتا یا نا؟ بەندە دەڵێ: بەڵێ وابوو، ئیتر ئەو بەندەیە کە سەیری لای ڕاستی خۆی دەکا دۆزەخ دەبینێ و، کە تەماشای لای چەپی خۆی دەکا دیسان هەر دۆزەخ دەبینێ، جا کەحاڵ وایە خۆتان بپارێزن لەئاگری دۆزەخ، ئەگەرچی بەلەتی دەنکە خورمایەکیش بێ، ئەوەیشی کەنییەتی بەخێرو خێرات خۆی لەئاگر قوتار بکا، بابەقسەی باش و زمانی

شیرین خۆی ڕزگار بکا). عەدی فەرمووی: من خۆم بەچاوی خۆم دیتم کە ژنی کەژاوەنشین لەحیرەوە دەهاتو تەوافی کەعبەی دەکردو ترسی کەسی تری نەبوو، ترسی خودای گەورە نەبێ، وە من خۆیشم یەکێك بووم لەو لەشکرەی کە گەنجینەکانی کیسرامان بەتالانی گرت، ئێوەیش ئەگەر تەمەنتان درێژ بێ ئەوی کە پێغەمبەر ـدروودی خوای لەسەر بێـ فەرمووی بەچاوی خۆتان دەیبینن). (تاج/٤/٣٦٢ ف/١) ئەم تەرجەمەیە دەقی ئەو ڕیوایەتەی بوخاریی کەوا لە (کتاب المناقب) باب علامات النبوه فی الاسلام (بڕوانە: عمدة القاریء/١٦ ص/١٣٤ ژمارەی فەرمووده/١٠٠). هەروەها بڕوانە: ریاض الصالحین/ کوردی بەرگی یەکەم ژمارە/٢٣-١٣٩).

٦٧٧– عن أبي مُوسى رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنِ النَبِي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قال: (لَيَأتَيِنَّ عَلَى النَّاتي زَمانٌ، يَطُوفُ الرَّجُلُ فِيهِ بِالصَّدَقَةِ مِنَ الذَّهَبَ، ثُمَّ لايَجَدُ أَحَداً يَأْخُذُهَا مِنْهُ، وَيُرى الرَّجُلُ الَواحِدُ يَتْبَعُهُ أَرْبَعُونَ امْرَأَتَ يَلُذْنَ بِهِ، مِنْ قِلَةِ الرِجالِ وَكَثْرَةِ النِساءِ) (الحديث ١٤١٤) [85]:

ئەبو موسای ئەشعەری (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست ـدروودی خوای لەسەر بێـ فەرمووی: (مەردوم دەکەونە ڕۆژگارێکی واوە، پیاو بەزێڕی خێرەوە ماڵەو ماڵو شارەو شار دەسووڕێتەوە تابیکا بەخێر، یا بیدا بەزەکات، بەڵام هەژاری دەست ناکەوێ کەلێی وەرگرێ، لەبەر زۆری ماڵ کەس نایەوێ، وەدەبینرێ چل ژن شوێنی تاقە پیاوێ دەکەونو پەنای بۆ دەبەن، تا سەرەوکارییان بکاو، کەس دەسدرێژییان لێنەکا، ئەمەیش لەبەر کەمی پیاوو زۆری ژن، بەهۆی زۆری ئاژاوەو زۆری کوشتنەوە). (ریاض/٤ ل/١٣٢٢ + تاج/٢/٥٩ ز/٢٣ ف/٢).

(٨٥) أخرَجهُ مسلم فيي الزكاة، باب: الترغيب فيي الصَدَقة... رقم: ١٠١٢.

# خێر کەمیشی هەر زۆرە

٦٧٨- عَنْ أَبي مَسْعُودٍ الأَنْصارِي رَضِي اللهُ عَنْهُ قَالَ: كَانَ رَسُولُ الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا أَمَرَنَا بالصَّدَقَةِ، انْطَلَقَ أَحَدُنَا إِلَى السُّوق، فَتحامَلَ، فَيُصيبُ الْمُدَّ، وَإِنَّ لِبَعْضهِم اليَوْمَ لَمائَةَ أَلْفٍ). (الحديث ١٤١٦)[٨٦]:

ئەو مەسعوودی ئەنصاری (رەزای خوای ل بێ) فەرمووی: جاران کاتێ پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- کە فەرمانی پێمان دەکرد بەکردنی خێروسەدەقە، هەمانبوو دەچوو بۆ بازارو کۆڵ کێشی دەکردو مشتێ دانەوێڵەی پەیدا دەکردو دەیکرد بەخێر، ئەوسا لەکاتی پێغەمبەرداو بەسەرینی ئەو زاتە، حاڵی ئێمە وابوو، بەڵام ئێستە خەڵك دارابوون، هەندێ لە برادەران سەد هەزار درەم و دیناریان هەیە).

٦٧٩- عَنْ عائِشَةَ رَضِي اللهُ عَنْها قَالَتْ: دَخَلَتِ امْرَأَةٌ مَعَها ابْنَتَانِ لَها تَسْأَلُ، فَلَمْ تَجِدْ عِنْدي شَيْئاً غَيْرَ تَمْرَةٍ، فَأَعْطَيْتُها إِيّاها، فَقَسَمَتْها بَيْنَ ابْنَتَيْها، وَلَم تَأْكُلْ مِنْها، ثُمَّ قامَتْ فَخَرَجَتْ، فَدَخَلَ النبي صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَيْنا فأَخْبَرْتُهُ، فَقَال: (مَنِ ابتَلى مِنْ هذِ البَناتِ بِشَيْئٍ كُنَّ لَهُ سِتْراً مِنَ النَّارِ). (الحديث ١٤١٨ – طَرَفُهُ في: ٥٩٩٥)[٨٧]:

عائیشە (رەزای خوای ل بێ) فەرمووی: ژنێ دووکچی خۆیی پێبوو، هاتەلام بۆ سواڵ، منیش تاقە دەنکێ خورمام هەبوو دام پێی، ئەویش لەتیکرد بۆ هەردوو کچەکەی و خۆی لێی نەخوارد، ئینجا هەڵساو ڕۆیشت، کە پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- هاتەوە ئەمەم بۆ گێڕایەوە، فەرمووی: (کەسێ

(٨٦) أخرَجَهُ مسلم: (صحيح مسلم بشرح النووي ج/٧ ص١٠٥، باب الحمل بأجره). – المترجم.

(٨٧) أخرَجَهُ مسلم في البرِ والصِلةِ.. فضل الاحسان إلي البنات، رقم ٢٦٢٩.

دووچاری دەستی کچ ببێو خودا بیەوێ بەهۆی کچەوە تاقی بکاتەوە، وەباش بێ بۆیان، ئیتر کچەکان یەك بن یا پتر، خودا لەڕۆژی قیامەتدا بەهۆی ئەو کچانەوە ڕزگاری دەکا لە ئاگری دۆزەخ). (ریاض/١/٢٣٤ ز/٣٣ ژمارە/١٠/٢٦٩-١ + تاج/٩/١١ ف/٤ ز/٣).

## کام خێرە زۆر خێرە

٦٨٠- عَنْ أَبي هُرَيْرَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: يا رَسُولَ الله، أَيُّ الصَّدَقَةِ أَعْظَمُ أجْراً؟ قَالَ: (أَنْ تَصَدَّقَ وَأَنْتَ مَحيحٌ صَحيحٌ، تَخْشَى الْفقْرَ وَتَأمُلُ الغِنـى، وَلاَ تُمْهِلُ حَتَّى إِذَا بَلَغَتِ الحَلْقُومَ قُلْتَ: لِفُلاَنٍ كَذَا، ولِفُلانٍ كَذَا، وَقَدْ كَانَ لِفُلانٍ). (الحديث ١٤١٩- طرفه في: ٢٧٤٨)[88].

ئەبوهورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ هاتە خزمەتی خۆشەویست -درودی خوای لەسەر بێ- عەرزی کرد: ئەی ڕەوانەکراوی خودا! کام خێرو بەخشینە پاداشتی گەورەترە؟ فەرمووی: (ئەو خێرەی کە دەیکەی لەشت ساخ بێو دڵت بەماڵداری خۆش بێو، مەترسی هەژارکەوتنت هەبێو هیوای دەوڵەمەندبوونت هەبێ، نەوەك کەمتەرخەمی بکەی تا ئەودەمەی کەگیان دەگاتە سەرلێو، وە مردن یەخەت دەگرێ، جائەو حەلە بە پەلەپرووزە بڵێی: ئەوە بۆ ئەمو ئەمە بۆ ئەو، تازە چ سوود! گریمان ئەگەر سوودیشی هەبێ کەمە لەچاو خێر کردنی حاڵی لەش ساخیدا، چونکە ئەو شتە لەدەستی دەرچووەو دەبێ بە ماڵی یەکێکی تر !). (تاج/٢/٥٧ ف/١ -ش/ن).

---

(٨٨) اخرجه مسلم في الزكاة، باب: بيان أفضل الصدقة صدقة الصحيح.. رقم ١٠٣٢.

٦٨١- عَنْ عِائِشَةَ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ: أَنَّ بَعْضَ اَزْواجِ النبيَ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قُلْنَ للنَّبِي صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَيُّنَا أَسْرَعُ بِكَ لُحُقاً؟ قالَ: (أَطْوَلُكُنَّ يَداً). فَأَخَذوا قَصَبَةً يَذْرَعُونَها، فَكانَتْ سَوْدَةُ أَطْوَلَهُنَّ يَداً، فَعَلِمْنَا بَعْدُ: أَنَّمَا كَانَتْ طُولَ يَدِهَا الصَّدَقَةُ، وَ كَانَتْ أَسْرَعَنا لَحُوقاً بِهِ، وَكَانَتْ تُحِبُّ الصَدَقَة. (الحديث ١٤٢٠) [89]:

عائیشه (رهزای خوای لیٚ بیٚ) فەرمووی: هەندیٚ لەهاوسەرەکانی پیٚغەمبەر (درودی خوای لەسەر بیٚ) عەرزی پیٚغەمبەریان کرد: لەپاش مردنی تۆ کاممان زووتر دەمرین و لەو دنیا بەخزمەتت دەگەینەوە؟ پیٚغەمبەر (درودی خوای لەسەر بیٚ) فەرمووی: (ئەوەتان کە دەستی دریٚژترە زووتر دەگاتەوە بە من) جا ژنەکانی پیٚغەمبەر (درودی خوای لەسەر بیٚ) تەلیٚ قامیشیان هیٚنا باسکی خۆیان پیٚ پیٚوا، تابزانن دەستی کامیان دریٚژترە، بەلاّم لەدواییدا دەرکەوت مەبەستی حەزرەت لەدەستی دریٚژ، خیٚرەومەندی و بەخشندەیی بوو، چونکە سەودە لە هەموویان باسکی دریٚژتر بوو، (بەلاّم زەینەب لەپیٚش هەموویانا ئەمری خودای کرد، دیاربوو کەدەست دریٚژییەکەی زەینەب بریٚتی بوو لە خیٚرەومەندی و خیٚرخوایی، چونکە هەمیشە بەدەستی خۆی ئیشی دەکردو کۆی دەکردەوەو دەیکرد بەخیٚرو چاکە). (تاج/٥/١٦٠ ف/١ -م/ب).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

شیکەرەوەکانی ئەم فەرموودەیە زۆرقسەیان لەم فەرموودەیە کردووە، لەبارەی تۆفیق و سازان لەنیٚوان خاتوو سەودەو خاتوو زەینەبەوە. گرنگ ئەوەیە کەجۆری خیٚری نایابی پیٚدەزانریٚ.

---

(٨٩) أخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: فضائل زينب.. رقم: ٢٤٥٢.

## خێر بەدەوڵەمەندو دزو داوێن پیس

٦٨٢- عَنْ أبي هُرَيْرَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ: أَنَّ رَسُلَ اللهِ صَلّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (قَالَ رَجُلٌ: لأتَصَدَّقَنَّ بِصَدَقةٍ، فَخَرَجَ بِصَدَقَتِهِ، فَوَضَعَهَا في يَدِ سَارِقٍ، فَأصْبَحُوا يَتحَدَّثون: تُصَدِقِ عَلى سَارِقٍ، فَقَالَ: اللهُمَّ لَكَ الحَمْدُ، لأتَصَدَّقَنَّ بَصَدَقةٍ، فَخَرَجَ بَصَدَقَتِهِ فَوَضَعَهَا في يَدَي زانِيَةٍ، فَأصْبَحُوا يَتحَدَّثونَ: تُصَدِقَ اللّيْلَةَ عَلى زانِيَةٍ، فَقَالَ: اللهُمَّ لَكَ الحمدُ عَلى زانِيَةٍ؟ لأتَصَدَّقَنَّ بَصَدَقةٍ، فَخَرَجَ بَصَدَقَتِهِ، فَوَضَعَهَا في يَدَيْ غَنِيٍ، فَأصْبَحُوا يَتحَدَّثونَ: تُصَدِقَ عَلى غَني، فقَالَ: اللهُمَّ لَكَ الحَمْدُ، عَلى سارِقٍ، وَعَلى زانيةٍ، وَعلى غَني، فَأُتيَ: فَقيلَ لَهَ: أمّا صَدَقَتُكَ عَلى سارِقٍ فَلَعَلّهُ أنْ يَسْتَعِف عَنْ سَرِقَتِهِ، وَأمّا الزانِيَة فَلعَلها أن تَسْتَعِفَّ عَنْ زِناهَا، وَأمّا الغَنيُّ أنْ فَلعَلّهُ يَعْتَبِر، فَيُنفِقُ مِمّا أعْطاهُ الله). (الحديث ١٤٢١)[٩٠]:

ئەبو هورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست -دروودی خوای لەسەر بێ- سەرو ماڵو منداڵو هەست ونەست گشتی بەقوربانی ئەو گەردەبێ، کە لەپێی دێنیکەرانی گۆڕی پیرۆزی دەنیشێ فەرمووی: پیاوێ دەبێ لەنەوەوی ئیسرائیل، دەڵێ: بە خودا دەبێ ئەمشەو خێرێ بکەم، شەو خێرەکەی دەباو دەینێتە ناودەستی دزێکەوە، بۆ بەیانی خەڵك دەڵێن: زۆر سەیرەئیمشەو خێر بەدزێ کراوە ! خێرکەرەکە دەڵێ: خودایە! سوپاس بۆ تۆ لەسەر ئەم خێرە بەم دزە (چونکە ئەمە ویستو خواستی تۆی لەسەربووە، خواستی تۆیش پڕە لەزانستی بەرزو، بێدانایی نییە) دەبێ خێرێ تر بکەم، خێرەکەی دەباو، دەینێتە ناودەستی ژنێکی داوێن

(٩٠) أخرجَهُ مُسلِمٌ في الزّكاةِ، باب: ثبوت أجرِ المتصدق وإن وَقعَتْ صَدَقَتُهُ في يَدِ غيرِ أهلِها، رقم: ١٠٢٢.

پیسەوە، بۆ بەیانی دیسان خەڵك دەڵێن: سەیرە! ئیمشەو خێر بە ژنێکی داوێن پیس کراوە، پیاوەکە دەڵێ: خودایە! سوپاس بۆ تۆ لەسەر ئەم خێرەیش بەم ژنە داوێنپیسە، دەبێ خێرێ تر بکەم، خێرەکەی دەباو دەینێتە ناو دەستی دەوڵەمەندێکەوە، دیسان بۆ بەیانی خەڵکەکە دەڵێن: ئای چەند سەیرە خێر بەپیاوێکی دەوڵەمەند کراوە !

پیاوەکەش دەڵێ: خودایە! سوپاس بۆ تۆ لەسەر خێردان بەپیاوی دزو بە ژنی خراپەکارو بە پیاوی دەوڵەمەند، خێرکەرەکە شەو لەخەودا خەوی دی، لەخەوا پێیان گوت: هەرسێ خێرەکانت گیرابوون، سا بەڵکو ئەو دزە بەهۆی خێرەکەی تۆوە واز لەدزی کردن بهێنێ، بەشکو ئەو ژنە سەلیتەیە (واتە: سۆزانییە) بەهۆی ئەو خێرەی تۆوە دەست لەو ئیشە خراپە هەڵبگرێ، بەشکو دەوڵەمەندەکەیش پەندوعیبرەت وەربگرێو شەرم لەخۆی بکاو، لەو ماڵو سامانەی کە خودا پێی داوە دەست بکا بە بەخششو خێرکردن). (تاج/١٠/٧٥-٧ -ش).

## خێر بەخزمی خۆتو بەکوڕو کچی خۆت

٦٨٣- عَنْ مَعْنِ بْنِ يَزِيدَ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: بَايَعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ -أَنَا وَأَبِي وَجَدِي رَضِي اللَّـهُ عَنْهُمَا وَخَطَبَ عَلَيَّ فَأَنْكَحَنِ وَخاصَمْتُ إِلَيْهِ: كَانَ أَبِي يَزِيدُ أَخْرَجَ دَنَانِيرَ يَتَصَدَّقُ بِهَا، فَوَضَعَها عِنْدَ رَجُلٍ فِي الْمَسْجِدِ، فَجِئْتُ فَأَخَذْتُها، فَأَتَيْتُهُ بِهَا، فَقَالَ: واللهِ مَاإِيَّاكَ أَرَدْتُ، فَخَاصَمْتُهُ إِلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: (لَكَ مَانَوَيْتَ يَايَزِيدُ وَلَكَ مَا أَخَذْتَ يَا مَعْنُ). (الحديث ١٤٢٢)[91]:

---

(٩١) من أفراد البخاري (عيني/٨/٢٨٧رقم: ٢٦). -المترجم-

مەعنی کوڕی یەزیدی کوڕی ئەخنەسی السُلَمي (رەزای خوای لێ بێ)، فەرمووی: (من پەیوەندیەکی پتەوم لەگەڵ پێغەمبەردا هەبوو -دروودی خوای لەسەر بێ- چونکە خۆمو باوکمو باپیرم بەیعەتو پەیمانمان بەپێغەمبەر داوە، وەپێغەمبەر خۆی -دروودی خوای لەسەر بێ- داخوازیی ژنی بۆکردمو هەرخۆیشی لێی مارەبڕیم، سکاڵایشم لەخزمەتدا کردووە: جارێ یەزیدی باوکم چەند دینارێ لەلای پیاوێ، لەمزگەوت دادەنێ کە بۆی بکا بەخێر. منیش چووم پارەکەم برد بۆخۆمو هێنام بۆلای باوکم. باوکم فەرمووی: بەخودا شتی وانابێ، من مەبەستم تۆ نەبووە، جامنیش بۆ دادخوایی‌و سکاڵاکردن، باوکمم برد بۆلای حەزرەت -دروودی خوای لەسەر بێ- خۆشەویست پاش ئەوەی کە لەحاڵەکە حاڵی بوو، فەرمووی: (تۆ بەنیازی خۆت گەیشتوویت ئەی یەزید! وەتۆیش ئەوەی کەبردووتە هی خۆتە ئەی مەعن! چونکە ئەو پارەیە دانراوە کە بدرێ بەکەسێ ئاتاجی پێی هەبێ، تۆیش ئەو مەرجەت واتیادا). (تاج/١/٦٩ ف/١).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

وەك لەدەقی فەرموودەکەوە دەردەکەوێ: مەعن خۆی‌و یەزیدی باوکی‌و ئەخنەسی باپیری، هەرسێکیان هاوڕێی پێغەمبەر بوون، دروودی خودا لە پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەوان بێ.

یەزید دەفەرموێ: کاتێ مسوڵمان بووم، هەموو کەس وکارەکەم لەگەڵما مسوڵمان بوون، تەنیا ژنێ نەبێ، بەم بۆنەیەوە خودا ئەم ئایەتە پیرۆزەی ناردە خوارەوە بۆ پێغەمبەر: ﴿وَلَا تُمْسِكُوا بِعِصَمِ الْكَوَافِرِ.سورة الممتحنة-١٠﴾.

خۆشەویست (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (خودای گەورە بەڵێنی پێم داوە، کە حەفتا هەزارکەس لەئوممەتم بەبێ لێپرسینەوە بباتە بەهەشت) یەزیدی کوڕی ئەخنەسیش دەفەرموێ: (سوێندم بەخودا ئەی پێغەمبەری خودا ! ئەم نەتەوەی ئیسلامەی کە پەیڕەوی تۆ دەکەن، ئەوەندە زۆرو گەورەو بێشومار دەبن، ئەم ئەندازەیە لەچاو ئەواندا وەك مێشی مۆر وایە لەچاو هەموو جۆرەکانی تری مێشدا).

## خێر کردن مەرج نییە مرۆڤ بەدەستی خۆی بیکا

٦٨٤- عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْها قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِذَا أَنْفَقَتِ المَرْأَةُ مِنْ طَعَامَ بَيْتِهَا، غَيرَ مُفْسِدِةٍ، كَانَ لَهَا أَجْرُهَا بِمَا أَنْفَقَتِ المَرْأَةُ مِنْ طَعَام بَيْتِهَا، غَيْرَ مُفْسِدَةٍ، كَانَ لَهَا أَجْرُهَا بِمَا أَنْفَقتْ، وَلِزَوْجِهَا أَجْرُهُ بِمَا كَسَبَ، وَلِلخَازِنِ مَثْلُ ذلِكَ، لاَيَنْقُصُ بَعْضُهُمْ أَجْرِ بَعْضٍ شَيْئاً). (الحديث ١٤٢٥ – أطرافه في: ١٤٣٧، ١٤٣٩، ١٤٤٠، ١٤٤١، ٢٠٦٥)[٩٢]:

عائیشە (رەزای خوای لێ بێ) لەپێغەمبەرەوە (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کاتێ ژن -بەبێ دەست بڵاوی- لەخۆراکی ماڵەوەی ببەخشێ، ئەوە پاداشتی باشی بۆ هەیە لەسەر ئەو بەخشینە، چونکە ئەو هۆی ئەوەیە، هەروەها مێردەکەشی پاداشتی باشی بۆ هەیە، چونکە ئەو پەیدای کردووە، کلیلدارو کلیل بەدەستیش هەروەها، کەسیشیان لەپاداشتی کەسیان کەم ناکەنەوە، واتە: نابن بە موزاحیمی یەکتریی). (تاج/٢/٦- ف/٤ - ش/د/ت/ن).

(٩٢) أخرجَهُ مُسلِمٌ في الزّكاةِ، باب: أجرِ الخَازنِ الأمينِ والمرأةِ إذا تصدّقت...، رقم: ١٠٢٤.

**ڕاڤەو شیکردنەوە:**

مەبەست ئەوەیە: (ئەگەر دووکەس یا چەندکەسێ هاوبەشی بکەن لە ئەنجامدانی کارێکی خێردا، ئەوە هەریەکێ لەوان بە قەد جۆری هاوبەشیو ئەرکو ماندووبوونی خۆی، لەجێبەجێ بوونی ئەو کاری چاکەیەدا، خێرو پاداشتی دەگا، وەزۆریو کەمی پاداشی هەریەکێ لەوان، پەیوەندیی بە ئەندازەی ڕۆڵی خۆیەوە هەیە لەئەنجامدانی ئەو کارە خێرەدا، کەواتە مەرج نییە کە هەموو هاوبەشکەرەکان وەك یەك خێریان بگات، بۆ وێنە: دروستە ژن کە لەماڵی مێردی، خێرێ بکا، دە چاکەی بۆ هەبێ، یا کەمتر یا زیاتر، وەمێرد سەد چاکەی بۆ بنووسرێ، یا زیاتر یا کەمتر).

## خێردەبێ لەسەر تێری بێ

٦٨٥- عَنْ حَكِيم بْنِ حِزَامٍ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ عن النَّبِي صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (اليَدُ العُلْيَا خَيْرٌ مِنَ اليَدِ السُّفْلَى، وابْدأْ بِمَنْ تَعُولُ، وَخَيْرُ الصَّدَقَةِ عَنْ ظَهْرِ غِنىً، وَمَنْ يَسْتَعْفِفْ يُعِفُّهُ الله، وَمَنْ يَسْتَغْنِ يُغْنِهُ الله). (الحديث – ١٤٢٧)[٩٣].

حەکیمی کوڕی حیزام (ڕەزای خوای لێ بێ) لەخۆشەویستەوە -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: (دەستی سەرەوە، کە دەستی خێرکەرە، لەدەستی ژێرەوە باشترە، کەدەستی خێر وەرگرە، لە خێزانو خزمی خۆشتەوە دەست بکە بەخێرکردن، باشترین خێریش ئەو جۆرە خێرەیە کە لەسەر تێریی بێ، وەهەر کەسێکیش خۆی بە دوور بگرێ لە ڕووزەردیی سواڵو سواڵکردن، خودا لەهەردوو جیهاندا ڕوو سوورو سەربەرزی دەکا، وە هەر کەسێکیش

(٩٣) أخرجه مسلم في الزكاة، باب: بيان أن اليَدَ العُلْيَا خَيْرٌ مِنَ اليَدِ السُّفْلي.. رقم: ١٠٣٤.

چاوی تێربێ‌و خۆی بێنیاز بگرێ‌و چاوی لەدەستی ئەم‌و ئەو نەبێ، خودا دەوڵەمەندو بێنیازی دەکا). (تاج/٢/٤٨ ف/١ + ل/٥١ ف/٥ + ل/٥٤ ف/١).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

بۆ ئەوەی سا بەڵکو خودای گەورە، بەدەستەڵاتی بێسنووری خۆی، بەڕەحمەتی بێ پایانی خۆی، ڕەفتارە شیرین‌و جوانەکانی جاران لەناو مسوڵمانانا زیندوو بکاتەوە، بەرەبەرە شەوکەت‌و سام‌و شکۆی مسوڵمانان لە سەرجەمی جیهانا، وەك سەردەمی زێڕینیان، دەست پێبکاتەوە، وابۆ ئەم مەبەستە، بەپشتی خودا، ژیاننامەی پڕ لە شانازی‌و سەربەرزی‌و جوامێریی حەکیمی کوڕی حیزام دەنووسین، بەڕاستی هیچ شتێ وەك داستان‌و باسی ژیاننامەی پیاوچاکان بڕوادار نابەستێتەوە بە ئایین‌و بەپەیڕەوی کردنی ئایینەوە. حەکیمی کوڕی حیزام (ڕەزای خوای لێ بێ) برازای حەزرەتی دایکە خەدیجەی هاوسەری پێغەمبەر بووە -دروودی خوای لەسەر بێ-، ڕەزای خودا لەخەدیجەو برازاکەی بێ، یەکێ بووە لە بەگزادەکانی قوڕەیش، ڕیفادە لەدەستی ئەودابوو، ابن الأثیر (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: (ڕیفادە جۆرە پیتاك کۆکردنەوەیەك بووە، قوڕەیش لەناو خۆیاندا، هەرکەسێ بەپێی توانای خۆی، بڕێ بەخشش دەدا، هەتا سامانێکی زۆریان کۆ دەکردەوە، جا لەو ماڵە خواردەمەنی‌و مێوژو خۆشاویان دەکڕی، وە لە ڕۆژانی حەجدا دەرخواردی خەڵك‌و حاجیانیان دەدا...).

حەکیم خۆی دەیفەرموو: (سیازدە ساڵ لەپێش ساڵی فیلدا، لەدایك بووم، لەبیرم دێ، کە عەبدولموتتەلیبی باپیرەی پێغەمبەر، دەیویست، بۆ جێبەجێ کردنی نەزرەکەی، عەبدوڵڵای کوڕی، واتە: باوکی پێغەمبەر، سەرببڕێ‌و بیکا بە قوربانی، حەکیم لەناو ژووری کەعبەدا لەدایك بووە،

له جاهيلليەتا شەست ساڵ ژياوە، لەئيسلاميشا شەست ساڵ ژياوە، شەست كۆيلەی لەسەردەمی نادانی پێش ئيسلامدا ئازادكردووە، لەسەردەمی ئيسلام دا حەجی كرد، سەد وشتری دياری بەيتی پێبوو، كاتێ لەچياى عەرەفە، لە ڕۆژی عەرەفەدا ڕاوەستا، سەدكۆيلەی هێنابوو، لەوێ لەگەڵيا ڕاوەستابوون، لەگەڵيا حەجيان دەكرد، هەرسەديان يەكی سەروتەوقی زيويان لە گەردندا بوو، بەنەخش لێيان نووسرابوو: ئەمانە ئازادكراوی خودان، لەبەر ڕەزای خودا حەكيمی كوڕی حيزام ئازادی كردوون، هەزار سەر پەزيشی كرد بەهەدیی بەيت.

حيزامی باوكی لەهەرای (فجار)دا كوژرا، خۆش ئامادەی ئەم هەرايە بووە، لەپێش بيعثەتدا دۆستی پێغەمبەر بوو، لەدوای بيعثەتيش هەر پێغەمبەری خۆشی دەويست، بەڵام درەنگ ئيسلام بوو، يەكێ بوو لە (مسلمە)ی فەتح، لە ڕۆژی ئازادكردنی مەككەدا، بۆ ڕێزنان لەحەكيم، پێغەمبەر درودی خوای لەسەر بێ فەرمووی: (هەركەسێ بڕواتە ماڵی حەكيمی كوڕی حيزامەوە، لەسەرو ماڵی خۆی دڵنيابێ). حەكيم پياوێكی ژيری ڕێزداری لەخوا ترسی دەوڵەمەند بوو، زۆر بەخشندەو خێركەر بوو، سەدو بيست ساڵ ژياوە، ساڵی پەنجاو چوار، لە سەردەمی جێنشينی موعاوييەدا، لەمەدينە، لەماڵی خۆی دا زايە بوو (ڕەزای خوای لێ بێ).

٦٨٦-عَنْ عَبْدِاللهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: أَنَّ رَسُولَ الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ، وَهُوَ عَلَى الِمنبرِ، وَذَكَرَ الصَّدَقَةَ وَالتَّعَفُّفَ وَالَمسْئَلَةَ: (اليَدُ العُلْيَا خَيْرٌ مِنَ اليَدِ السُّفْلى، فَاليَدُ العُلْيَا هِيَ المنْفِقَةُ، وَالسُّفْلى هِيَ السَّائِلَةُ). (الحديث ١٤٢٩)[٩٤]:

عەبدوڵڵای كوڕی عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر درودی خوای لەسەر

(٩٤) أخرجه مسلم في الزكاة، باب: بيان أن اليدَ العليا خيرٌ منَ اليدِ السفلي.. رقم: ١٠٣٣.

بێ لەسەر دوانگە، باسی خێرکردنو خۆپاراستن لەدەرووزەو گەدایی فەرموو، لەم لایەنەوە فەرمووی: (دەستی سەرەوە لەدەستی ژێرەوە باشترە، دەستی سەرەوە ئەو دەستەیە کەشت دەبەخشێ، دەستی ژێرەوەیش ئەو دەستەیە کەگەدایی دەکا).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

ئەم بەهرانە لەفەرموودەکانی ئەم باسە وەردەگیرێن:

١. چاکەکردن لەگەڵ خێزانو باشبوونو بۆیانو مەسرەفە کردن بۆیان بەنیازی پەرستش بەشێکە لەخێرکردن، خێر بەباوكو دایكو برا دەشێ.

٢. وازهێنان لەهەندێ کاری ناشایستەو پشت بەستن بەخودا، کە هەقی ئەوەی بۆ بکاتەوە، وەك تۆ واز لەسوالکردن بهێنی، بەئومێدی ئەوەی کە خودا دەرووییەکی باشترت لێ بکاتەوە، بۆ دابینکردنی بژێویو گوزەرانی خۆتو ماڵو منداڵ، لەکاتی وادا خودا دێ بەهانای بەندەی خۆیەوەو بەڵێنی ئەوەی دەداتێ.

# باسی هاندان لەسەر خێرکردن

٦٨٧– عَنْ أبي مُوسى رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: كَانَ رَسُولَ الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إذا جَاءَهُ السَّائِلُ، أَوْ طُلِبَتْ إِلَيْهِ حَاجَةٌ، قَالَ: (أشْفَعُوا تُؤْجرُوا، وَيَقْضِي اللهُ عَلى لِسَانِ نَبِيهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ما شاءَ). (الحديث ١٤٣٢– أطرافه في: ٦٠٢٧، ٦٠٢٨، ٧٤٧٦)[٩٥]:

(٩٥) أخرجَهُ مُسلِمٌ في الادَب (عيني/٨/٢٩٨) = ج/١٦ص١٧٧-المترجم)

ئەبو مووسا (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جاران کەخۆشەویست -دروودی خوای لەسەر بێ- نیازمەندێ دەهاتە خزمەتی بۆ کارێکی خۆی، ڕووی دەکردە دانیشتوانی خزمەتی‌و دەیفەرموو: (تکای باش بکەن بۆ داماوان‌و نیازمەندان، هەتا کرێ‌و مزو پاداشتی باشی لەسەر وەربگرن، هەچیش نیازی خودای گەورەی لەسەربێ، دێتە دی، وە خودای گەورە لەسەر زمانی پێغەمبەری خۆی بەیانی دەکا) (بڕ: ریاض ل/٢١٨، تاج/٩ ل/٨٧ ص/٥٤ ج/٥).

٦٨٨- عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ ابي بَكْرٍ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ قَالَتْ: قَالَ لِيَ النَبِيُّ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:(لاتُوكى فَيُوكى عَلَيْكِ). وَفي رِوايَةٍ: (لاتُحْصى فَيُحْصيَ الله عَلَيْك). وَفي رِوَايَةٍ: (لاتُوعي فَيُوعِيَ الله عَلَيْكِ، إرضَخي مَاأستطَعْتِ) (الحديث: ١٤٣٤)[96]:

ئەسمای کچی ئەبوبەکری صەدیق (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- پێی فەرمووم: (ئەی ئەسماو! خێر بکەو ببەخشەرەوەو، دەست مەگرەرەوە، تا دەتوانی ماڵ لەڕێگەی خودادا، بەخت بکەو، مەیکەرە کیسەو توورەکەو پریاسکەوەو، دەرگاکەی بەدەمبێن مەبەستەو، پارەو پوولی زۆر، بەبێ سوودێکی ڕەوا کەڵەکە مەکە، ئەگینا خودایش لەتۆی دەگرێتەوە!). (ریاض/٢/١١٤ فەرموودەی ژمارە/١٦/٥٥٩ + تاج/١٠/٧٧ ف/١٠ ص/٢٢٠ ج/٥).

٦٨٩- عَنْ حيكمِ بْنِ حِزَامٍ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ قالَ: يَارَسُولَ الله، أَرَأَيْتَ أَشْياءَ، كُنْتُ أَتَحَنَّثُ بِهَا في الجاهليةِ، مِنْ صَدَقَةٍ، أوْ عَتَاقَةٍ، وَصِلَةِ رَحِمٍ، فَهلْ فِيها مِنْ أجرٍ؟ فَقالَ النبيُّ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَسْلَمْتَ عَلى مَاسَلَفَ مِنْ خَيْرٍ) (الحديث ١٤٣٦-أطرافه في: ٢٢٢٠، ٢٥٣٨، ٥٩٩٢)[97]:

(٩٦) اخرجه مسلم في الزكاة (عيني/٨/٢٠٠) = ج/٧ص/١١٨ — المترجم).

(٩٧)أخرجه مسلم في الإيمان، باب: بيان حكم عمل الكافر.. رقم: ١٢٣ —ج/٢/١٤٠.

حەکیمی کوڕی حیزام (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: (ئەی پێغەمبەری خودا ! ئایا ئەو چاکانەی کە لەمەوپێش، لە سەردەمی نەزانی پێش هاتنی ئیسلام دا کردوومن، بەنیازی نزیکبوونەوە لە خودا، وەك خێرکردنو کۆیلە ئازاد کردنو بەسەرکردنەوەی خزمو خویش، ئایا پاداشیان هەیە، وەبەکردەوەی چاکە ژمێرە دەکرێن بۆم؟ پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (لەسەر بناغەو پێشینەیەکی باش مسوڵمان بوویت).

### ڕاڤەو شیکردنەوە:

ئەم فەرموودەیە بەڵگەیەکی ڕوونە لەسەر ئەوە: کەکردەوەی باشی کاتی بێ باوەڕی، لەپاش ئیسلام بوون، سوودی هەیە بۆ خاوەنەکەی، هەروەك کردەوەی باشی پێش ڕەسیدە بوون، سوودی هەیە بۆ خاوەنی لە پاش باڵق بوون.

## خێرکردنی کلیل بەدەست لەو ماڵەی وا لەژێر دەستیدا

٦٩٠- عَنْ أَبِي مُوسى رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنِ النَّبِى صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (الخازِنُ المُسْلِمُ الأمينُ، الَّذي يُنْفِذُ -وَرُبَّمَا قَالَ: يُعْطي- مَا أُمِرَ بِهِ،كَامِلاً مُوَفَّراً، طَيِبٌ بِهِ نَفْسُهُ، فَيَدْفَعُهُ إِلَى الذِي أُمِرَ لَهَ بِهِ، أَحَدُ المُتَصَدِّقَيْنِ). (الحديث ١٤٣٨ - طَرَفَاهُ في: ٢٢٦٠، ٣٣١٩)[٩٨]:

لە ئەبو مووساوە (رەزای خوای لێ بێ) خۆشەویست -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (کلیل بەدەستی مسوڵمانی دەستپاك، کاتێ ئەو فەرمانەی کە خاوەن ماڵ

(٩٨) أخرجَهُ مسلم في الزكاةِ، باب: أجر الخازنِ الامين والمرأةِ إذا تصدّقت.. رقم: ١٠٢٣.

پێی کردووە، سەبارەت بەکردنو جێبەجێکردنی خێرێ، ئەگەر بەتەواوی و بەتێروتەسەلی، وەك پێی گوتراوە، ئەو فەرمانە ئەنجام بداو بیدا بەوکەسەی کەپێی گوتراوە، وە پێخۆشحاڵ بێ بەئەنجامدانی، ئەوە خێرکەرەکان دەبن بەدوو، کە ئەو یەکێکیانە). (بڕوانە: ژمارە: ٦٨٤).

٦٩١–عَنْ أبي هُرَيْرَةَ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ أَنَّ النبيَّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (مَا مِنْ يَوْمٍ يُصْبِحُ العِبَادُ فِيهِ، إلامَلَكانِ يَنْزِلان، فَيَقُولُ أَحَدُهُمَا: اللهُمَّ اَعْطِ منفِقاً خَلَفاً، وَيَقُولُ الآخَرُ: اللهمَّ أَعْطِ مُمْسِكاً تَلَفاً). (الحديث: ١٤٤٢)[99]:

ئەبوهورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) لەخۆشەویستەوە، دەفەرموێ درودی خوای لەسەر بێ:

(هەموو ڕۆژێ کە بەندەکان ڕۆژیان لێدەبێتەوە، دوو فریشتە دێنە خوارەوە، یەکێکیان دەفەرموێ: خودایە! ئەوەی بەخشندەیە، تۆش پێی ببەخشەو تۆڵەی بەزیادەوە بۆ بکەرەوە، ئەوی تریشیان دەفەرموێ: خودایە! ئەوەی چرووكو گیرو خێرنەکەرە، تۆش لەوی بگرەوەو ئایەومایەی بفەوتێنە). (بڕ: ریاض/١/٧/٢٩٥/ ل/٢٤٧).

٦٩٢– عَنْ أبي هُرَيْرَةَ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ: أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (مَثَلُ البَخيلَ وَالمُنفِقِ، كَمَثَلِ رَجُلَيْنِ، عَلَيْهِمَا جُبَّتَانِ مِنْ حَدِيدٍ، مِنْ ثُدِيهِهَا إلى تَراقِيهَما، فَأمَّا المُنفِقُ: فَلاَ يُنفِقُ إلاَّ سَبَغَتْ، أَوْ وَفَرَتْ عَلى جِلْدِهِ، حَتَى تُخفْيَ بَنَانَهُ، وَتَعفُوا أَثَرَهُ، وَأمَّا البَخيلُ: فَلاَ يُرِيدُ اَنْ يُنْفِقَ شَيْئَاً إلاَّ لَزِقَتْ كُلُّ حَلْقَةٍ مَكَانَهَا، فَهُوَ يُوَسِعُهَا وَلاَ تَتَّسِعُ). (الحديث ١٤٤٣) – أطرافه في: ١٤٤٤، ٢٩١٧، ٥٢٩٩، ٥٧٩٧)[100]:

ئەبوهورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ژنەوتم لە خۆشەویست درودی خوای

---

(٩٩) أخرجه مسلم في الزكاة، باب: في المنفق والممسك، رقم: ١٠١٠.

(١٠٠) أخرجه مسلم في الزكاة، باب: مثل المنفق والبخيل، رقم ١٠٢١.

سەر بێ دەیفەرموو: (پیاوی ڕەزیلو پیاوی بەخشندە (سەخی) مانەندی دوو پیاو وان، کەیەکی سەرو زریەی ئاسنینی تەسکیان لەسەردابێ، لە مەمکیانەوە بێ تاددانەی سنگیان، جاجار لەگەڵ جارا، کەبەخشندەکە شتێ دەبەخشێ، زریەکەی کشی دێو گوشادو گەورە دەبێ، تاوای لێ دێ لەبەرپێی دەخشێ (و وەك چۆن جلی شۆڕ شوێن پێی خاوەنەکەی لەکاتی ڕۆیشتن دا، کوێر دەکاتەوە، خێرو خێراتو بەخشندەییش ئاوا گوناه و تاوانی خاوەنەکەی دادەپۆشێ)!

بەڵام پیاوی ڕەزیلو چرووك هەرکاتێ ویستی خێرێ بکا، یا شتێ ببەخشێ، ئەڵقەی زریەکەی دێتەوە یەكو زیاتر قوڵفەکانی تەسك دەبنەوە، هەتا بەرەبەرە، هەردوو دەستی شەتەك دەدرێن بەبەر بینیەوە). فەرمووی: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: (جا ڕەزیلەکە هەر هەوڵو تەقەلا دەدات، کە کەشی بێنێ بەلام ناتوانێ!).. (تاج – ش + ریاض/٢/١١٥ ژ/١٧/٥٦٠ ز/٦٠).

٦٩٢-(مكرر)- عَنْ أبي مُوسى رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (عَلى كُلِ مُسْلِم صَدَقَةٌ). فَقَالُوا: يَـانَبِيَّ اللهِ، فَمَنْ لَمْ يَجِدْ؟ قَالَ: (يَعْمَلَ بِيَدِهِ، فَيَنْفَعُ نَفْسَهُ وَيَتَصَدَّقُ). قَالُوا: فَإنْ لَمْ يَجِدْ؟ قَالَ: (يُعِينُ ذَا الحَاجَةِ المَلْهُوفَ). قَالُوا: فَإنْ لَمْ يَجِدْ؟ قَالَ: (فَلْيَعْمَلْ بِالمعْرُوفِ وَلْيُمْسِكْ عَنِ الشَّرِّ، فَإنَّهَا لَهُ صَدَقَةٌ). (الحديث ١٤٤٥ – طرفه في: ٦٠٢٢)[١٠١]:

ئەبوموووسا (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (هەموو مسوڵمانێ لەسەریەتی کە خێری بکا) عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خودائەی ئەگەر مسوڵمانێ نەیبوو چۆن؟ فەرمووی: (قۆڵی لێهەڵماڵیو ئیش بکا، هەم خۆی بەخێو بکا، هەم خێریش لەدەسکەوتی

(١٠١) أخرجه مسلم في الزكاة، باب: مثل المنفق والبخيل، رقم ١٠٢١.

کارەکەی بکا). گوتیان: ئەی ئەگەر ئەمەی بۆ نەکرا چۆن؟ فەرمووی: (یاریدەی لێقەوماوێکی داماو بدە) گوتیان: ئەی ئەگەر ئەمەشی بۆ نەلوا چی بکا؟ فەرمووی: (بارەفتاری جوان بیَو کاری باش بیَو ڕێگەی باش بەخەڵك بڵیَو واز لەخراپە بێنیَ، ئەمەیش دەبیَ بەگەورەترین خێرو خێرات بۆی).(ریاض/١/١٣٣/ ژ/١٤١ ز/١٣).

٦٩٣- عَنْ أُمّ عَطِيَةَ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ قَالَتْ: بُعِثَ إلى نُسَيْبَةَ الأَنْصَارِيَةِ بِشَاةٍ، فَأَرْسَلَتْ إلى عَائِشَةَ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ مِنْهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (عِنْدَكُمْ شَيْءٌ، فَقُلْتُ: لا، إلاَّ مَا أَرْسَلَتْ بِهِ نُسَيْبَةُ مِنْ تِلْكَ الشَّاةِ، فَقَالَ: (هَاتِ، فَقَدْ بَلَغَتْ مَحَلَّهَا). (الحديث ١٤٤٦ – طرفاه في: ١٤٩٤، ٢٥٧٩)[١٠٢]:

ئوم عەتیَ (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: من کەناوم نوسەیبەی ئەنصارییەو، ناودارم بە دایکی عەتیَ، پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- مەڕێکی زەکاتی بۆ ناردم، کاتیَ سەریم بڕی، بەدیاری بەشی عائیشەی هاوسەری پێغەمبەرم لێی نارد، پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- بەعائیشە دەفەرمویَ: (ئایا شتێکتان لەلا هەیە کەقاوەڵتی پیَبکەین؟). عائیشە دەفەرمویَ: (هیچم لەلا نییە، تەنیا دیارییەکەی ئوم عەتیَ نەبیَ، کە لەو مەڕە زەکاتە بۆی ناردووم، کە تۆ پێت دابوو، ئایا تۆ لەوە دەخۆی؟) پێغەمبەریش -درودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (بیهێنە ئەوە گەیوەتە جێگەی خۆی، گەیوەتە ئەو جێگەیەی کە پێی حەڵاڵ دەبیَ، چونکە هەتا زەکات بیَ بەمن حەرامە، ئێستا بووە بەماڵی ئوم عەتیَو لەزەکاتی دەرچووە، بەڵکوو دادەنریَ بەدیاری، دیاریش بۆ من حەڵاڵە). (بڕوانە: تاج/٢/٤٦ - ف/١+٢+٣+٤+٥+٦).

(١٠٢) أخرجا مسلم في الزكاة، باب: إباحةِ الهَديَةِ للنبيّ صَلى اللهُ عَليهِ وَسَلمَ .. رقم:١٠٧٦.

# زەكاتی ئاژەڵ

٦٩٤- عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ أَبابَكْر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: كَتَبَ لَهُ الَّتِي أَمَرَ اللهُ رَسُولَهُ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (وَمَنْ بَلَغَتْ صَدَقَتُهُ بِنْتَ مَخاضٍ وَلَيْسَتْ عِنْدَهُ، وعِنْدَهُ بِنْتُ لَبُونٍ، فَانَّها تُقْبَلُ مِنْهُ، وَيُعْطِيهِ الْمُصَدِّقُ عشرينَ دِرْهَماً أَوْ شاتَيْنِ، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ عِنْدَهُ بِنْتُ مَخاضٍ عَلى وَجْهِها، وَعِنْدَهُ ابْنُ لَبُونٍ، فَإِنَّهُ يُقْبَلُ مِنْهُ، وَلَيْسَ مَعَهُ شَيْءٌ). (الحديث ١٤٤٨) طرفاه في: ١٤٥٠، ١٤٥١، ١٤٥٣، ١٤٥٤، ١٤٥٥، ٢٤٨٧، ٣١٠٦، ٥٨٧٨، ٦٩٥٥)[١٠٣]:

پێشەوا ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: (.. ئەو زەكاتە فەرزەی كەخودای گەورە دایناوە لەسەر نەتەوەی ئیسلام، ئەبوبەكر بۆی نووسیمەوە: (وە هەركەسێ زەكاتەكەی دەیكردە گوێرەكە وشترێكی مێی یەك ساڵە، بەڵام ئەوەی نەبوو، بەڵكو گوێرەكە وشترێكی مێی دوو ساڵەی هەبوو، ئەوا ئەوەی لێ وەردەگیرێ، بەڵام زەكات سێنەكە بیست درەم یا دوو مەڕ یادوو بزن سەرباقی دەداتەوە بەزەكادەر، وە ئەگەر كەسێكیش زەكاتی وشترەكانی دەیكردە كوێرەكەو وشترێكی مێی یەك ساڵە، بەڵام گوێرەكە وشتری وای نەبوو، بەپێی مەرجی خۆی، كەبەكەڵكی زەكات بێ، بەڵكوو پارینە وشترێكی نێرەی دوو ساڵەی هەبوو، ئەوا ئەوەی لێوەردەگیرێ، سەر بەسەر بەبێ سەرباقی). (تاج/٢/٢٠ ف/١ - ب/د/ن).

## ڕاڤەو شیكردنەوە:

ئەم فەرموودەیە ئەم ناسك كاریيانەی وا تیا (بڕ: ژمارە/٤٨ ب/١):

---

(١٠٣) قالَ العسقلاني: وَوافقه مسلم علي تخريجها سوي.. وحديث انس عن ابي بكر في الزكاة (فتح/ ٣/٤٤١ — خاتمة كتاب الزكاة — المترجمة) اي لم يخرجه مسلم.

(له فەرمووده رشته چوارینەکانی بوخاریيه، ڕشتەکەی ئاوایه: حَـدَّثَنَا مُحمدُ بْنُ عَبْدِاللهِ، قَالَ: حَدَّثَنِي اَبِي، قال: حَدَّثَنِي ثُمَامَةٌ أَنَّ أَنساً رَضِـيَ اللّـهُ عَنْـهُ حَدَّثَهُ أَنَّ أَبَابَكْرٍ رَضِيَ اللّـهُ عَنْـهُ.. واتـه: بوخـاری دەفـەرموێ: موحەممـەدی کوڕی عەبـدوڵڵا قسەی بـۆ کـردین، فـەرمووی: بـاوکم قسەی بـۆ کـردووم، فەرمووی: ثومامه قسەی بۆ کردووم، که ئەنەس قسەی بـۆی کـردووه، کـه ئەبوبـەکر ئـەو زەکاتـەی.. تـاد. ڕشـتەکەی لەهـەموو قۆناغەکانیـدا بەتـەحدیثـه، لـه شـوێنی یەکـەما تـەحدیثـەکـه بەبێـژی کۆیـه، لەسـێ شوێنەکەی تردا بەبێژەی تاکه، پیاوانی ڕشتەکە هەموویان بەصرەیین، کوڕ لەباوکیـەوه دەیگێڕێتـەوه، کـه موحەممـەده لـه عەبـدوڵڵاوه، کـوڕەزا لـه باپیریەوه، که ثومامەیه له ئەنەسەوه، چونکه ئەنـەس بـاپیرەی ثومامەیـه، برازا لـه مامەیـەوه، کـه عەبـدوڵڵای کوڕی مـوثـەننـای کـوڕی ئەنەسـه، لـه مامەیـەوه دەگێڕێتـەوه کـه ثومامـەی کـوڕی عەبـدوڵڵای کـوڕی ئەنەسـه، زنجیرەی ڕشتەکە هەموویان نەوەی ئەنەسن، عەبـدوڵڵای کـوڕی مـوثـەننـا لەئـەفراد (تاکـەکان)ی بوخاریـیـه، واتـه: پێـشەوا موسـلیم احتجـاجی پێنەکردووه، واتـه: لـەپیاوانی صـەحیحی موسـلیم نییـه (بـڕ: فـەرموودەی ژماره/ ٦٦ بەرگی یەکـەم). بوخـاری (رەزای خوای ل بێ) لـه ده شوێنا لەصـەحیحی بوخاریدا ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوه، لەهەندێ شوێنا پارچـه پارچـەی کردووه، لەهەندێ شوێنا بەدوورو درێژی گێڕاویەتەوه، هەندێ گێڕانەوەی ئەم فەرموودەیه، بۆ دڵنیایی تەواو، مۆری ئەموستیلەکەی پێغەمبـەری وا پێوه. ئەم بەهرانه لەم فەرموودەیه وەردەگیرێن:

دروسـته فـەرمووده بنووسـرێ، دروسـته باشـتر بـدرێ بـه زەکـات، حەنەفییـەکان ئـەم فەرموودەیـه دەکـەن بەبەڵگـه بـۆ: (دانـی بـەها لـه زەکاتـا دروسته، هەروا له کەفارەتو له سەرفترەو له عوشورو له خەراجو له نەزرا).

(بِلا رَقم)- وَعَنْهُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: أَنَّ أَبَابَكْرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: كَتَبَ لَـهُ الـتِي فَرَضَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (وَلاَ يُجْمَعُ بَيْنَ متفرِق، وَلايُفَرَّقُ بَيْنَ مُجْتَمِعٍ، خَشْيَةَ الصَّدَقَةِ). (الحديث ١٤٥٠):

**دیسان لـه ئەنەسەوە (رەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: (ئەو زەکاتە فەرزەی کەپێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بە فەرمانی خودای گەورە داینـاوە لەسـەر مسوڵمانان، ئەبوبەکری صەدیق (رەزای خوای لێ بێ) نووسی بۆم‌و کردمی بە سەرکاری سەر زەکات‌و ناردمی بۆ بەحرەین، تا بە پێی ئەو زەکاتنامەیە زەکاتەکەیان کۆبکەمەوە، لەو زەکاتنامەیەدا ئەمەی تیا نووسرابوو: (نە ماڵی جیا کۆدەکرێتەوەو، نە ماڵی کۆ جیادەکرێتەوە لە ترسی زەکات). (تاج/٢/٢٠ ف/٤).**

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

**وەك بڕیارە ئاژەڵی وردە تا نەگاتە چل سەر مەڕ، یا چل سەر بزن، زەکاتی لێ ناکەوێ، کە بوو بە چل سەر یەك سەری لێدەکەوێ، جا بۆ تێگەیشتنی تەواو لەم فەرموودەیە ئەم نموونەیە دەهێنینەوە:**

**سێ کەس، یەکی سەرو چل سەر مەڕیان هەبێ، سی سەر زەکاتیان دەکەوێ، هەریەکەی مەڕێ، بەڵام بچن بەحیلە شەرع، مەڕەکان بکەن بە یەکا، ئەوکاتە یەك سەریان دەکەوێ، گوایە هاوبەش‌و ماڵی هاوبەشیش ئاژەڵی وردە هەتا نەگاتە سەدو بیست‌و یەك، هەریەك سەریان لێدەکەوێ. ئەمە نموونەی فێڵی شەرعی کۆکردنەوە، نموونەی فێڵی شەرعی جیاکردنەوەش وەك: دوو هاوبەش دوو سەدو دوو مەڕیان هەبێ، لەکاتی وادا، سێ مەڕ زەکاتیان دەکەوێن ئەوان بچن لەکاتی زەکات لەیەك**

جیاببنەوە ئەوکاتە لەباتی سێ سەر دوو سەریان دەکەوێ.

وَفِيَ أَنَّ أَبَابَكْرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: كَتَبَ لَهُ الَّتِي فَرَضَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (وَمَا كَانَ مِنْ خَلِيطَيْنِ، فَإِنَّهُمَا يَتَرَاجَعَانِ بَيْنَهُمَا بِالسَّوِيَّةِ) (الحديث ١٤٥١):

لەگێڕانەوەیەکدا: ئەنەس (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: (ئەو زەکاتەی کە پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- دایناوە، ئەبوبەکر نووسی بۆم کە: (نە ماڵی جیا کۆدەکرێتەوەو نەماڵی کۆ جیا دەکرێتەوە لەترسیی زەکات، وەهاوبەشانیش لەناو خۆیانا، بەڕێكوپێکی کەمو زیادی دەگێڕنەوە بۆ یەکتری، هەرکەسێ بەقەد بەشی خۆی لە سەرمایەکەدا زەکات دەدا) (تاج/٢/٢٠- فـز/٤).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

بۆ نموونە: دوو هاوبەش چل سەر مەڕیان هەیە، مەڕی زەکاتی لێ دەکەوێ، گریمان سیی سەریان هی یەکێکیانەو، دە سەری هی ئەوی تریانە، مەڕە زەکاتەکە دابەش دەکرێ بەسەر چواردا، سێ چارەکی بەر ئەو هاوبەشەیان دەکەوی کە سیی سەری هەیە، چواریەکیشی بەر ئەوی تریان دەکەوێ کە دە سەری هەیە.

٦٩٥- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدرِي رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: أَنَّ أَعْرَابِيّاً سَأَلَ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ الهِجْرَةِ، فَقَالَ: (وَيحَكَ إِنَّ شَأْنَهَا شَدِيدٌ، فَهَلْ لَكَ مِنْ إِبِلٍ تُؤَدِي صَدَقَتَها؟). قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: (فَاعْمَلْ مِنْ وَرَاءِ البِحَارِ، فَإِنَّ اللهَ لَنْ يَتِرَكَ مِنْ عَمَلِكَ شَيْئاً). (الحديث١٤٥٢- أطرافه في: ٢٦٣٣، ٣٩٢٣، ٦١٦٥)[١٠٤]:

---

(١٠٤) اخرجه مسلم في الإمارة، باب: المبايعة بعد فتح مكة علي الإسلام والجهاد والخير، رقم:١٨٦٥.

ئەبوسەعیدی خودری (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: عارەبێکی دەشتەکی دەیویست کۆچ بکا بۆ مەدینە بۆلای پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) جا سەبارەت بەم بابەتە لە حەزرەتی پرسی، خۆشەویست (درودی خوای لەسەر بێ) پێی فەرموو: هاوار لەخۆت! ئەوباسە گەلێ سەختو دژوارەو ئەرکی گرانە، بەهەموو کەسێ ڕاناگیرێ، واز لەم لایەنە بێنە، بەلام ئایا وشترت هەیە، کە زەکاتیان لێ بدەی؟) گوتی: بەلێ هەمە. فەرمووی: (دە لە هەرکوێ کاری باش دەکەی بیکە، خودا دەکا کە لەو پەڕ دەریاوە دەیکەی، لە هەرلا دەیکەی جیاوازی نییە، کاری خێر هەر کاری خێرە، خودا بۆتی دەنووسیو هیچی لێ کەم ناکاتەوە). (تاج/٢/ ١٤ف-٢-ش/د/ن).

٦٩٦- عَنْ أَنَس رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ أَنَّ أَبابَكْرٍ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ كَتَبَ لَهُ فَرِيضَةَ الصَّدَقَة، التي أَمَرَ اللهُ رَسُولَهُ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَنْ بَلَغَتْ عِنْدَهُ مِنَ الإبِلِ صَدَقَةُ الجَذَعَةِ، ولَيْسَتْ عِنْدَهُ جَذَعَةُ، وَعِنْدَهُ حِقَّةٌ، فَإِنَّها تُقْبَلُ مِنْهُ الحِقَّةُ، وَيَجْعَلُ مَعَهَا شَاتَيْنِ إنِ اسْتَيْسَرَتَا لَهُ، أَوْ عِشْرِينَ دِرْهَماً، وَمَنْ بَلَغَتْ عِنْدَهُ صَدَقَةُ الحِقَةِ، وَلَيْسَتْ عِنْدَهُ الحقة، وَعِنْدَهُ الجَذَعَةُ، فَإِنَّها تُقْبَلُ مِنْهُ الجَذَعَةُ، وَيُعْطِيهِ المُصَدِقُ عِشرِينَ دِرْهَماً أَوْ شاتَيْنِ. وَمنْ بَلَغَتْ عِتنْدَهُ صَدَقَةُ الحِّقةِ وَلَيْسَتْ عِنْدَهُ إلاَّ بِنْتُ لَبُونِ، فَإِنَّهَا تُقْبَلُ مِنْهُ بِنْتُ لَبُون، وَيُعْطِي شَاتَيْنِ أَوْ عِشْرِينَ دِرْهَماً، وَمَن بَلَغَتْ صَدَقَتُهُ بِنْتَ لَبُونٍ، وَعِنْدَهُ حِقَّةٌ فإنَّهَا تُقْبَلُ مِنْهُ الحِقَّةُ، وَيُعْطِيهِ المَصدِقُ عِشْرِينَ دِرْهَمَاً أَوْ شاتَيْنِ، وَمَنْ بَلَغَتْ صَدَقَتُهُ بِنْتَ لَبُونِ وَلَيْسَتْ عِنْدَهُ، وَعِنْدَهُ بِنْتُ مَخَاضٍ، فإنَّهَا تُقبَلُ مِنْهُ بِنْتُ مَخَاضٍ، وَيُعْطِي مَعَهَا عِشْرِينَ دِرْهَماً أَوْ شَاتَيْن) (الحديث ١٤٥٣)[١٠٥]:

پێشەوا ئەنەس (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەو زەکاتە فەرزەی کەخودا

(١٠٥) راجع رقم: ٦٩٤ ج/٢ ورقم: ٦٩٦ — ج/٢ — المترجم).

دایناوه لەسەر مسوڵمانانی ئوممەتی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) ئەبوبەکر (رەزای خوای لێ بێ) بۆی نووسیمەوە لەسەر ئەم شێوەیە: (هەرکەسێ زەکاتی وشترەکانی دەیکردە وشترێکی مێچکەی چوار ساڵە، بەڵام ئەم جۆرە وشترەی نەبوو، بەڵکوو نێونە وشترێکی مێی سێ ساڵەی هەبوو، ئەوا وشترێکی مێی سێ ساڵەی لێوەردەگیرێ لەگەڵ دوو مەڕدا، یا لەگەڵ دوو بزندا، ئەگەر مەڕو بزنی هەبوو، یا لەگەڵ بیست درەم زیوی ڕووت دا. وەهەرکەسێ زەکاتەکەی دەیکردە نێونە وشترێکی مێی سێ ساڵە، بەڵام ئەوەی نەبوو، بەڵکو وشترێکی مێی چوار ساڵەی هەبوو، ئەوا ئەوەی لێوەردەگیرێ، بەڵام زەکات سێنەکە، یا بیست درەم، یا دوو مەڕ، یا دوو بزن سەرباقی دەداتەوە بەخاوەن وشترەکان، وە هەرکەسێ زەکاتەکەی دەیکردە نێونە وشترێکی سێ ساڵە، بەڵام ئەمەی نەبوو، بەڵکو پارێنە وشترێکی مێی دووساڵەی هەبوو، ئەوا ئەوەی لێوەردەگیرێ، لەگەڵ دوو مەڕ یا دووبزن، یا بیست درەم سەرباقی دەدا، وەهەرکەسێ زەکاتەکەی دەیکردە پارێنە وشترێکی مێی دوو ساڵانە، بەڵام ئەمەی نەبوو، بەڵکو نێونە وشترێکی سێ ساڵەی هەبوو، ئەوا ئەوەی لێوەردەگیرێ، بەڵام زەکات سێنەکە بیست درەم، یا دوو سەر مەڕ یادوو سەر بزن سەرباقی دەداتەوە پێی وەهەرکەسێ زەکاتەکەی دەیکردە پارێنە وشترێکی مێی دووساڵە بەڵام ئەمەی نەبوو بەڵکو گوێرەکە وشترێکی مێی یەك ساڵەی هەبوو، ئەوا ئەوەی لێ وەردەگیرێ لەگەڵ بیست درەم یا دوو مەڕ، یا دوو بزن سەرباقیدا، وە هەر کەسی زەکاتەکەی دەیکردە گوێرەکە وشتێکی مێی دووساڵەی هەبوو ئەوا ئەوەی لێوەردەگیرێ، بەڵام زەکات سێنەکە بیست درەم یادوو مەڕ، یا دوو بزن سەرباقی دەداتەوە، ئەگەر کەسێکیش گوێرەکە وشترێکی مێی یەك ساڵەی ڕێکوپێکی نەبوو، بەڵام پارێنە

وشترێکی نێرەی دوو ساڵەی هەبوو ئەوا ئەوەی لێوەردەگیرێ سەربەسەر بەبێ سەرباقی). (تاج/٢/٢١ ف/١-ب/د/ن).

٦٩٧- عَنْ أَنَسٍ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ: أنَّ أَبَابَكْرٍ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ كَتَبَ لَهُ هذا الكِتّابَ، لَمَّا وَجَّهَهُ إلَى البَحْرَيْنِ:

بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمٰنِ الرَّحِيمِ

هذِهِ فَرِيضَةُ الصَّدَقَةِ، التي فَرَضَ رَسولُ اللهِ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى المُسْلمينَ وَالتي امَرَ اللهُ بهَا رَسُولَهُ، فَمَنْ سُئِلَهَا مِنَ المُسْلمينَ عَلى وَجْهِها فَلْيُعْطِهَا، وَمَنْ سُئِلَ فَوْقَهَا فَلاَ يُعْطِ:

(في أرْبَعٍ وَعِشرينَ مِنَ الإبلِ فَمَا دُونَهَا، مِنَ الغَنَم، مِنْ كُل خَمْسٍ شَاةٌ، فَإذا بَلَغَتْ خَمْساً وَعِشرينَ إلى خَمْسٍ وَثَلاَثِين فَفيها بِنتُ مَخاضٍ أُنْثى، فإذا بَلَغَتْ سِتاً وَثَلاَثينَ إلى خَمْسٍ وَأَرْبَعينَ فَفيها بِنْتُ لَبُونٍ أُنْثى، فإذا بَلَغَتْ سِتاً وَأَرْبَعينَ إلى سِتِينَ فَفيها حِقّةٌ طَرُوقَةُ الجَمَلَ، فَإذَا بَلَغَتْ واحِدَةً وَسِتِينَ إلى خَمْسٍ وَسَبْعينَ فَفيهَا جَذَعَةٌ فإذا بَلَغَتْ (يَعْني) سِتاً وَسَبْعينَ إلى تِسْعينَ فَفيها بِنْتا لَبُونٍ فإذا بَلَغت إحْدى وَتِسْعينَ إلى عِشْرينَ وَمائةٍ فَفيهَا حِقّتَان طَرُوقَتا الجَمَلِ، فإذا زَادَتْ عَلى عِشرِينَ وَمائةٍ فَفي كلِ أرْبَعينَ بْنتُ لَبُون، وَفي كلِ خَمْسِينَ حِقةٌ، وَمَنْ لَم يَكُنْ مَعَهُ إلاّ أَرْبَعٌ مِنَ الإبل فَلَيْسَ فِيها صَدَقَةٌ إلاّ أنْ يَشاءَ رَبُّها، فإذا بَلَغَتْ خمساً مِنَ الإبلِ فَفيها شَاةٌ، وَفي صَدَقَةِ الغَنَم: في سائمَتِهَا إذا كانَتْ أربعينَ إلى عشرين وَمائةٍ شاةٌ، فإذا زادَتْ على عِشرينَ وَمائةٍ إلى مائتَيْنِ شاتان، فإذا زادَتْ على مائتين إلى ثلاثمأة فَفِيها ثَلاثُ شِيَاهٍ، فإذا زادَتْ عَلى ثلاثمأةٍ فَفي كُل مائةٍ شَاةٌ، فإذا كانَتْ سائِمةُ الرّجُلِ ناقِصَةً مِنْ أربعين شاةٌ واحِدةٌ، فَلَيْسَ فيهَا صَدَقَةٌ إلا أنْ يَشاءَ رَبُّها.

وَفِي الرِّقَّةِ رُبْعُ العُشْرِ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ إِلاَّ تِسْعِينَ وَمِائَةٍ فَلَيْسَ فِيهَا شَيْءٌ إِلاَّ أَنْ يَشَاءَ رَبُّهَا) (الحديث ١٤٥٤)[١٠٦]:

**پێشەوا ئەنەس** (رەزای خوای لێ بێ) **دەفەرموێ: ئەبوبەکر** (رەزای خوای لێ بێ) **کاتێ منی کرد بە سەرکاری سەرزەکاتی وڵاتی بەحرەین‌و ناردمی بۆئەوێ، ئەم زەکاتنامەیەی بۆ نووسیم:**

# بەناوی یەزدانی بەخشندەی میهرەبان

**ئەمە دەستووری زەکاتدانی فەرزە، کە پێغەمبەر** -درودی خوای لەسەر بێ- **بەفەرمانی خودای گەورە داینـاوە لەسەر مسوڵمانان، جا هەر مسوڵمانێ لەسەر ئەم شێوە ڕێك و پێکە داوای لێکرا ئەوا بابیدات، وە هەرکەسێ داوای زیاتری لەمە لێکرا ئەوا بازیادەکە نەدات.**

**وشتر لەپێنج سەرەوە هەتا دەگاتە بیست‌و چوار سەر، زەکاتەکەی بە مەڕ، یا بەبزن دەدرێ، لەهەموو پێنج سەر وشترێ، مەڕێ، یا بزنێ، زەکاتی لێدەکەوێ، لەدەسەر دوو مەڕ یادوو بزن، لەپازدە سەر سێ‌مەڕ، یا سێ بزن، لە بیست سەر چوار مەڕ یا چوار بزن، مەڕی زەکات دەبێ تەمەنی ساڵێکی تەواو بێ یازیاتر، بزن دەبێ تەمەنی دوو ساڵی ڕێك بێ، یا زیاتر، وەنێریش دەبێ -واتە بەران‌و سابرێنیش دەدرێن بەزەکاتدا، وەلەکەرتی نێوان دوو ژمارەیش- وەك شەش، نۆ، یاحەڤدە، یا بیست‌و سێ -هیچ ناکەوێ، بەڵام وشترەکان کەبوون بەبیست‌و پێنج سەر هەتا دەبن بەچل‌و پێنج سەر پارێنە وشترێکی مێنگەی دوو ساڵەیان زەکات لێدەکەوێ، وەکەبوون بەچل‌و شەش سەر هەتا دەبن بەشەست سەر نێونە**

(١٠٦)راجع رقم: ٦٩٤ ج/٢ ورقم: ٦٩٦ — ج/٢ — المترجم).

وشترێکی سێ ساڵەی بەرکەڵیان زەکات لێدەکەوێ، وەکەبوون بەشەستو یەك سەر هەتا دەبن بەحەفتاو پێنج سەر، وشترێکی مێی چوار ساڵەیان زەکات لێدەکەوێ، وە کەبوون بەحەفتاو شەش سەر هەتا دەبن بەنەوەد سەر، دوو پارێنە وشتری مێنگەی دوو ساڵەیان زەکات لێدەکەوێ، وەکەبوون بەنەوەدو یەك سەر هەتا دەبن بەسەدوبیست سەر دوو نێونە وشتری سێ ساڵەی بەرکەڵیان زەکات لێدەکەوێ، بەڵام کاتێ لە سەدو بیست سەر پتر بوون ئەوا لە هەموو چل سەرێ پارێنە وشترێکی مێنگەی دوو ساڵەیان زەکات لێدەکەوێ، وەلەهەموو پەنجا سەرێ نێونە وشترێکی سێ ساڵەیان زەکات لێدەکەوێ، وەهەرکەسی تەنیا چوار سەر وشتری هەبوو، ئەوە زەکاتیان لێناکەوێ، مەگەر خاوەنەکەیان بەئارەزووی خۆی زەکاتیان لێبدا.

بەڵام کەبوون بەپێنج وشتر مەڕێ یا بزنێ زەکاتیان لێدەکەوێ. زەکاتی مەڕو بزنیش -کە بەدەمی خۆیان بلەوەڕێنو بۆ دەرەوە ببرێنو بە لەوەڕی کەژ بژینو بەئالیكو ئالفی ماڵەوە نەژین- ئاوایە: کەبوون بە چل سەر هەتا دەبن بە سەدو بیست سەر مەڕێ یا بزنێ زەکاتیان لێدەکەوێ، وە کە لە سەدو بیست سەر زۆرتربوون تا دەبن بەدوو سەدسەر، دوو مەڕ یا دوو بزن زەکاتیان لێدەکەوێ، وەکە لەدوو سەد سەر زۆرتربوون هەتا دەبن بەسێ سەد سەر، سی مەڕ یاسێ بزن زەکاتیان لێدەکەوێ، وەکە لە سێ سەد سەر هەڵیان بوارد، ئەوا لەهەموو سەد سەرێ مەڕێ یا بزنێ زەکاتیان لێدەکەوێ.

بەڵام ئەگەر مەڕو بزنی پیاوێ کەبەدەمی خۆیان لە دەشتو دەر دەلەوەڕان، یەك سەریان لە چل سەر کەمتر بوو، ئەوا زەکاتیان لێناکەوێ، مەگەر خاوەنەکە یان خۆی مەیلی هەبێ.

له زيو چل يەك دەكەوێ، وە زيو هەتا نەگاتە دوو سەد درەم زەكاتی لێ ناكەوێ، مەگەر خاوەنەكەی خۆی ئارەزووی هەبێ). (تاج/٢/١٧-١+ل-٢٧ف-١).

٦٩٨-عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ أنَّ أَبَابَكْرٍ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ كَتَبَ لَهُ الَّتِي أَمَرَ اللهُ رَسولَهُ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (وَلا يُخْرَجُ فِي الصَّدَقَةِ هَرِمَةٌ وَلا ذاتُ عَوَارٍ، وَلاتَيْسٌ، إلاَّ مَاشاءَ الْمُصَدِّقُ) (الحديث: ١٤٥٥)[١٠٧]:

ئەنەس (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەو زەكاتەی كە پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- بەفەرمانی خودا دایناوە لەسەر مسوڵمانان ئەبوبەكر (رەزای خوای لێ بێ) بۆی نووسیمەوە، بەشێكی ئەمە بوو: (كە پیری ددان لە دەما نەماوو ئاژەڵی زەدەدارو نادرێن بە زەكات، هەروا سابرین و بەرانیش مەگەر بە ئارەزووی زەكاتدەر خۆی) (تاج/٢/٢٢/١-ب/د/ت/ن).

٦٩٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ: أنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمَّا بَعَثَ مُعَاذاً رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ عَلَى اليَمَنِ، قَالَ: (إنَّكَ تَقْدَمُ عَلى قَوْمٍ أَهْلِ كِتابٍ، فَلْيَكُنْ أَوَّلَ مَاتَدْعُوهُمْ إِلَيْهِ عِبادَةُ اللهِ فإذا عَرَفُوا اللهَ، فأخْبِرْهُمْ: أنَّ اللهَ قَدْ فَرَضَ عَلَيْهِمْ خَمْسَ صَلَواتَ فِي يَومِهِمْ وَلَيْلَتِهِمْ، فإذا فَعَلُوا فَأخْبِرْهُمْ أَنَّ اللهَ فَرَضَ عَلَيْهِمْ زَكاةً مِنْ أمْوَالِهِمْ وَتَرُدُّ عَلى فُقَرائِهِمْ، فإذا أطاعُوابِهَا فَخُذْ مِنْهُمْ وَتَوَقَّ. كَرائِمَ أَمْوَالِ النَّاس) (الحديث ١٤٥٨)[١٠٨]:

ئیبنو عەبباس (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- كاتێ موعازی كوڕی جەبەلی نارد بۆ یەمەن و كردی بە سەركارو مامۆستایان، پێی فەرموو: (ئەوا تۆ دەچیت بۆناو گەلێك، كەخاوەنی نامەی ئاسمانین

(١٠٧)راجع رقم: ٦٩٦- المترجم).

(١٠٨) أخرجه مسلم في الايمان، باب الدعاء الي الشهادتين وشرائع الاسلام، رقم: ١٩.

(ئـــەهلی کیتـــابن = جوولەکـــە و گـــاورن) لەچـــاوخەڵکانی تـــردا جـــۆرە شارەزاییەکیان هەیە لەئاییندا، جاکاتێ دەچیتە ناویان لەپێشا داوایان لێ بکە کە شایەتی بدەن کە هەر خودا خودایەو هەرخودای گەورە شایانی پەرستنەو بەس، وەمحمدی کوڕی عەبدوڵڵا پێغەمبەری خودایە. جاکاتێ ئەمەیان زانیو لەمە حاڵی بوونو خوایان لەسەر ئەم شێوە ڕاستو دروستە ناسی، ئەوا پێشیان ڕابگەیەنە: کە خودا (لە هەموو شەوو ڕۆژێکا) پێنج نوێژی لەسەریان داناوە، جاکاتێ بۆ ئەمەیش بە گوێیان کردی، ئەوا پێشیان ڕابگەیەنە: کەخودا زەکاتی لەسەریان داناوە، کە بەشێکی دیاریکراوە لە ماڵەکانیان، لە دەوڵەمەندەکانیان وەردەگیرێو دەدرێتەوە بە هەژارەکانیان، جاکاتێ بۆ ئەمە بەگوێیان کردیو ڕازی بوون کە بەپێی یاسانامەی خودا زەکاتی سامانەکانیان بدەن، ئەوانەکەی نایابی ماڵەکانیان هەڵبژێرێو لەباقی زەکات وەری بگری، بەڵکوو ئەوەی دەیدەن پێت لەجیاتی زەکاتی سامانەکانیان لێیان وەربگرە بەرمەجێ مەرجە سەرەکییەکانی زەکاتی تیادا بێ) (ت/٢/٤-ش/د/ت/ن).

## دانی زەکات بەخزمی پێشیاو خێرترە

٧٠٠- عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ كَانَ أَبُوطَلْحَةَ أَكْثَرَ الأَنْصَارِ بالمدينةِ مالاً مِنْ نَخْلٍ، وكانَ أَحَبَّ أَمْوَالِهِ إِلَيْهِ بَيْرُحاءُ، وَكانَتْ مُسْتَقْبِلَةَ المَسْجِدِ، وَكَانَ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَدْخُلُهَا، وَيَشْرَبُ مِنْ مَاءٍ فِيهَا طَيِّبٍ، قَالَ أَنَسٌ: فَلَمَّا أُنْزِلَتْ هذِهِ الآيَةُ: (لَنْ تَنَالُوا البِرَّ حَتَى تُنْفِقُوا مِمَّا تُحِبُّونَ). قَامَ أَبُو طَلْحَةَ إلى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: يارَسُولَ اللهِ، إنَّ اللهَ تَبارَكَ وَتَعالى يَقُولُ: (لَنْ تَنَالُوا البِرَّ حَتَى تُنْفِقوا مِمَّا تُحِبُّونَ). وَإِنَّ أَحَبَّ أَمْوَالي إلى

بَيْرُحَاءَ، وإنَّهَا صَدَقَةٍ لِلهِ، أرْجَو بِرَّهَا وَذُخْرَهَا عِنْدَ اللهِ، فَضَعْهَا يَارَسُولَ اللهِ حَيْثُ أراكَ اللهُ. قَالَ: فقالَ رَسولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : (بَخْ، ذلِكَ مَالٌ رابحٌ، ذلكَ مالٌ رابِحٌ، وَقَدْ سَمِعْتُ مَاقُلْتَ، وَإني ارى أنْ تَجْعَلَهَا في الأقربِينَ). فَقَالَ ابوطلحة: أفعَلُ يارَسُولَ اللهِ، فَقَسَمَهَا أَبُوطَلْحَةَ فِي أقارِبِهِ وَبَني عَمِهِ).(الحديث ١٤٦١- أطرافه في: ٢٣١٨، ٢٧٥٢، ٢٧٥٨، ٢٧٦٩، ٤٥٥٤، ٤٥٥٥،٥٦١١) [١٠٩]:

پێشەوا ئەنەس (رەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: لە مەدینە، ئەبوتەلحە، لەناو یاریدەدەران (انصار)دا لەهەموویان دەوڵەمەندتر بوو، بەتایبەتی باخە خورمای زۆری هەبوو، باخێ خورمای هەبوو ناوی بەیرەحا بوو، بەرابەر قیبلەی مزگەوتەکەی پێغەمبەر بوو، ئەم باخە خۆشەویستترین ماڵی بوو، کانیاوێکی سازگاری تیادا بوو، گەلێ جار پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- تەشریفی دەچوو لە ئاوەکەی دەخواردەوە.

ئەنەس (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جا کاتێ ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە: ﴿لَنْ تَنَالُوا الْبِرَّ حَتَّى تُنفِقُوا مِمَّا تُحِبُّون. آل عمران/ ٣/٩٢﴾. واتە: ناگەن بەپاداشتی زۆر چاكو خێری تەواو، هەتا سەرف دەكەن لەرێگەی خودادا، لەماڵە نایابو خۆشەویستەکانتان و، لەو نازو نیعمەتو پایەو بەهرە باشانەی کەخودا پێی داون).

ئەبوطەلحە (رەزای خوای لێ بێ) هەڵسا چوو بۆ خزمەتی پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- عەرزی کرد: قوربان! خودای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا کە نامەی خۆیەتی، دەفەرموێ: ﴿لَنْ تَنَالُوا الْبِرَّ حَتَّى تُنفِقُوا مِمَّا تُحِبُّون﴾ وەمنیش

(١٠٩) أخرجه مسلم في الزكاة، باب: فضل النفقة والصدقة علي الأقربين والزوج والاولاد، رقم: ٩٩٨.

باشترین ماڵم بەلامەوە باخی بەیرەحایە، جا ئەوا ئەو باخی بەیرەحایەم کرد بەخێر، ساخ لەبەر ڕەزای خودا، ئومێد دەکەم کەخودا بە چاکە بینووسێ بۆم، وە پاشەکەوتی بکا بۆم بۆ ڕۆژی دوایم، جاتۆیش ئەی پێغەمبەری خودا! خۆت سەرپشك بە، چۆنی بەباش دەزانی ئاوای لێ بکە، پێغەمبەریش -درودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (بەه، بەه لەم خێرە جوانە! بەڕاستی ماڵی بەسوودو خێردار ئاوا دەبێ ! تێگەیشتم دەڵێی چی، من وا بەباشی دەزانم کە بیدەی بە خزمو خوێشانی خۆت). جا ئەبوطەلحە فەرمووی: (باشە دەیکەم) ئەوسا ئەبوطەلحە دابەشی کرد بەسەر خزمو ئامۆزاکانی خۆی دا). (تاج/٢/٣٧٤/١-ش/ت).

٧٠١- عنْ أبي سَعيْد الخدري رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ خَرَجَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ في أَضْحى أَوْ فِطْرٍ، إلَى المُصَلىّ، ثُمَّ انْصَرَفَ، فَوَعَظَ النَّاسَ وَأَمَرَهُمْ بالصَّدَقةِ، فَقَالَ: (أَيُّهَا النَّاسُ تَصدَّقُوا) فَمَرَّ عَلَى النِسَاءِ، فَقَالَ: (يا مَعْشَرَ النِساءِ تَصدَّقْنَ، فإني رَيْتُكنَّ أكثَرَ أَهْلِ النَّارِ) فَقُلْنَ: وَبِمَ ذلِكَ يَارَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: (تكثِرْنَ اللعْنَ، وَتَكْفُرْنَ العَشِيرَ، مَارَأَيْتَ مِنْ نَاقِصاتِ عَقْلٍ وَدِينٍ أَذْهَبَ لِلُبِّ الرَّجُلِ الحازِمِ مِنْ إحْداكُنَّ يامَعْشَرَ النِساءِ ثُمَّ انْصَرَفَ، فَلَمَّا صارَ إلى مَنْزِلِهِ جاءَتْ زَيْنَبُ، امْرأةُ ابْنِ مَسْعُودٍ، تَسْتأْذِنُ عَلَيْهِ، فَقِيلَ: يارَسُولَ اللهِ هذِهِ زَيْنَبُ فَقَالَ: (أيُّ الزَّيانِبِ) فَقيل: أَمْرَأَةُ ابْنِ مَسْعُودٍ، قَالَ: (نَعَمْ ائْذَنُوا لَها). فَأُذِنَ لَهَا، قَالَتْ: يانَبِيَ اللهِ إنَّكَ أَمَرْتَ اليَوْمَ بالصَّدَقَةِ، وَكَانَ عِندِي حُليٌّ لي، فَأَرَدْتُ أَنْ أَتَصدَّقَ بِهِ، فَزَعَمَ ابْنُ مَسْعُودٍ، أَنَّهُ وَوَلَدَهُ أَحَقُّ مَنْ تَصدَّقْتُ بِهِ عَلَيْهِمْ، فَقَالَ النبي صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (صَدَقَ ابْنُ مَسْعُودٍ، زَوْجُكِ وَوَلَدُكِ أَحَقُّ مَنْ تَصدَّقْتِ بِهِ عَلَيْهِمْ). (الحديث ١٤٦٢)[110].

(١١٠) لم يُوافقهُ مسلمٌ علي تخريجهِ – فتح/٣ ص٤٤١- خاتمة.. المترجم) (ر: ٢٧، ٧٠٤)

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژی جەژنی قوربان – یا ڕەمەزان – بوو، پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- دەرچوو ڕۆیشت بۆ نوێژگاکە، لەوێ نوێژی جەژنی بەکۆمەڵ بۆ کردین، کەنوێژەکە تەواو بوو، دەستی کرد بە پەندو ئامۆژگاری خەڵکەکە، وە فەرمانی پێکردن بەخێرکردن، فەرمووی: (ئەی مسوڵمانینە! خێر بکەن) ئەوجا ڕۆیشت بۆ ناو ژنەکانو پێی فەرموون: (ئەی ژن گەل! خێرو خێرات بکەنو زۆریش بپاڕێنەوە، داوای لێبوردن لەخودا بکەن، چونکە من لەشەوی میعراجدا دیم کەئێوە زۆربەی خەڵکی دۆزەخ بوون !) عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خودا ! ئەوە لەبەرچی وایە؟ فەرمووی: (زۆر ڕەفو نەفرین دەکەنو سپڵەیی لەگەڵ مێرد دەکەنو چاکەی ئەوتان لەبەرچاو نییە، کەسم نەدیوە کە وەك ئێوە هەم کەم هۆشو هەم کەم ئایین بێ، کەچی لەگەڵ ئەوەیشا پیاو بەو هەموو زیرەکی و زرنگییەوە دەیخەڵەتێننو بۆڕی دەدەن).

لەپاشا پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، لەماڵەوە زەینەبی ژنی ئیبنو مەسعوود ڕۆیشت بۆ خزمەتی، ڕێخوازی کرد کە بچێ بۆ خزمەتی، عەرزیان کرد: قوربان ! زەینەب هاتووە، پرسیاری هەیە ؟ فەرمووی: (کام زەینەب) عەرزی کرا: ژنەکەی ئیبنو مەسعوود فەرمووی: (دەی ڕێگەی پێبدەن بابێ، ئیتر ڕێگەیان پێدا، گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا ! ئەمڕۆ تۆ فەرمانت فەرموو کەخێر بکەین، منیش بڕێ خشڵم هەیە، دەمەوێ کە بیکەم بەخێر، کەچی بەقسەی ئیبنو مەسعوودی مێردم بێ، ئەو خشڵە خێرە بدەم بە ئیبنو مەسعوودو بەمنداڵەکانی ئەوە خێری زۆرترە، ئایا ئەمە وایە؟ پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: (ئیبنو مەسعوود ڕاست دەکا، قسەکەی تەواوە، مێردەکەتو مناڵەکانت پێشیاوترین کەسن کەئەم خێرەیان پێبدەیت!) (ریاض/١/٢٦٢ ژ/ ٣٢٦/١٥ + تاج/١ ل/٢٦ ف/٢).

٧٠٢- عَنْ أبِي هُرَيْرةَ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ قالَ: قَالَ النبيُّ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ (لَيْسَ عَلَى المُسْلِمِ في فَرَسِهِ وَغُلامِهِ صَدَقَةٌ): (الحديث ١٤٦٣ - طرفه في ١٤٦٤)[111]:

ئەبوهورەیره (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (مسولْمان لەم دوو شتەیدا زەكاتی لەسەر نییە: لە وڵاخی بەرزەیداو لە كۆیلەیدا) واتە: وڵاخی بەرزەو كۆیلە زەكاتیان لێ ناكەوێ.

## دانی زەكات بە هەتیو و بە مێرد

٧٠٣- عَنْ أَبي سَعِيدِ الخُدْرِي رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ جَلَسَ ذَاتَ يَوْمٍ عَلَى المِنْبرِ، وَجَلَسْنَا حَوْلَهُ، فَقَالَ: (إنَّ مِمَّا أَخَافُ عليكُمْ مِنْ بَعْدِي مايُفْتَحُ عَليكُمْ مِنْ زهْرةِ الدُّنْيا وَزِينتِهَا). فَقَالَ رَجُلٌ: يَارَسُولَ اللهِ أَوَ يأتي الخَيْرُ بالشرِّ؟ فَسَكَتَ النبيُّ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ، فقيلَ لَهُ: مَاشَأْنُكَ. تَكلِمُ النبيَّ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ وَلاَيُكَلِمُكَ؟ فَرَأيْنَا أَنَّهُ يَنْزِلُ عَلَيْهِ، قالَ: فَمَسَحَ عَنْهُ الرُّحَضَاءَ فقالَ: (أيْنَ السَّائِلُ؟) وَكَأَنَّهُ حَمِدَهُ فَقَالَ: (إنه لا يأتي الخيرُ بالشّرِ، وَإنَّ مِمَّا يُنبتُ الرَّبيعُ يَقْتُلُ أَوْيُلِمُّ، إلاَّ آكِلَةَ الخَضْراءِ أكَلَتْ حَتى إذا امْتَدَّتْ خَاصِرتاها، اسْتَقْبلَتْ عَيْنَ الشمْسِ، فَثَلَطَتْ وَبَالَتْ وَرَتَعَتْ، وَإنَّ هٰذا المَالَ خَضِرَةٌ حُلْوَةٌ، فَنِعْمَ صَاحِبُ المسْلِمِ مَاأعْطى مِنْهُ المِسْكِينَ وَاليَتِيمَ وَابْنَ السبيلِ أوْ كَمَا قَالَ النبيُّ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ وإنَّهُ مَنْ يَأْخُذُهُ بِغَيْرِ حِقِهِ كَالَّذِي يَأْكُلُ وَلاَ يَشْبَعُ، ويكُونُ شَهِيداً عليه يَوْمَ القِيامَةِ). (الحديث ١٤٦٥)[112]:

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژێ پێغەمبەر (دروودی خوای

(١١١) أخرجه مسلم في الزكاة، باب: لازكاة علي المسلم في عبده وفرسه رقم: ٩٨٢.

(١١٢) أخرجه مسلم في الزكاة باب: تخوف مايخرج من زهرة الدنيا. رقم: ١٠٥٢.

لەسەر بێ‌ لەسەر دوانگەکە دانیشتو ئێمەیش لەدەوری دانیشتین، فەرمووی: (من زۆرتر لەوە مەترسیتان لێدەکەم، کەخودا لەپیتو فەڕی زەوی دەری دەهێنێ بۆتان) عەرزی کرا: مەبەست لەپیتو فەڕی زەوی چییە؟ فەرمووی: (ئەوەیە کە دەبێ بەمایەی ئارایشتو ڕەونەقی ژیانی جیهان، وەك زێڕو زیو سامانیتر. پیاوێ عەرزی کرد: قوربان! بۆچی شتیوا دەبێ کە ئەم خێرو خۆشییە ببێ بە مایەی خراپەو شەڕ!

پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێ‌ هەتا ماوەیێ ڕاماو ماتو خامۆش بوو گوتیان بە پرسیارکەرەکە: ئەوە چیتە هەر لەخۆتەوە، بەبێ ئەوە پێغەمبەر قسەت لەگەڵدا بکات، قسەی لەگەڵ دەکەی؟ خامۆشییەکەی پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێ‌ درێژەی کێشا، هەتا زەینمان بۆ ئەوە چوو کە لەم بارەیەوە سرووش (وەحی = نیگا)ی بۆ بێ، پاش ماوەیێ باراناوی ئارەقی ناوچەوانی خۆی سڕیو فەرمووی: (کوا پرسیارکەرەکە؟) وەك بڵێی پرسیارەکەیی پێخۆش بێ وابوو، پیاوەکە گوتی: قوربان! ئەمەتام، فەرمووی: (خێر هەرخێر دێنێو چاکە هەردەبێ بەهۆی چاکە، کەواتە: خێر شەڕ ناهێنێ! بەڵام ماڵی دنیا میوەیەکی شیرینو خۆشە، وەك سەوزەگیای بەهار ناسكو نازدارە، هەمووکەسێ کەم تازۆر حەزی لێ دەکا، جائەوەی کە بەشێوەیەکی ڕەوا پەیدای بکاو، لەسەر شێوەیەکی ڕەوایش جێگەی بکاتەوە، ئەوە کۆمەكو دەستگیرێکی فرەچاکە بۆی، وەلێ ئەوەی بەشێوەیەکی ناڕەوا پەیدای بکا، ئەوە وەك سکەڕۆو زەمەنبووردە وایە، هەر دەخواو هەرتێر ناخوا، دەق ماڵیش وەك سەوزەو گژوگیای بەهار وایە، ئێوە دەڵێن: گوایە گژوگیای بەهار شتی چاکەو ئاژەڵی پێدەژی، ئەمە ڕاستەو وایە، بەڵام گەلێ جاریش ئەگەر ئاژەڵ هەر بیماشێتەوەو زیادەخۆری تیا بکا، تورخەو کاپێچو ژانی پێدەکاو دەیکوژێ، یازۆری نامێنێ کە بیکوژێ،

بەلام ئاژەلی گیاخۆرکە بەدەم‌و جەم دەیخوا تاکەلەکەی هەلدێ، ئەوجا خۆی دەدا بە خۆرو دەست دەکا بەکاوێژو بەئاسایی ریخ‌و گمیزی خۆی دەکاو لەپاشدا هەمیشە لەسەر ئەم یاساو دەستووره تێهەلّ دەچێتەوە، لەگیا خواردن‌و وچان گرتنی خۆی، ئەو ئاژەلّە هیچی لێ نایەت.

لەڕاستیدا ئەم مالّە میوەیەکی سەوزو خۆشە وەهاریکارێکی چاکە، بۆ ئەو مسولّمانەی کە بەشی نەداراو هەتیوو ڕێبواری لێ دەدات، وەئەوەی کە مالّ بە نارەوا پەیدا بکا وەك ژەمەنبردە وایە، هەردەخواو تێر ناخوا، وە ڕۆژی قیامەتیش دەبێ بەشایەت لەسەری) (تاج/٢/٥٢ ف/٧ + تاج/٩/ ٢٩٤ ف/٢١).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

شێخ ئەبوحامید ـ ڕەحمەتی خودای لێ بێ ـ دەلّێ: (مالّ وەك مار وایە، کەهەم تریاقی واتیا، کە شتێکی بەکەلّکە، وەهەم ژەهری واتیا، کە شتێکی کوشندەیە، خاوەن مالّیش یا وەك مارمژی لێزان وایە، بەهۆشیارانە خۆی لە شەڕی مارەکە ڕزگار دەکاو، بەشارەزایی تریاقەکەی لێ دەردەهێنێ، یا وەك کابرایەکی گێلۆکە بەنەزانی دەیگرێ‌و پێوەی دەداو تووکی سەری با دەیبا، خوا پەنامان بدا لەشتی وا).

٧٠٤- عَنْ زَيْنَبَ امرأةِ عَبْدِاللهِ بْنِ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْها قَالَتْ: كُنْتُ فِي المَسْجِدِ، فَرَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: (تَصَدَّقْنَ وَلَوْ مِنْ حُلِيكُنَّ) وَكَانَتْ زَيْنَبُ تُنْفِقُ عَلى عَبْدِاللهِ وَأَيْتَامٍ فِي حَجْرِهَا، قَالَ: فَقَالَتْ لِعَبْدِاللهِ: سَلْ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَيَجْزِي عَنِي أَنْ أُنْفِقَ عَلَيْكَ وَعَلى أَيْتَامِي فِي حَجْرِي مِنَ الصَّدَقَةِ؟ فَقَالَ: سَلِي أَنْتِ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ،

فَأنْطَلَقتُ إلى النَّبِّي صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَوَجَدْتُ أمْرأةً مِنَ الأَنْصَارِ عَلَى البَابِ حَاجَتُهُا مِثْلُ حَاجَتِي، فَمَرَّ عَلَيْنا بِلالُ، فَقُلْنَا، سَلِ النبيَّ صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَيَجْزِي عَنِي أنْ أُنْفِقَ عَلَى زَوْجى وَأَيْتَامٍ لِي فِي حَجْرِى، وقُلْنا: تُخْبِرْنَا، فَدَخَلَ فَسَأَلَهُ، فَقَالَ: (مَنْ هُمَا) قَالَ: زَيْنَبُ، قالَ: (أيُّ الزَّيَانِبِ) قالَ: أمْرأةُ عَبْدِالله، قالَ: (نَعَمْ لَهَا أجْرانِ: أجْرُ القَرابَةِ وأجْرُ الصَّدَقَةِ) (الحديث ١٤٦٦)[١١٣].

لەپێشەوە ڕابورد بڕوانە ژمارە: (٧٠١) زەینەبی کچی عەبدوڵڵای کوڕی موعاویە، ژنی ئیبنومەسعوود بوو (رەزای خوای لێ بێ) ژنێکی دەست ڕەنگین بوو، عەبدوڵڵای مێردی دەست کورت بوو، ئەو هەتیوانەی کە لەلای بوونو خۆی بەخێوی دەکردن برازاو خوشکەزای بوون، چەندین فەرموودە لە پێغەمبەرەوە دەگێڕێتەوە، سەبارەت بەچوونی ژنان بۆ مزگەوت، بۆ جەماعەتی خەوتنان، دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بەئێمەی ژنانی فەرموو: (ئێوەی ئافرەتان کاتێ چوون بۆ مزگەوت بۆ ئامادەبوونی جەماعەتی نوێژی خەوتنان، بۆنی خۆش مەدەن لە خۆتان).

لێرەدا شتێ ڕوون دەکەینەوە، فەرموودەی دروست (حەدیسی صەحیح) و هەروا هەموو جۆرە فەرموودەیەکی تر، وەك فەرموودەی حەسەن، بایەخو نرخی تەواوی خۆی هەیە، خواه پیاو بیگێڕەتەوە خواه ژن، وەئەو مەرجانەی کە دانراون بۆ ڕاوی وەك: عەدالەت وچابگی و ثیقە یی، بۆ ژنو پیاو وەك یەکە، سەحابەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) هەموویان عادلن، ژن بن یا پیاو، وە هەموویان مەقبول الریوایەن. واتە: لە ڕیوایەتا جیاوازیی ژنو پیاو نییە.

---

(١١٣) أخرجه مسلم في الزكاة، باب: فضل النفقة والصدقة علي الاقربين وَ الأولاد..، رقم: ١٠٠٠.

٧٠٥– عَنْ أمّ سَلَمَةَ رضي الله عنها قالَتْ: قُلْتُ: يَارَسُولَ اللهِ أَلِيَ أَجْرٌ أنْ أُنْفِقَ عَلى بَني أَبي سَلَمَةَ إنَّما هُمْ بَنِيَّ ؟ فَقَالَ: (أَنْفِقِي عَلَيْهِمْ فَلَكِ أَجْرُ مَا أَنْفَقْتِ عَلَيْهِمْ). (الحديث ١٤٦٧– طرفه في ٥٣٦٩)[١١٤].

ئوم سەلەمە رەزای خوای لێ بێ دەفەرموێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! چەند منالێکم هەیە لە ئەبوسەلەمەی مێردی پێشووم، هێشتا لەهەتیوی دەرنەچوون، ئایا خێرم دەگا ئەگەر مەسرەفیان بۆ بکەم وەکی تریش خۆ ناتوانم بەرەڵاشیان بکەم بەم لاو بەم لادا، چونکە منالی خۆمن؟! فەرمووی: (مەسرەفیان بکە، ئەو مەسرەفەی بۆیان دەکەی، پاداشتی باشی هەیە بۆت).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

ئوم سەلەمە (رەزای خوای لێ بێ) ناوی هیندی کچی ئەبو ئومەیەی کوڕی موغیرەیە. لە پێشا خێزانی ئەبوسەلەمەی هەق ئامۆزای بوو، چوار منالی لە ئەبوسەلەمە هەبوو، دوو کوڕ، دوو کچ، کوڕەکانی سەلەمەو عومەر بوون، کچەکانیش دووڕڕەو زەینەب بوون، کە ئەبوسەلەمە مرد، هەرچواریان لە هەتیوی دەرنەچووبوون، ئوم سەلەمەو ئەبوسەلەمەی مێردی لە موسوڵمانە پێشینەکانن، کۆچیان کرد بۆ حەبەشە، لەحەبشەوە گەڕانەوە بۆ مەککە، لە مەککەوە کۆچیان کردەوە بۆ مەدینە. ئوم سەلەمە ژنێکی جوانی شۆخی هۆشمەندی دانا بوو، لەڕۆژیحودەیبیەدا ئەو ئاماژەی کرد بۆ پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێ کە ئیحرام بشکێنێو سەری

---

(١١٤) أخرجه مسلم في الزكاة باب فضل النفقة والصدقة علي الاقربين والزوج الاولاد...، رقم:١٠٠١.

خۆی بتاشێ، ئیتر مسوڵمانانیش ناچاردەبن کەوا بکەن، حەزرەتیش وایکرد، لە جومادای دووەمی ساڵی چواری کۆچی شووی کرد بە پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- ئوم سەلەمە بەچاوی خۆی حەزرەتی جوبرائیلی دیوە لەسەر شێوەی (دحیە الکلبی).

ئوم سەلەمە لەم زاتانەوە گێڕانەوەی هەیە: لە پێغەمبەر خۆیو لە ابو سەلەمەو فاتیمەی زەهراوە، ئەم زاتانەیش گێڕانەوەیان لەوەوەوە هەیە: دوو کوڕەکەی: سەلەمەو عومەرو زەینەبی کچیو عامیری برایو موصعەبی برازایو خیرە دایکی حەسەنی بەصرییو زۆرکەسی تریش لە ژنو لە پیاوو لە صەحابەو غەیری صەحابە، یەکەم کەژاوەنشین بوو لە ئافرەتانی مسوڵمان، کە کۆچی کردووە بۆ مەدینە. لە دەوروبەری (٦٠)ی کۆچیدا مردووە، ئەبو هورەیرە نوێژی لەسەر تەرمەکەی کردووە، دواترین کەس بوو لە هاوسەرانی پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- کە مردووە. ئوم سەلەمە دەفەرموێ: ئامادەی جەنگی خەیبەر بووم، ئەوکاتە کە مەرحەب کوژرا، گوێم لە قرچەقرچی ددانەکانی مەرحەب بوو کە بەشمشێر دەیانشکاندن.

ئەبو سەلەمەی مێردی ئوم سەلەمە ناوی عەبدوڵڵای کوڕی عەبدول ئەسەدی کوڕی هیلالی مەخزوومیيە، یازدەهەمین کەس بووە کە ئیسلام بووە، برای شیری پێغەمبەرو ئیمامی حەمزەی مامی پێغەمبەر بوو، پووەیبەی کەنیزەکی ئەبولەهەب، لەپێشا شیریدا بەحەمزە، ئەوجا بەپێغەمبەر لەپاشا بە ئەبو سەلەمە، پورزای پێغەمبەر بوو، دایکی ناوی بەررەی کچی عەبدول موتەلیب بوو، لە فەرموودەدا دەفەرموێ: (یەکەم کەس کە نامەی کرداری بەدەستی ڕاستی وەردەگرێ، ئەبوسەلەمەی کوڕی عەبدول ئەسەدە).

لەساڵی چواری کۆچیدا، لەغەزای ئوحوددا زامداردەبێ، کە دەگەڕێتەوە بۆ مەدینە زامەکەی دەکولێتەوەو دەتەقێ‌و دەمرێ. لەساڵی دووی کۆچیدا پێغەمبەر «درودی خوای لەسەر بێ» کەدەرچوو بۆ غەزوەی (العشیرة) ئەبوسەلەمەی کرد بەجێنشینی خۆی لەسەر شاری مەدینە. بۆ پترناسینی ئەم بنەماڵە پیرۆزەیە بفەرموو بڕوانە: (فەرموودەی ژمارە (٩٤، ١٠٥، ٢٠١، ٢١٠، ٢٢٣، ٢٨٤) + (تاج/٢/١٨٤/٤، تاج/١ ل/٤٩٤ + تاج/٥ ل/١٥٨ + تاج/١-١٤٦ ف/٥ ز/٣٠ + تاج/٣-٦٨ ف/٤ ز/٢٩ + ریاض/١ ل/٢٥٠ ژ/٢/٢٩٩ ز/٣٨) + (تاج/١/٥٢٠ ف/٣+٤ + تاج/٤-١٨٩/١ + ت/٤/٤٧/٢) + (تاج/٣ ل/١٣٠ ف/٢ ز/٥١، تاج/٣ ل/١٣٩ ف/٦ ز/٥٦) + (ت/٥ ل/١٢٠ ف/١٦ ز/٢٠، تاج/٥ ل/١٨٦ ف/٤).

## باسی ئایەتی

﴿وَفِي الرِّقَابِ وَالْغَارِمِينَ وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾

٧٠٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: أَمَرَ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بالصَّدَقَةِ، فَقِيلَ مَنَعَ ابْنُ جِميل، وَخالِدُ بْنُ الوَلِيدِ، وَعَباسُ بْنُ عَبْدُالمُطَلِبْ. فقال النبيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مايَنْقِمُ ابْنُ جَميلٍ إلاّ أنهُ كانَ فَقيراً فأغناهُ اللهُ وَرَسُولُهُ، وَأمّا خالِدٌ: فإنَكُمْ تَظْلِمُونَ خَالِداً، قَدِ اخْتَبَسَ أدْراعَهُ وَأعْتُدَهُ في سبيل اللهِ، وَأَمَّا العَبَّاسُ بْنُ عَبْدِ المطَّلِبِ: فَعَمُّ رَسُولِ الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَهِيَ عَلَيهِ صَدَقَةٌ وَمِثْلُها مَعَها). (الحديث ١٤٦٨)[١١٥]:

ئەبو هورەیرە «ڕەزای خوای لێ بێ» فەرمووی: پێغەمبەر «درودی خوای لەسەر بێ» فەرمانی کرد بەدانی زەکات، پێشەوا عومەر «ڕەزای خوای لێ بێ» فەرمووی: ئیبنوجەمیل‌و

(١١٥) أخرجَهُ مُسلِمٌ فِي الزَّكاةِ، باب: في تقديمِ الزكاةِ وَمَنعِها رقم: ٩٨٣.

خالیدی کوڕی وەلیدو عەبباسی کوڕی عەبدولموطەلیب، فەرمانەکەی تۆیان پێگەیشتووە، بەڵام زەکات نادەن!

پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (ئیبنو جەمیل تۆڵەی ئەوە دەستێنێ، کەلەپێش ئیسلام بوونیدا هەژار بوو، لەپیتوفەڕی ئیسلامو لەسایەی خواو پێغەمبەرەوە ئێستا دەوڵەمەندبووە، واتە: ئەم کارەی ئیبنوجەمیل ئەوپەڕی سپڵەییو پێنەزانییە. بەڵام ئێوە ناهەقی لەخالید دەکەن، چونکە ئەو تەنانەت زریەکانی و چەكو تفاقی جەنگی خۆیی تەرخان (وەقف) کردووە، لەڕێگەی خوادا، ئیتر چۆن زەکات نادات. عەبباسی کوڕی عەبدول موطەلیبیش کە هەق مامەی منە کە پێغەمبەری خودام، بەڵێنتان دەدەمێ ئەو زەکاتەی کە لە سەریەتی دەیدات، وەئەوەندەی تریش لەگەڵیدا دەبێ بدا).

## ڕوونکردنەوە:

١- گەلێجار باسی کەسێ بەخراپە دەکرێ، لەپێش ئیسلام بوونیدا، وەك زۆر لەهاوڕێیانی پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- بگرە هەندێکیان هەتا ئەو دەمەی کە ئیسلام بوون، دژایەتی ئیسلامیان کردووە، بەڵام لەپاش ئیسلامبوون یەکسەر گۆڕاونو لە دوژمنێکی سەرسەختەوە بوون بەدۆستێکی دڵسۆزی ئیسلام.

٢- هەروا جاروبار لەفەرموودەو شتیوادا، بەتایبەت لەکاتی جەرحو تەعدیلدا، باسی خراپەی هەندێ کەس دەکرێ، بگرە پێغەمبەر خۆی زەمی هەندێ کەسی کردووە، وەك ئەوە بەکابرایەکی فەرموو: (ڕێگەی پێ بدەن با بێ بۆ لام، بەڕاستی کابرایەکی زۆر بەدە).

وەك لـەم فـەرموودەیش دا پێغەمبـەر ـدروودی خوای لەسەر بێ ـ باسـی خراپیـی ئیبنوجەمیل دەكا. دەبێ لەم جۆرە شوێنانەدا هەڵوێستی ئێمـە چـی بـێ؟ وەڵام: كورتو پوخت دەبێ ئێست لەكارەكەدا بكەین، یەكسەر حوكمی ئـەو كسە بەپێی ئەو شوێنە نەدەین، بەڵكوو دەبێ چاوەڕوان بكەین، زانا گەورە پسپۆڕەكان چییان بڕیارداوە لـەو بارەیـەوە، ئێمـەیش پـەیڕەوی بڕیـاری ئـەوان بكـەین، تەنانـەت ئەگـەر زاناكـان لەناوخۆیانـدا سـەبارەت بەوكەسـە ڕایان جیاجیا بوو ئێمـە سەرپشكین ڕای كامیـان بـەهێزتر بـوو، ئـەو ڕایـە دەكەین بە سەرمەشق.

با ئیبنوجەمیل بكەین بەنموونە بۆ ئەم بابەتە:

١- قازی حوسەین ڕەحمەتی خودای لێ بێ ـ دەڵـێ: ناپـاك (منـافق) بـوە، بەقسەی ئەوبێ گوایە ئەم ئایەتە: ﴿وَمِنْهُمْ مَـنْ عَاهَـدَ اللَّهَ﴾ سـەبارەت بـەو هـاتووە، عەسقەلانی لە ئیصابەدا ئەمە بە (إدعاء) دادەنـێ، وە دەفـەرموێ: (وا بـاوو ناسراوە كە ئەم ئایەتە سەبارەت بە ثەعلەبە هاتووە).

٢- موهەللـەب ڕەحمەتی خودای لێ بێ ـ دەفـەرموێ: (ئیبنـو جـەمیل ناپـاك بـوو، لەبەرئەوە زەكاتی نەدا، بەڵام كاتێ خودا داوای تەوبەی لێكرد بەم ئایەتـە: ﴿وَمَا نَقَمُوا إِلَّا أَنْ أَغْنَاهُمُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ مِنْ فَضْلِهِ فَإِنْ يَتُوبُوا يَـكُ خَيْـراً لَهُـمْ. التوبة: ٧٤﴾

ئیبنوجـەمیل گـوتی: پـەروەردگارم داوای تۆبـەو پەشـیمانیم لێـدەكا، ئیتر تۆبەی كردو مسوڵمانێكی جوانی لێ دەرچوو.

٣- شێخی عەینی دەفەرموێ: (ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ـدروودی خوای لەسەر بێ ـ دووپـات كردنـەوەی مەدحـە لەشـێوەی زەم دا). عەسـقەلانیش هـەروا دەفەرموێ.

٤- پێشەوا نەوەوی -ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێ بێ- پشتگیری ئیبن قەصار دەکا، کە داستانەکە دەبڕێ بەسەر نەدانی خێری سوننەتداو دەڵێ: (گومانی ئەوە نابرێ بە هاوڕێیانی پێغەمبەر کە فەرز جێبەجێ نەکەن).

کەواتە: کورتو پوخت زۆرینەی فەرمایشتەکان لە بەرژەوەندی ئیبنو جەمیلە، لەبەرئەوە بەر ئەم فەرموودەیە دەکەوێ: (باسی چاکەی مردووتان بکەن و باسی خراپەیان مەکەن). ڕەزاو ڕەحمەتی خودا لە ئیبنوجەمیل بێ.

## باسی ڕووسووریی دووری لەسواڵ

٧٠٧- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: إِنَّ نَاساً مِنَ الأَنْصَارِ، سَأَلُوا رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَعْطاهُمْ، ثُمَّ سَأَلُوهُ فَأَعْطَاهُمْ، حَتَّى نَفِدَ مَا عِنْدَهُ، فَقَالَ: (مَايَكُونَ عِنْدِي مِنْ خَيْرٍ فَلَنْ أَدَّخِرَهُ عَنْكُمْ، وَمَنْ يَسْتَعْفِفْ يُعِفَّهُ اللهُ، وَمَنْ يَسْتَغْنِ يُغْنِهِ اللهُ، وَمَنْ يَتَصَبَّرْ يُصبِرْهُ اللهُ، وَمَا أُعْطِيَ أَحَدُ عَطَاءً خَيْراً وَأَوْسَعَ مِنَ الصَّبْرِ). (الحديث ١٤٦٩ – طرفه في ٦٤٧٠)[116].

ئەبوسەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: چەند کەسێ -لە یاریدەدەران (ئەنصار)- چەندجارێ داوای بەشیان لەپێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- کرد، ئەویش هەموو جارێ بەشی دەدان، تا ئەو ماڵەی کە لەلای بوو هەمووی تەواو بوو، جا فەرمووی -درودی خوای لەسەر بێ- : (ئەو ماڵو خێرو بێرەی لەلای من بێ لەئێوەی ناشارمەوە، وە من ئەوەی لەدەستم بێ لەئێوە دریغی ناکەم، وە هەرکەسێکیش خۆی بە دوور بگرێ لە ڕووزەردیی سواڵو سواڵکردن، خودا لەهەردوو جیهاندا ڕوو سوورو سەربەرزی دەکا،

(١١٦) اخرجه مسلم في الزكاة. باب فضل التعفف والصبر، رقم: ١٠٥٣.

وە هەرکەسێکیش چاوی تێربیو خۆی بێنیاز بگرێ و چاوی لەدەستی ئەمو ئەو نەبێ، خودا دەوڵەمەندو بێنیازی دەکا، وە هەرکەسێکیش دان بەخۆیا بگرێو سەبووری خۆی بدا، مسۆگەر کەخودایش سەبرو ئارامی پێدەبەخشێ، وەباشترین و گەورەترین خەلاتێ کە بەکەسێ درابێ، خەلاتو بەهرەی سەبرو ئارامگرتنە) (تاج/٢/١٤٨-ش/د/ت/ن)

٧٠٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (وَالذي نَفْسِ بَيَدِهِ لأنْ يَأخُذَ أحَدُكُمْ حَبْلَهُ، فَيَحتَطِبَ عَلى ظَهْرِهِ خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَأتِيَ رَجُلاً فَيَسْألَهُ أعْطَاهُ أَو مَنَعَهُ). وَفي رِوَايَةٍ: عَنِ الزُّبَيْرِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنِ النبي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (لأنْ يَأخُذَ أحَدُكُمْ حَبْلَهُ فَيأتي بِحُزْمَةِ الحَطَبِ عَلى ظَهرِهِ فَيبيعَهَا، فَيَكُفَّ اللهُ بِهَا وَجْهَهُ خيرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَسْألَ النَّاسَ أَعْطُوهُ أَوْ مَنَعُوهُ). (الحديث١٤٧٠- أطرافه في: ١٤٨٠، ٢٠٧٤، ٢٣٧٤ + الحديث ١٤٧١ – طرفاه في: ٢٠٧٥، ٢٣٧٤)[117]:

ئەبوهورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (سوێندم بەو کەسە کەگیانی منی بە دەستە، کەسێ لەئێوە گوریسێ هەڵبگرێو بەکۆڵ کۆڵەدار بکێشێو بیفرۆشێو خودا بیکا بەمایەی ئەوە کە خۆی پێ ڕزگار بکا لەچاو بەرەو ژێری ئەمو ئەو، ئەمەی گەلی باشترە لەوە کەبچێ دەست لە مەردوم پان بکاتەوە، ئیتر ئەو مەردومە بەشی بدەن یا بەشی نەدەن، هەر ئیش کردنەکە باشترە لە سواڵ کردنەکە !) (تاج/٢/٤٩/٣- ش/د/ت/ن).

٧٠٩- عَنْ حَكِيم بنِ حِزامٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: سَألْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى

---

(١١٧) أخرجه مسلم حديث أبي هريرة في الزكاة، باب: النهي عن المسألة ج/٧ ص١٣١ولكن لم يخرج حديث الزبير (فتح – ٣ ص٤٤١ – خاتمة – المترجم).

اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فأعْطاني ثُمَّ سَأَلْتُهُ فأعْطَاني، ثُمَّ سَأَلْتُهُ فأتاني، ثُمَّ قَالَ: (يا حَكيمُ إنَّ هذا المالَ خَضِرَةٌ حُلْوَةٌ، فَمَن، أَخَذَهُ بِسَخاوةِ نَفْسٍ بُورِكَ لَهُ فِيه، وَمَنْ أخَذَهُ بإشْرافِ نَفْسٍ لَمْ يُبارَكْ لَهُ فِيه، وَكانَ كالَّذي يأكُلُ وَلايَشْبَعُ، اَلْيَدُ العُليا خَيْرٌ مِنَ اليَدِ السُّفلَى). قَالَ حَكيمٌ: فَقُلْتُ: يارَسُولَ الله وَالذي بَعَثَكَ بِالحَقّ، لاأرْزَأُ أَحَداً بَعْدَكَ شَيْئاً حَتَّى أُفارِقَ الدُّنْيَا، فَكَانَ أَبوبَكْرٍ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ يَدْعُو حَكِيماً إلَى العَطاءِ فَيأبَى أَنْ يَقْبَلَهُ مِنْهُ، ثُمَّ إنَّ عُمَرَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ دَعَاهُ لِيُعْطِيَهُ فَأبَىَ أَنْ يَقْبَلَ مِنْهُ شَيْئاً، فَقالَ إنِّي أُشْهِدُكُمْ يا مَعْشَرَ المُسْلمِينَ عَلى حَكِيمٍ أنِّي أعْرِضُ عَلَيْهِ حَقَّهُ مِنْ هَذَا الفَيْءِ فَيأبىَ أنْ يَأخُذَهُ، فَلَمْ يَرْزَأْ حَكِيمٌ أَحَداً مِنَ النَاسِ بَعْدَ رَسُولِ الله صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتى تُوُفِّيَ). (الحديث ١٤٧٢– أطرافه في: ٢٧٥٠، ٣١٤٣، ٦٤٤١)[١١٨]:

حەکیمی کوڕی حیزام (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ داوای بەشم لە پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- کرد، ئەویش بەشی دام، دیسان داوام لێکردەوە، دیسانەوە بەشی دامەوە، هەم دیسان داوام لێکردەوە هەمدیس بەشی دامەوە، لەپاشا فەرمووی: (ئەی حەکیم! ڕاستە کە ماڵ میوەیەکی سەوزو شیرین و خۆشە، بەڵام بزانە ئەوەی بەرچاو تێربێ و دڵ تێربی وەری بگرێ، خودا بەرەکەتو و پیتو فەڕی بۆ تێ دەکاو ئەو ماڵە خێر دەداتەوە، وەلێ ئەوەی کە بە خوازەڵۆکی و چاوچنۆکی هەڵپەهەڵپی بۆدەکاو قرم و مرخی لێخۆش دەکاو چاوی تێدەبڕی تادەیسەنێ، بەشێوەیەکی وا لەوەودوایش خاوەنەکەی چاوی لەدوایەتی، ئەوە ئەو ماڵە پیتو بەرەکەتی بەحەوادا دەچێ ! ئیتر ئەوکەسە کەئەوە حاڵیەتی وەك ژەمەنبوردەی لێدێ، هەر دەخواو هەر تێرنابێ ! دیارە کەدەستی سەروو،

(١١٨) أخرجَهُ مسلمٌ في الزّكاةِ، باب: بيان أنَّ اليَدَ العليا خير... رقم: ١٠٣٥.

که دەستی خێرکەرە، یا ئەو دەستەیە کە بێز لە دەرووزە دەکاتەوە، دیارە کە دەستی سەروو لەدەستی ژێرو کەدەستی دەرووزەکەرە گەلێ باشترە).

حەکیم (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: کە ئەمەم لەخۆشەویست -دروودی خوای لەسەر بێ- ژنەوت گوتم: ئەی ڕەهبەری خودا! بەو کەسە کەتۆی کردووە بەپێغەمبەرێکی ڕاستو دروستو ڕەوانەی کردووی لەگەڵ ئەو ئایینە ڕاستو دروستەدا، ئیتر لە پاش تۆ تا لەجیهان دەردەچم شت لەکەس وەرناگرم، لەپاش حەزرەت -دروودی خوای لەسەر بێ- ئەبوبەکرو عومەر -رەزای خوایان لێ بێ- لەکاتی جێنشینی (خەلافەت)ی خۆیاندا، بەشی حەکیميان لەدەسکەوتی جەنگی (فەیا) دەدا، بەڵام حەکیم هەتا مرد بزگورێکی لەکەس وەرنەگرت، عومەریش شایەتی لێگرتو فەرموی: ئەی گەلی مسوڵمانینە! ئێوە بەشایەت بن، ئەوەتا من بەبەرچاوی ئێوەوە لەم دەسکەوتە بەشی خۆیی دەدەمێ، وەك ئەو پشکەی کەخودا بۆی داناوە، بەڵام حەکیم خۆی وەری ناگرێ). (ریاض الصالحین/٢ ل/٩٥ ژ/٣/٥٢٤ ز/٥٧).

٧١٠- عَنْ عمر بْنِ الخطاب رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ: كَانَ رَسُولَ الله صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُعْطِينى العَطَاءَ فَأقُولُ: أعْطِهِ مَنْ هُوَ أفْقَرُ إلَيْهِ مِنِي، فَقَالَ: (خُذْهُ إذا جَاءَكَ مِنْ هذا المَالِ شَيئٌ، وَأنْتَ غَيْرُ مُشْرِفٍ وَلاسائِلٍ، فَخُذْهُ وَمالا فَلا تُتْبِعْهُ نَفْسَكَ). (الحديث ١٤٧٣ – طرفاه فی: ٧١٦٣، ٧١٦٤)[١١٩]:

عومەری کوڕی خەتاب (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جاران پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- کەبەشی دەدام لە ماڵ، عەرزیم دەکرد: قوربان! بیدە بەکەسێ کە ئەو لە من زیاتر پێویستی پێی هەبێ، ئەویش -دروودی خوای لەسەر بێ- دەیفەرموو:

(١١٩) أخرجه مسلم في الزكاة باب: إباحة الاخذ لمن أعطي من غير مسألة ولا إشراف، رقم: ١٠٤٥.

(ئەی عومەر! کاتێ لەم ماڵە شتێکت پێدرا وەری بگرە، بەمەرجێ چاوی تێنەبڕی‌و خۆت داوای نەکەی، ئەگینا خۆتی تێمەگەینە). (تاج/٢/٥١/٦ - ش/ن).

٧١١- عَنْ عَبْدِالله بْنِ عُمَرَ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ النبيُّ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مايَزالُ الرَّجُلُ يَسْأَلُ النَّاسَ، حَتىَّ يأتيَ يَوْمَ القِيامَةِ لَيْسَ في وَجْهِهِ مُزعَةُ لَحْم) وَقَالَ: (إنَّ الشَّمْسَ تَدْنُو يَوْمَ القِيَامَةِ، حَتَّى يَبْلُغَ العَرَقُ نِصْفَ الأُذُن، فَبَيْنَاهُمْ كَذلِكَ اسْتَغَاثُوا بِآدمَ، ثُمَّ بِموسى، ثُمَّ بِمُحَمدٍ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (الحديث ١٤٧٤) + (الحديث ١٤٧٥ – طرفه: ٤٧١٨)[١٢٠]:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (پیاوی واتان هەیە ئەی مسوڵمانەکان! هەرخەریکی دەرووزەو سواڵکردنە، هەتا لە ڕۆژی ژینەوەدا کەدێ بۆ دیوانی خودای گەورە، بۆ لێپرسینەوە، یەك پرزۆڵە گۆشت بەڕوویەوە نامێنێ، لەو دەشتی مەحشەرەدا خودا مۆری سواڵکەریی دەنێ بەڕوویەوە، دەم و چاوی یەکپارچە ئێسقانی ڕووتی بێ‌گۆشت دەبێ! (فەرموودەی ١٤٧٤ لە فەتحول باری دا). (ریاض/٢ ل/١٠٠ ژ/٥٣٠ ز/٥٧ ف/٩ – ش).

فەرموودەکەی تر کورتەوەکراوی فەرموودەیەکی زۆردرێژە. بڕوانە: (ریاض/١ ل/٣١٢ ژ/٣٩٩ هەتا ٤٠٣ + تاج/١٠ ز/١٣٠ ف/٤، ٥، ٦، ٧، ٨) + (تاج/٢ ل/٥٢ ز/٢٠).

٧١٢- عَنْ أبي هُرَيْرَة رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (لَيْسَ المِسْكينُ الذي يُطُوفُ عَلَى النَّاسِ، تَرُدُّهُ اللُّقْمَةُ واللُّقْمَتَان، وَالتَّمْرَةُ وَالتمرتانِ، ولكن المِسْكينُ: الذي لاَيَجِدُ غِنيً يُغْنِيه، وَلايُغْطَنُ بِهِ فَيُتَصَدَّقُ عَلَيْهِ

---

(١٢٠) أخرجهُ مسلمٌ في الزّكاةِ، باب المسألة للناس، رقم: ١٠٤٠

وَلايَقُومُ فَيَسْأَلُ النَّاسَ). (الحديث ١٤٧٩)[١٢١].

ئـەبوهورەیرە (رەزای خوای ل بێ) لەپێغەمبـەرەوە -درودی خوای لەسەر بێ- دەفـەرموێ: (هەژاری بەڕاستی ئەوە نییە کە دەرگاوماڵەو ماڵ دەسووڕێتەوەو، خـەڵك خێری پێدەکەن‌و، لێرەو لەوێ بە پارووبێ، دوو پاروو، یا دەنکێ دوودەنك خورما دەستی پێوە دەنـێن و لـەکۆڵی خۆیانی دەکەنـەوە، بـەڵام هـەژاری تـەواو کـە شایـستەی دەسـگیرۆیی‌و زەکات پێدانـە، ئـەو کەسـەیە کـەخۆی ئەوەنـدەی دارایـی نییـە کەبەشـی بکـاو، کەسـیش پێـی نازانـێ تازەکـاتی بداتێ‌و دەسگیرۆیی بکا، وەخۆیـشی لەبـەر قـەدرگرتنی خـۆی ناچـێ سـواڵ لـەم و لـەو بکـا!). (ریـاض/٢ ل/١٠٤ ژ/٥٣٧ ز/٥٧ – ش + تـاج/٢ ل/٤٢ ف/٣ ز/١٨ -ش/د/ن).

## باسی خەمڵ‌و خەرساندنی بەرزە درەخت

٧١٣- عَنْ أبي حُمَيدٍ السَّاعِدِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: غزَوْنَا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ غَزْوَةَ تَبُوكَ، فَلَمَّا جَاءَ وَادِيَ القُرى، إذا امْـرَأةٌ في حَدِيقَـةٍ لَهَـا، فَقَالَ النبيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لأصْحَابِهِ: (أخْرُصُوا) وَخَرَصَ رَسُولُ الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَشَرَةَ أوْسُقٍ، فَقَالَ لَهَا: (أَحْصِي مَايَخْرُجُ مِنْهَا). فَلَمَّا أتَيْنَا تَبُوكَ قَالَ: (أَمَا، إنَّهَا سَتَهُبُّ اللَيْلَةَ رِيحٌ شَدِيدَةٌ، فَلايَقُومَنَّ أحَدٌ وَمَـنْ كَـانَ مَعَـهُ بَعِـيرٌ فَلْيَعْقِلْهُ). فَعَقَلْنَاهَا، وَهبَّتْ رِيحٌ شَدِيدَةٌ فَقَامَ رَجُلٌ فَأَلْقَتْـهُ بِجَبَـلِ طَيِـئٍ. وَأَهْـدَى مَلِكُ أيْلَةَ للنَّبِيِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ بغـاةً بَيْـضاءَ، وَكَـسَاهُ بُـرْداً وَكَتَـبَ لَـهُ بَبَحْرِهِمْ، فَلَمَّا أتى وَادِيَ القُرى قَالَ لِلْمَرْأةِ: (كَمْ جَاءَتْ حَدِقَتُكِ) قَالَتْ: عَشَرَةَ أَوْسُقٍ: خَرْصَ رَسولِ الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ فَقـالَ النَبِـيّ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ

(١٢١)أخرجه مسلم في الزكاة باب: المسكين الذي لايجد غني.. رقم: ١٠٣٩.

وَسَلَّمَ: (إني مُتَعَجِلٌ إلى المدِينَةِ فَمَنْ أرادَ مِنْكُمْ أَنْ يَتَعَجَلَ مَعي فَلْيَتَعَجَّلْ)، فَلَمَّا – قَالَ الرَّاوي كَلَمةً مَعْناها أَشْرَفَ عَلى المدينَةِ قالَ: (هذهِ طابَةٌ) فَلَمَّا رَأي أُحُداً قالَ: (هذا جَبَلٌ يُحِبُّنا وَنُحِبُّهُ، ألاَ أُخْبِرُكُمْ بَخَيرِ دُورِ الانصارِ). قَالُوا: بَلى، قالَ: (دُورُ بَنِيَ النَّحارِ، ثُمَّ دُورُبَني عَبْدِ الأشهَلِ ثُمَّ دُورُ بَنِى سَاعِدَةَ، أوْ دُورُ بَني الحارِثِ بْنِ الخَزْرَجِ، وَفي كُلّ دُورِ الأنصارِ – يَعْنس – خَيْراً). (الحديث ١٤٨١ – أطرافه في: ١٨٧٢، ٣١٦١، ٣٧٩١، ٤٤٢٢)[122]:

ئەبو حومەیدی ئەل – ساعیدی (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لە خزمەتی حەزرەتدا (رەزای خوای لێ بێ) چووین بۆ غەزای تەبووك، كەگەیشتینە وادیلقورا، ژنێ لەناو باخێكی خۆیدا بوو، پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- بەهاوڕێیانی خۆی فەرمووی: (ئادەی ئەم بەری ئەم باخە بخەملێنن) ئێمەش هەركەسەمان بەجۆرێ خەملاندمان، وەپێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- خۆی خەملاندی بەدە وەسق، وە بەژنەكەشی فەرموو: (تۆ سەرژمێری بكە، بەری باخەكە چەندەبوو ژمارەكەیمان بۆ لەبەربكە). ئەوجا ڕۆیشتین هەتا چووینە تەبووك، پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (ئاگاداربن! كە ئەمشەو بایەكی سەخت هەڵدەكا لێتان، كەستان لەوكاتەدا هەڵمەسن، هەركەسەش وشتری هەیە باتوند پێوەندی بكا) جائێمەیش وشترەكانمان ئەشكێل كرد، جابایەكی سەختی وا هەڵیكرد، پیاوێ لەوكاتەدا هەڵسا بایەكە هەڵیگرتو لەلای دووكێوەكەی طەیدا، لەوێ تووڕیدا، فروستادەی ئیبنو عەلمای شای ئەیلە نامەیەكی لە ئیبنوعەلماوە هێنا بۆ پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- لەگەڵ هێسترە ماچەیەكی سپیدا، بەدیاریی، پێغەمبەریش -درودی خوای لەسەر بێ-

---

(١٢٢) اخرجه مسلم في الحج، باب: احد جبل يحبنا ونحبه وفي الفضائل باب: في معجزات النبيِ ﷺ. رقم: ١٣٩٢، لاحظ (فتح – ٣ص٤٤١ – خاتمة) من نفي العسقلانيي لاخراج مسلم لهذا الحديث – المترجم.

نامەیەکی بۆی ناردو عەبایەکی نایابیشی بەدیاری بۆ ناردو بەپێی پەیماننامەیەکی نووسراو، بەرامبەر سەرانەیەکی دیاریکراو، لەسەر قەڵەمڕەوەکەی خۆی هێشتیەوە، جاکاتێ هاتینەوەو بۆ وادیلقورا، پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- بۆ مەسەلەی بەری باخەکە لەژنەکەی پرسی: (بەرەکەی چەند وەسق دەرچوو ؟).گوتی: دە وەسق، دەق بەقەد ئەوە کە پێغەمبەر خەملاندی. ئەوجا پێغەمیبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرموی: (من بەزوویی دەڕۆمەوە بۆ مەدینە، جا ئەوەی حەز دەکا لەگەڵ من دابێ ئەوە کەیفی خۆیەتیو ئەوەشی حەزدەکا لێرە بمێنێتەوە ئەوە بابمێنێتەوە). ئەوسا کەوتینە ڕێ، کاتێ لەدوورەوە مەدینەمان لێ دەرکەوت، پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (ئەمە طابەیە) کاتێکیش چاوی بەچیای ئوحود کەوت فەرمووی: (ئەوەیش چیای ئوحودە، ئەم کێوە ئێمەی خۆش دەوێو ئێمەش ئەومان خۆش دەوێ !). لەپاشدا فەرمووی: (ئەدی باپێتان بڵێم کە باشترین تیرەکانی یاریدەدەران (انصار) کامانەن). یاران فەرموویان بفەرموو، فەرمووی: (باشترین بنەماڵەی یاریدەدەران، کە هەموویان هەرباشن، بنەماڵەی بەنی نەجارن، ئەوجا بنەماڵەی بەنی عەبدول ئەشهەل، ئەوجا بنەماڵەی بەنی ساعیدە، ئەوجا بنەماڵەی بەنی حاریسی کوڕی خەزرەج، وەکی تریش بەشێوەیەکی گشتی تیرەو بنەماڵەو گەڕەکەکانی یاریدەدەران هەموویان هەرخێردارو خاسن). (تاج/١/٣٣١/٤ ز/١٠٣– م/ت).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

عەینی دەفەرموێ: ئەم فەرموودەیە موسلیم اخراجی کردووە. مەدینە لەپێشا ناوی یەثریب بوو، تائەندازەیێ ئاوو هەوای بۆ لاوەکی

ناسازبوو، یەثریب واتە: لۆمەو سەرزەنشت. جالەبەر ئەم واتایە پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێ ناوەکەی گۆڕیو فەرمووی: (خودای گەورە خۆی مەدینەی ناوناوە طابە) طابە وشەیەکی عەرەبییە، واتە: شارێکی خۆشو باشو سازگارو خاوەنی دانیشتوانی خاسو باش.عەسقەلانیو عەینی ڕەحمەتی خودایان لێ بێ دەفەرموون: إحصاو بۆیە وای پێ دەگوترێ، چونکە عەرەبەکان بێ سەواد بوون، وە نووسینیان باش نەدەزانی، لەبەرئەوە ژمارەیان بە وردە بەردو چەو کۆنترۆڵ دەکرد، کەپێیان دەڵێن (حصی) بۆ شارەزابوونی تەواو لەپیرۆزیی مەدینە بڕوانە: (تاج/٢ ز/١٣٨) تا دوایی.

## زەکاتی دانەوێڵەو بەرووبوومی دێمیو بەراو

٧١٤- عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (فِيمَا سَقَتِ السَّمَاءُ وَالعُيُونُ، أَوْ كَانَ عَثَرِياً العُشْرُ، وَمَا سُقِيَ بِالنَّضْحِ نِصْفُ العُشْرِ). (الحديث: ١٤٨٣)[١٢٣].

ئیبنو عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ فەرمووی: پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێ فەرمووی: (ئەوەی بەبارانو چەمو جۆگەو کانیو کارێز ئاوبدرێ، یاخود دێمی بێ، یاخود ڕەگەکەی بگاتە ئاوو پێویستی بەئاودانی ئاسایی نەبێ، ئەوەی وابێ، زەکاتەکەی دەیەکە، ئەوەیشی کە بەوڵاخی ئاو هەڵگوز، یاخود بەئاوکێش ئاو بدرێ، زەکاتەکەی نیوەی دەیەکە، کە دەکاتە بیست یەك). (تاج/٢/٢٥/٢ ز/٧).

## کاتی وەرگرتنی زەکاتی خورما کاتی ڕنینی بەرەکەیەتی

٧١٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ

---

(١٢٣) لم يُوافِقهُ مسلم علي تخريجه (فتح – ٣ص٤٤١ – خاتمة) – المترجم).

وَسَلَّمَ يُؤْتى بالتَمرِ عِنْدَ صِرامِ النَّخلِ، فَيَجِئُ هذا بِتَمْرِهِ، وَهذا مِنْ تَمْرِهِ، حَتَّى يَصيرَ عِنْدَهُ كُوماً مِنْ تَمْرٍ، فَجَعَلَ الحَسَنُ وَالحُسَيْنُ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُما يَلْعَبان بذلِكَ التَمْرِ، فَأَخَذَ أحَدُهُما تَمْرةً فَجَعَلَهُ في فِهِيه، فَنَظَرَ إِلَيْهِ رسُولَ اللهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فأخْرَجَها مِنْ فيهِ، فَقال: (أَمَا عَلِمْتَ أَنَّ آل محمدٍ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لايأكُلُونَ الصَّدَقَةَ). (الحديث ١٤٨٥ - طرفاه في: ١٤٦١، ٣٠٧٢)[١٢٤]:

ئەبو هورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جاران لەکاتی ڕنینی بەری دارخورمادا، زەکاتی خورمایان دەهێنا بۆ پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- ئەم دەیهێناو ئەو دەیهێنا، هەتا لە خزمەت پێغەمبەردا دەبوو بەخەرمانێ خورما، حەسەن‌و حوسەین -رەزای خوایان لێ بێ- یاریان بەو خورمای زەکاتە دەکرد، جا یەکێکیان دەنکێ خورمای هەلگرت‌و نایە ناو دەمیەوە، پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- سەرنجێکی داو بەپەنجەی لەدەمی دەریهێناو ئەوسا فەرمووی: (ئەوە چ عەجەب کەنازوانی خانەوادەی موحەممەد -دروودی خوای لەسەر بێ- زەکات ناخۆن). (تاج/٢/٤٦-١ ز/١٩).

## ئایا دروستە زەکاتدەر زەکاتەکەی لە زەکات وەرگر بکڕێتەوە؟

٧١٦- عَنِ عُمَرَ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ قَالَ: حَمَلْتُ عَلى فَرَسٍ في سَبيلِ اللهِ فأضَاعَهُ الذَي كَانَ عِنْدَهُ، فَأَرَدْتُ أنْ أشْتَريَهُ، وَظَنَنتُ أَنَّهُ يَبيعُهُ بِرُخصٍ فَسَأَلْتُ النَبِيّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقالَ: (لاتَشْتَرِهِ وَلاَ تَعُدْ في صَدَقَتِكَ، وَإِنْ أَعْطَاكَهُ بِدِرْهَمٍ فأِنَّ العَائِدَ في صَدَقَتِهِ كالعائِدِ في قَيْئِهِ). (الحديث ١٤٩٠ - اطرافه في: ٢٦٢٣، ٢٦٣٦، ٢٩٧٠، ٣٠٠٣)[١٢٥]:

---

(١٢٤) أخرجه مسلم في الزكاة، باب: تحريم الزكاة علي رسول الله وعلي آله..رقم: ١٠٦٩.

(١٢٥) أخرجه مسلم في الهبات، باب: كَراهةِ شراء الانسان ماتصدَق بهِ ممّن تصدّق عليهِ، رقم:١٦٢٠.

عومـەری کـوڕی خـەتاب (رەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی: ئەسـپێکم هـەبوو، لـە ڕێگەی خودادا بەخشیم بە غەزا کاریٚ، بەڵام خاوەنەکەی قـەدری نـەزانیو زۆربێ خزمەتی کرد، منیش ویـستم لێـی بکرِمـەوە، بـەزەینی خـۆم گـوتم: بە هەرزان دەیفرۆشێتەوە، چونکە تـەواو لـەڕوو لاوازی کردبـوو، بـۆ ئەمـە پرسـیارم لـە خۆشەویـست (درووودی خوای لەسەر بێ) کـرد، فـەرمووی: (نـەبیکرِەوەو نــەهیچ خێــرو بەخــشینێکی تــری خــۆت بــەپارە هــەڵبگرەوە، بــا پێبەخـشراوەکەی بـە یـەك درەمـیش بیداتـەوە پێـت، چونکە ئـەوەی کـە خێرو بەخشرای خۆی بکرِێتەوە، یا بیقەبڵێنیٚ بە پارەو بەو پارەیە هـەڵی بگرێتـەوە، وەك سـەگیٚ وایـە ڕشـانەوەی خـۆی بخواتـەوە(ریـاض/١٨٨/٤—١ ز/٢٨٥ + تاج/٢ ل/٣٦٩ ف/١ ز/١٧٨).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

لەبەرئەوەی کە لەپێشەوە لەجێگەی خۆیدا، ژیاننامەی ئیمـامی عومـەر (رەزای خوای لێ بێ) بــە هەڵــە نەنووســراوە، والێــرەدا بەســەری دەگرینــەوە: نــاوی عومــەری کــوڕی خەتابــە، قورەیــشیـیە، عەدەویــیــە، لەپــشتی هەشــتەما ڕەچــەڵەکی لەباوکــەوە دەگاتــەوە بەپێغەمبــەر (درووودی خوای لەسەر بێ) دایکـی نـاوی حەنتەمـەی کـچی هاشمـە، کەسـناوی ئـەبو حەفـصە، نازنـاوی فارووقـە، لـە عەشەرەی موبەشەرەیە، جێنشینی دووەمە، لـەپێش پێغەمبـەری (بیعثـەت) دا بە سیی ساڵ، یا بە سیازدە ساڵ لەدایك بووە، لەسەردەمی نەزانیدا پایەی نوێنەریی قورەیش بەو سپێرابوو، کـە شـەڕیٚ، هـەرایێ سـەری هەڵدەدا ئـەو دەکەوتـە نێوانیانـەوە، لەسـەرەتای ئیـسلامەوە زۆر توندوتیـژ بـوو لەگـەڵ مـسوڵمانانـدا، بـەڵام کـاتیٚ ئیـسلام بـوو مـسوڵمانێکی زۆرجـوانی لێدەرچـوو، ئیسلامبوونی دانـرا بەسـەرکەوتنێکی گـەورە بـۆ مـسوڵمانان، ئیبنومەسعوود

دەیفەرموو: (تا عومەر ئیسلام نەبوو نەماندەوێرا بەئاشکرا خودا بپەرستین).

یەکێکە لەکۆچکارە پێشینەکان، ئامادەی بەیعەتی ریزوان‌و غەزای بەدرو هەموو شەڕگەو مەڵبەندو جەنگەکانی تری پێغەمبەر بووە، یەکێ بوو لەو چەند کەسانە، کەپێغەمبەر وەفاتی‌کرد لێیان ڕازی بوو، لەپاش وەفاتی ئەبوبەکر، لەساڵی سیازدەی کۆچیدا بوو بە دووەم جێنشین، ئەم وڵاتانەو چەندین شوێنیتر لە سەردەمی ئەودا ئازادکران:

شام و عێراق و میصر، دیوان ئەو داینا، هەر ئەو مووچەی بۆ پیاوانی سوپا، بەپێی خزمەتیان بۆ ئیسلام بڕییەوە، کارە هەرەگرنگەکانی تری:

ئەو نوێژی تەراویحی لەسەر ئەم شێوەی ئێستا، لە شەوانی ڕەمەزان دا دامەزراند، مێژووی کۆچی دانا، کەهەتا ئەمڕۆ کەساڵی (١٤٢٤ ك) بەردەوامە، وە بەپشتی خوا هەتا نزیکی قیامەت هەر بەرقەراردەبێ. ئەو یەکەم کەس بوو کەنازناوی (أميرالمؤمنين: فەرمانڕەوای مسوڵمانان) ی پێ بەخشرا).

سەرەتای صەحیحی بوخاری لەناوی صەحابەکاندا بەناوی عومەر دەست پێدەکا، هەرخۆی لەناو یارانی پێغەمبەردا ناوی (عومەری کوڕی خەتاب) بووە، بەڵام بیست و چوار عومەر ناوی تر لەناو هاوڕێیانی تری پێغەمبەردا هەیە. پێشەوا عومەر (رەزای خوای لێ بێ) پیاوێکی باڵابەرزی تەواو کەڵەگەتی تێکسمڕاوی گڕانەبوو، کەڵەگەتێکی وابوو کە لەناو خەڵکا دەوەستا، دەتگوت: ئەو سوارەو ئەوان پیادەن، لەساڵی گرانی‌و برسێتییەکەدا، وازی لەخواردنی گۆشت‌و چەوری‌و خواردنی شتی خۆش هێنا، لەجیاتی ئەوە بە خواردنی ڕۆن زەیتوون ئیکتیفای دەکرد، هەتا هەست بەو ئێش‌و ئازارو سەخڵەتیە بکا، کە خەڵکانی هەژاری ئەو

ڕۆژگاره ناهەمواره هەستيان پێی کردووه، ئەوەنده جەڕەبابەی خۆی دابوو، ڕەنگی هەڵبڕسکابوو، گەرچی ڕەنگی خۆی سوورو سپی بوو، بەڵام ڕەنگی پەڕی بوو، زەرد هەڵگەڕابوو. عومەر پیاوێکی تووکن بوو، مووی خۆی دەگرتە خەنەو وسمە، عومەر چەپەوانە بوو، ڕیشی زۆر پڕبوو، لە فەرموودەو سوننەتی دروستدا مەتحی زۆری عومەر لەلایەن پێغەمبەرو یارانی پێغەمبەرەوە کراوە، پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێ دەفەرموێ: (گریمان لەپاش من پێغەمبەر ببوایە عومەر دەبوو). عومەر خەزووری پێغەمبەر بوو، باوکی حەفصەی هاوسەری پێغەمبەر بوو، باسی سەروەرییەکانی پێشەوا عومەر لەژمارە نایێ، بۆ زیادە ئاشنابوون بڕوانە: (تاج/٥/٢٠ ز/٤ + تاج/٥ ل/٢٨ ف/١+٢+٣+ ٤ تا١٢ + ز/٦ + ز/٧ + تاج/٥ ل/ ٧٥ پەراوێزی/١).

## زەکات دەشێ بەئازادکراوەکانی هاوسەرەکانی پێغەمبەر

٧١٧- عَن ابْنِ عباسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: وَجَدَ النبيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ شَاةً ميتَةً، أُعْطِيَتْهَا مَوْلاَةٌ لَميْمونَةٌ مَنَ الصَّدَقَةِ، قَالَ النبيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (هَلاَّ انتَفَعْتُمْ بِجِلْدِهَا). قالوا: إنَّهَا مَيْتَةٌ ؟ قَال: (إِنَّمَا حَرُمَ أَكْلُهَا). (الحديث ١٤٩٢ – اطرافه في: ٣٢٢١، ٥٥٣١، ٥٥٣٢)[١٢٦]:

ئیبنو عەباس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ مەڕێکیان بەزەکات دابوو بە کارەکەرێکی مەیموونەی هاوسەری پێغەمبەر، کە ئازادکراوی مەیموونە بوو، مەڕەکە مردارەوە بوو، پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێ کەلاکی مەڕەکەی دی فڕێدرابوو، پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێ کەلاکی مەڕەکەی دی فڕێدرابوو، فەرمووی: (ئەی ئەوە بۆچی کەڵکتان لەکەوڵەکەی وەرنەگرتووە ؟) گوتیان: ئاخر ئەمە مردارەوە بووە ئیتر چۆن کەڵکی لێوەربگرین ؟)

(١٢٦) اخرجه مسلم في الحيض، باب: طهارة جلود الميتة بالدباغ رقم: ٣٦٣.

فەرمووی: (تەنیا خواردنی دروست نییە، واتە: دروستە سوود لەکەوڵی مردارەوەبوو وەربیگریّ). (تاج/١/١٠٨/١).

## کەی زەکات لەزەکاتی دەردەچی

٧١٨–عَنْ أَنَسٍ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ أنَّ النبيَّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أُتِيَ بِلَحْمٍ تُصُدِقَ بِهِ عَلى بَرِيرَةَ فَقَالَ: (هُوَ عَلَيْهَا صَدَقَةٌ وَهُوَ لَنَا هَدِيَةٌ) (الحديث ١٤٩٥) – طرفه في:٢٥٧٧[127].

ئەنەس (رەزای خوای لیّ بیّ) فەرمووی: گۆشتیان هیّنا بۆ پیّغەمبەر دروودی خوای لەسەر بیّ کە بیخوات، عەرزیان کرد: ئەم گۆشتە هی صەدەقەیە، داویانە بە بەریرەی ئازادکراوی عائیشە، ئایا تۆ لیّی دەخۆی ؟ فەرمووی: (ئەمە بۆ ئەو صەدەقەیە، بەڵام بۆ ئیّمە دەبیّ بەدیاریی و لە صەدەقەیی دەردەچیّ) (تاج/٢/٤٦ ف/٣ ز/١٩ - ش/ د /ن).

یەکیّ لەگیّڕەوەکانی ئەم فەرموودەیە ئەبو داوودی طەیالیسییە، لەناو فەرموودە زانە گەورەکاندا لەپلەی (الحافظ)دا بوو، کاتیّ لە ئەسپەهان بوو، فەقیّکانی چل هەزار فەرموودەیان لەدەم ئەوەوە نووسییەوە، پەڕاوی نەدەگرت بەدەستەوە، لەساڵی ٢٠٤دا لەبەصرە کۆچی دوایی کرد.

## زەکات لە دەوڵەمەند وەردەگیریّو دەدریّ بەهەژار

٧١٩– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رسُولُ اللهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ لِمَعاذِ بْنِ جَبَلٍ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ حِينَ بَعَثَهُ إِلَى اليَمَنِ: (إِنَّكَ سَتَأتِي قَوْماً أَهْلَ

(١٢٧) أخرجه مسلم في الزكاة، باب: إباحة الهدية للنبي ﷺ. رقم: ١٠٧٤.

كِتابٍ، فإذا جِئْتَهُمْ فادْعُهُمْ إلى: أَنْ يَشْهَدُوا أنْ لا إله إلا الله وَأَنَّ محمدا رسولُ الله، فَإِنْ هُمْ أطَاعُوا لَكَ بذلِكَ فَأخْبِرْهُمْ أنَّ الله قَدْ فَرَضَ عَلَيْهِمْ خَمْسَ صَلَواتٍ في كُلِّ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ، فَإِنْ هُمْ أطاعُوا لَكَ بذلك، فَأخْبِرْهُمْ أَنَّ اللهَ قَدْ فَرَضَ عليهم صَدَقَةً، تُؤخَذُ مِنْ أَغْنيائِهِم فتُرَدُّ عَلى فُقَرائِهِمْ فَإِنْ هُمْ أطَاعُوا لَكَ بذلِكَ فَإِيَّاكَ وَكَرائِمَ أَمْوالِهِمْ، واتَّقِ دَعْوَةَ المظْلومِ فَإنَّهُ لَيْسَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ اللهِ حِجابٌ). (الحديث ١٤٩٦ – طرفه في: ١٤٥٨). له پێشەوە ڕابوورد، بڕوانە ژمارە/ ٦٩٩[128].

## نزای خێرکردن بۆ خێرکەرو زەکاتدەر

٧٢٠- عَنْ عبدِالله أبى أوْفى رَضِي اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: كَانَ النبيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا أَتَاهُ قَوْمٌ بِصَدَقَتِهِم قَالَ: (اللهم صلِ على آلِ فُلانٍ) فَأَتَاهُ أبي بِصَدَقَتِهِ، فَقَالَ: (اللهم صَلِ عَلى آلِ أبي أَوْفَى) (الحديث ١٤٩٧ – أطرافه في: ٤١٦٦، ٦٢٣٢، ٦٣٥٩)[129]:

عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئەوفا (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: باوکم یەکێك بوو لە دەستەی ئەصحابول شەجرە، واتە: دەستەی درەختەکە، کە لەژێر دار سەموورەکەدا، کە شێخەڵێ بوو لەحودەیبییە، ئەو هاوڕێیانە کەلەو ڕووداوەدا لەخزمەت پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) دابوون، پەیمانی خۆشنوودیی (بيعة الرضوان) یان لەگەڵ پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەر بێ) بەستبوو، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) دەستووری وابوو، کەکەسێ زەکاتی

---

(١٢٨) اخرجه مسلي في الايمان (عيني) انظر: (باب الدعاء الي الشهادتين وشرائع الاسلام) شرح صحيح مسلم للنووي/١ ص ١٩٦ – المترجم.

(١٢٩) أخرَجَهُ مسلم في الزكاة، باب: الدعاء لمن اتي بصَدَقتهن رقم: ١٠٧٨ (صم/٧/١٨٤ = صحيح مسلم ج/٧ ص١٨٤ بشرح النووي) – المترجم).

خۆی بۆی دەهێنا، دەیفەرموو: (اللهم صَلِ عَلى آلِ فلانٍ): خودایەڕەحمەت بڕێژە بەسەر بنەماڵەی فیسارە کەسدا). باوکیشم کە زەکاتەکەی خۆی بۆی برد، فەرمووی -دروودی خوای لەسەر بێ-: (اللهم صَلِ عَلى آلِ أبي أوْفى: خودایەڕەحمەت بڕێژە بەسەر بنەماڵەی ئەبو ئەوفادا).(تاج/٢/٣٩-٤ ز/١٧).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

بەپێی ئەم فەرموودەیە، سوننەتە بەم بێژەو ڕستەیە، زەکات وەرگر نزا بکا بۆ ئەو کەسەی کەزەکاتەکەی لێوەردەگرێ، بۆ نموونە: زانا زەکات لەدانا وەردەگرێ، سوننەتە کەزانا لەپاش وەرگرتنەکە ئەم نزایە بۆ دانا بکا: (اللهم صَلِ عَلى آلِ دانا): خودایەڕەحمەت بڕێژە بەسەر کەس وکارو بنەماڵەی دانادا). ئەمە یەکێکە لەو شوێنانە کە من پەیڕەویی سوننەتم پێ باشترە، لە پەیڕەویی مەزهەب، چونکە بەلگەی مەزهەبی بۆ داواکەیان، کە دەفەرموون: نزاکردن بۆ زەکاتدەر سوننەتە، بەلام بەم ڕستەیە نا، بەلگەکەیان لەبەلگەی عەقلییەوە نزیکترە، کە گوایە: صەلاتو سەلام هەر تایبتمەندن بەپێغەمبەرانو فروستادەکانەوە، بەلام ئەم فەرموودەیە ئەوە پووچ دەکاتەوە.

عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوئەوفا (ڕەزای خوای لێ بێ) خۆیو باوکی، لەهاوڕێیانی پێغەمبەر بوون، ئەبو ئەوفا ناوی عەلقەمەی کوڕی خالیدە، لەعەبدوڵڵاوە نەوەدو پێنج فەرموودە گێڕانەوەتەوە، بوخاری یازدە فەرموودەی لەوەوە گێڕاوەتەوە، عەبدوڵڵا یەکێکە لەو حەوت سەحابەیە کە پێشەوا ئەبو حەنیفە -ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێ بێ- بەخزمەتیان گەیشتووە، ئەوکاتە کە ئەبوحەنیفە بەخزمەت عەبدوڵڵا دەگا، ساڵی هەشتای کۆچی بووە،

ئەبوحەنیفە حەوت ساڵان بووە، کە تەمەنی فامین‌و لەشت تێگەیشتنە، کەواتە: ئەبو حەنیفە تابیعی‌یە، بەپێی فەرموودەی ساغی پێغەمبەر ـدروودی خوای لەسەر بێ ـ لەباشی‌و چاکیدا لەپلەی دووەمی چاکانی نەتەوەی ئیسلام دایە: (خَيْرُ أُمَّتِي قَرْنِي، ثُمَّ الذينَ يَلُونَهُمْ – تاج/٥/٤– ز/١). عەبدوڵڵا ئامادەی حودەیبیەو خەیبەرو مەڵبەندو شەڕگەکانی دوائەوانیش بووە، خۆی‌و باوکی لەیارانی بەیعەتی ریضوانن، عەبدوڵڵا هەتا پێغەمبەر وەفاتی کرد، لەمەدینە لەخزمەتی‌دا بوو، لەپاشا باری کرد بۆ کووفە، لەکۆتایی تەمەنیدا کوێر بووبوو، عەبدوڵڵا دەیفەرموو: شەش غەزام لەخزمەتی پێغەمبەردا کردووە، لەو غەزایانەدا لە برسانا کوللەمان دەخوارد. لە هەشتاو حەوت یا هەشتاو شەشی کۆچیدا لەکووفە مردووە، دوا هاوڕێی پێغەمبەر بووە کە لەکووفە مردووە، ئەم زاتانە فەقێی بوون: ئەبو ئیسحاقی شەیبانی‌و سەلەمەی کوڕی کهیل، (رەزای خوای لێ بێ).

## ئەوەی کەلە دەریا دەردەهێنرێ

٧٢١– عَنْ أبي هريرة رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ عن النبي صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَنَّ رَجُلاً مِنْ بَنِي إسْرائِيلَ، سَأَلَ بَعْضَ بَنِي إسرائيلَ بِأَنْ يُسلِفَهُ ألْفَ دِينَارٍ، فَدَفَعَهَا إلَيْهِ، فَخَرَجَ في البَحْرِ فَلَمْ يَجِدْ مَرْكَباً، فَأَخَذَ خَشَبَةً فَنَقَرَهَا فَأَدْخَلَ فِيهَا أَلْفَ دِينارٍ فَرَمى بِهَا في البَحْرِ، فَخَرَجَ الرَّجُلُ الذي كَانَ أسْلَفَهُ فَإذا بِالخَشَبَةِ، فَأَخَذَهَا لأَهلِهِ حَطَباً، فَذَكَرَ الحَديثَ. فَلَمَّا نَشَرَهَا وَجَدَ المالَ). (الحديث ١٤٩٨ – أطرافه في: ٢٠٦٣، ٢٢٩١، ٢٤٠٤، ٢٤٣٠، ٢٧٢٤، ٦٢٦١)[١٣٠]:

---

(١٣٠) قال العسقلاني - رحمه الله تعالي-: لم يوافقه مسلم علي تخريج هذا الحديث - (فتح - خاتمة ج/٣ ص٤٤١) - المترجم).

ئەبو هورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خۆشەویست (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (پیاوێ لە نەوەی ئیسرائیل، هەزار دیناری زێڕ، لە پیاوێکی تری بەنی ئیسرائیلی قەرز دەکا، کەکاتی دانەوەی قەرزەکە دێت، پیاوەکە دەچێ بۆ قەراخی دەریا، بەڵام پاپۆڕی دەست ناکەوێ (تا سواربێ‌و بچێ بۆلای خاوەن قەرزەکەو قەرزەکەی بداتەوە). جا لەبەرئەوە کۆتکەدارێ دەهێنێ‌و ناوەکەی هەڵدەکۆڵێ‌و نامەیێ لەخۆیەوە بۆ هاوڕێکەی دەنووسێ‌و تیادا دەنووسێ: لە فیسارە کەسەوە بۆ فیسارە کەس‌و دەیخاتە ناو کۆتکە دارەکەو هەروا هەزار دیناری زێڕی تێدەخاو لۆکی دەکاو فڕێی دەداتە ناو دەریاکەوەو دەڵێ: خودایە! خۆت ئاگات لێیەتی، قاپۆڕو کەشتی نییە، کاتی خۆشی ئەو پیاوە داوای شایەت‌و کەفیلی لێکردم، منیش شایەت‌و کەفیلم نەبوو جگە لە تۆ، جائەوا من ئەم قەرزەی سەرخۆمم بەئاوی ئەم دەریایەدا ناردەوە بۆی، ئیتر تۆیش ئارەزووی خۆتە من لەمە زیاترم لە دەست نایێ، لەو لایشەوە کابرای خاوەن قەرز دێ، هەتا بزانێ برادەرەکەی پارەکەی بۆ دێنێ، بەڵام کەس دیارنابێ، کە تەماشا دەکا کۆتکەدارەکە دەبینێ، جادەڵێ: ئەمە دەبەمەوە بۆ سووتەمەنی ئەم شەوی خێزانەکەم، جا کەلە ماڵەوە کۆتەرەدارەکە دەقڵەشێنێ پارەکەو کاغەزەکە دەدۆزێتەوە !). (تاج/١٠/٩١-٣- ب ز/٢٣).

بسم الله الرحمن الرحيم

منیش لەکۆتایی ئەم فەرموودە پیرۆزەدا، لەناو ئەم کتێبە پیرۆزەدا، بە دڵێکی پڕ پەژارەی ڕۆژگارەوە، عەرزی ئازیزانی خۆم دەکەم:

لەقورئاندا دەفەرموێ: پەپوو سلێمانە نامەی پێغەمبەر سولەیمانی

دەبرد بۆ شاژنی یەمەن، هەروا دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ. الانبياء:١٠٧﴾ وە دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مِنْ أَنْفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُمْ بِالْمُؤْمِنِينَ رَؤُوفٌ رَحِيمٌ. التوبە: ١٢٨﴾. لە فەرموودەی ساغ دا هەیە، کە بوخاری ڕەحمەتی خودای لێ بێ گێڕاویەتەوە دەفەرموێت: (ئیمانداری کاغەزێ دەنووسێت بۆ دۆستێکیو لەگەڵ سپاردەیەکا دایان دەنێ لەناو کۆتەرەدارێکاو، کۆتەرەدارەکە دەدا بەدەم ئاوی دەریاوەو دەفەرموێت: خودایەمن هەر ئەوەندەم لە تواناد‌ا هەیە، سادەی تۆیش بەڕەحمەتی خۆت ئەم نامەو ئەمانەتەم بۆ بگەیەنە بەدەستی خاوەنی، وەخودایش نامەو ئەمانەتەکە دەگەیەنێ بەدەستی دۆستەکەیو نزاکەی گیرا دەکا، لە فەرموودەی ساغیش دا دەفەرموێ: لەهەر شوێنێ سلاو لە پێغەمبەر بکرێو سلاواتی لەسەر بدرێ لەناو گۆڕەکەیدا پێی ڕادەگەیەننو ئەویش وەلامی دەداتەوە، هەروا لە صەحیحەین دا هەیە، کە هاوڕێیانی پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێ لەکاتی دووریو سەختەتیدا، داوایان لەخودا دەکرد کە سلاوو تکاو هەواڵیان ڕابگەیەنێ بەپێغەمبەری خوداو یارانی، خودایش داواو نزاکەیانی جێبەجێ دەکرد، عاصیمی کوڕی ثابیت کە سەرکردەی لقێ بوو، لەپێش شەهیدبوونیدا فەرمووی: (اللهُمَّ أَخْبِرْ عَنَّا رَسُولَكَ: ئەی خودایەهەواڵمان بەپێغەمبەرەکەت ڕابگەیەنە).

ئیمامی ئەنەس (رەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: قورئان خوێنەکان کە ژمارەیان (٧٠) کەس بوو، کاتێ گەمارۆدران، لەپێش شەهیدبوونیاندا لەخودا داوادەکەن کە سلاوو هەواڵیان بەپێغەمبەرو یارانی ڕابگەیەنێ، دەفەرموون: (بَلِغُوا عَنَّا قَوْمَنَا أَنَّا لَقِينَا رَبَّنَا، فَرِضيَ عَنَّا وَأَرْضَانا) واتە: خودایە! هەواڵی حاڵمان ڕابگەیەنە بە گەلی ئیسلام، کەوا ئێمە شادبووین

بەدیداری پەروەردگارمان، وەخودا لێمان ڕازیيە، ومڕازیشی کردووین).

لەشـەرحی پـەڕاوی (الترغیـب والترهیـب)دا، لەلاپـەڕە/ ٥١٧ دەدا، لـە بەرگی دوودا، لەباسی (خُلاصَةُ أَقْوَالِ العُلَمَـاءِ فِي حُكْـمِ الـصَّلاةِ عَلَـى النَّبـيِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دا، موناجاتێکی شیرینی حـەزرەتی عومـەەی واتیـادا کە لەگەڵ پێغەمبەردا کردوویەتی، لەپاش مەرگی پێغەمبەر ـدروودی خوای لەسەر بێـ

.

لە تەحیاتیشدا هەمووجارێك نوێژخوێن چەندجارێ بەصیغەی نیدا، لەسەر شێوەی گازکردن، خیتاب ئاڕاستەی پێغەمبـەر ـدروودی خوای لەسەر بێـ دەکاو دەڵـێ: (الـسَّلامُ عَلَيْـكَ أَيُّهَـا النَّبـيُّ وَرَحمَـةُ اللهِ وبَرَكَاتُـهُ): (سڵاوو دروودو ڕەحمـەتو هـەموو جـۆرە پیـتو پیرۆزیـی خـودات لەسـەر بێـت ئـەی پێغەمبەری خودا!).

لەباسـی ئیـسراو میعراجـدا، لەحەدیـسی صـەحیحدا هـاتووە: کـە پێغەمبـەران و شـەهیدان، لـە ژیـانی بەرزەخـدا زینـدون، تەنانـەت پێغەمبەران جەستەشیان خاك نایڕزێنێ، وەلەژیانی بەرزەخدا، هاموشۆی یەکتر دەکەن، چاویان بەیـەکتر دەکـەوێ، سڵاوو چاك و چۆنی لەیـەکتری دەکەن، دوعای باش بۆ یـەکتر دەکـەن، ڕاوێـژ بەیـەکتر دەکـەن، ئامۆژگـاری خێری یەکتر دەکەن، مشووری گەلی خۆیـان دەخـۆن، خـەمو خەفـەتیان بـۆ دەخۆن، پەرستشو عیبادەت دەکەن، حـەج دەکـەن، تـەوافی بـەیت دەکـەن، لەگۆڕەکانیانـدا نوێـژ دەکـەن، جاری وادەبـێ بـەهۆی ڕووداوی دنیاییـیـەوە دەگرین، یاخۆشحاڵ دەبن، لەشەوی ئیسرادا حەزرەتی ئیبـراهیم (سـەلامی خوای لـێ بێ) سڵاوی نارد بەپێغەمبەردا بۆ گـەلی ئیسلامو پێـی فـەرموو: ئـەی موحەممـەد! سڵاوم ڕابگەیـنـە بەگـەلی خـۆتو هـەواڵیان پـێبـدە کـە

بەهەشت خاکەکەی پاكو بەپیزو بە فەرە، ئاوەکەی شیرینە، هەمووی دەشتاییو نەرمانیە، هەرکەس دەیەوێ کە نەمامو باخی تیادا بنیژێ بۆ خۆی، با ئەم زیکرە زۆر بلێ: (سُبْحَانَ اللهِ وَالحَمْدُ للهِ وَلا إِلَهَ إلاّ اللهُ وَاللهُ أكبر!).

لەحەدیسی سەحیح دا هەیە، کە شەیخان گێراویانەتەوە، کە پێغەمبەری خودا لەشەوی ئیسراو میعراجدا قسەو گفتوگۆو ڕاوێژ لەگەڵ پێغەمبەرەکان دەکاو، ئیمامەتو بەرنوێژییان بۆ دەکات، وەبەهرە لە ئامۆژگاری حەزرەتی مووسا وەردەگرێ، هەتا ژمارەی نوێژە فەرزەکان لە پەنجاوە دەبن بە پێنج نوێژ، هەروا لە حەدیسێکی موسلیمدا حەزرەت -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: (ئەو شەوە کە چووم بۆ ئیسرا لەلای موساوە تێپەڕیم، لەلای تەپۆڵکە لمە سوورەکەدا بوو، لەناو گۆڕەکەیدا نوێژی دەکرد).

وەکی تریش پەیوەندی گیانی لەنێوانی حەزرەتو ئوممەتدا، قەت نەبڕاوەو، قەتیش نابڕێ، یەکێ لەو پەیوەندییانە، چاوپێکەوتنی حەزرەتە -دروودی خوای لەسەر بێ- بە خەو، کە لەشانی هەموو مسوڵمانێك دا هەیە، کە بەخەو بەخزمەت حەزرەت بگات، وەبەپێی فەرموودەی ساخ ئەوکەسەی کە مسوڵمان لەخەوندا دەیبینێ ئەوە پێغەمبەر خۆیەتی، ئەگەر خەونەکە مەرجی خەونی دروستی تیادا بوو، وەك لەپێشەکی ئەم کتێبە پیرۆزەدا ئاماژەمان بۆ خەونەکەی ئیمامی بوخاری کرد، کە بەپێغەمبەرەوە دیبووی، کەبوو بەهۆی دانانی صەحیحی بوخاری پیرۆز. یا ئەوەی کە لەخەوندا حەزرەتی ئیبراهیم -سەلامی خودای لێ بێ- بەدایکی ئیمامی بوخاری فەرمووی: (.. بە بەرەکەتی دوعای زۆری تۆ، خودا چاوی کوڕەکەتی چاك کردەوە..). لە پەڕاوە گەورەکانی شەریعەتدا،

چەسپاوە کە پەیوەندی گیانی لەنێوانی خۆشەویستو ئوممەتدا هەتا ڕۆژی قیامەت، بەهۆی سەلاواتدانو خەونی دروستەوە دەمێنێ. پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- بەدەق دەفەرموێ: (.. إنَّ صَلاَةَ أُمَتِي تُعْرَضُ عَلَيَّ فِي كُلِ يَوْمِ جُمُعَةٍ..) فەرموودەی کوێرەکەیش، کە پێغەمبەر خۆی -دروودی خوای لەسەر بێ- فێری نوێژی جێبەجێ بوونی مرازی کرد، فێری ئەوەیشی کرد کە لەپاش دوو ڕکات نوێژی قەزای حاجە، پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- لەلای خودا بکا بە تکاکارو دەسکەلا، وە لەخودای گەورە داوا بکا کە لەبەرخاتری پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- مرازی قەبووڵ بفەرموێ، وە لەناو پاڕانەوەی پاش نوێژەکەدا، پێغەمبەر بەدەق پێی دەفەرموێ: (... بڵێ: یا محمدُ! إنِي أَتَوَجَّهُ بِكَ إِلى رَبي فَيَقْضي حاجَتِي.. واتە: بڵێ ئەی موحەممەد! ڕوودەکەمە تۆو دەتکەم بەتکاکار، لەلای پەروەردگارم کە مرازم جێبەجێ بکا..). ئەم فەرموودەیە گەورەترین بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە داوای گیرابوونی نزاو پاڕانەوەو جێبەجێبوونی مرازو مەبەست لەلای خودا، بەهۆی پێغەمبەرەوەو لەبەرخاتری ئەو، شتێکی هەقەو ڕەوایەو لەسەردەمی پێغەمبەرەوە هەتا ئێستا بەردەوامە، وەزانا گەورەکانی فەرموودە سەبارەت بەڕشتەو پلەی بەهێزی یەکەی دەفەرموون: تیرمیزی دەفەرموێ: حەدیسێکی حەسەنی صەحیحە.

حاکم دەفەرموێ: صەحیحەو بەپێی مەرجی بوخاریو موسلیمە. تەبەرانی دەفەرموێ: حەدیسێکی صەحیحە.

پاڵفتەی مەبەست لەفەرموودەیەکی ساخ ئەمەیە: (کە سلاوات دانی زۆر لەدیداری پێغەمبەری خۆشەویست -دروودی خوای لەسەر بێ- بەتایبەتی لەوکاتە تایبەتیانەدا کە مسوڵمان تەرخانیان دەکات بۆ خواپەرستیو نوێژو زیکرویادی خودا، سلاواتدانی زۆری وا، دەبێت بەمایەی پیرۆزیی هەردوو

جیهان‌و دەبێ بەهۆی هاتنەدی ئاوات‌و، دەبێ بەرێگە چارەی ڕزگاری بوون لە هەموو سەخڵەتی‌و ناخۆشییەك‌و، دەبێ بەكلیلی حەلبوونی گشت كێشەیەكی سلاوات لێدەرەكە، مەبەست ئەمەیە كەحەزرەت دروودی خوای لەسەر بێ بەئوبەییەی كوڕی كەعب (رەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێت: (إِذَنْ يكفي همك وَيغفرلَكَ ذَنْبُكَ). تیرمذی بەرشتەیەكی ساخ گێڕاویەتەوە (تاج/١-٥١٥ ز/١٩٠ ف/١) لە ئیستعابا ابن عبدالبر دەفەرموێ: سالێ لە سەردەمی عومەردا وشكە ساڵ‌و گرانی بو، پیاوێ دەچێتە سەر قەبری پێغەمبەرو عەرزی دەكا: ئەی پێغەمبەری خودا! داوای باران لەخوا بكە بۆ ئۆممەت، خۆ وا وەختە لەبەربێ بارانی لەناوبچن، پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێ دەچێتە خەوی، دەفەرموێ: بڕۆ بۆلای عومەر پێی بڵێ: كەنوێژە بارانە بكا، بەبێگومان بارانیان فریا دەكەوێ، ئەویش وا دەكا.

ئەمە لەلایەك، وەكی تریش: سوپاس‌و ستایش بۆ خودای تاك‌و تەنیاو پاك‌و پیرۆز، كە بە میهرەبانی خۆی هیدایەتی داوین بۆ قەبووڵی ئیسلام، بۆ پەیڕەوی موحەممەد دروودی خوای لەسەر بێ بۆ خزمەتی نوری خودا، كە ئایینی پیرۆزی ئیسلامە، كە خۆی بەڵێنی تەواوكردنی ئەو نوورە درەخشانەی داوەو دەفەرموێت: (واللّهُ مُتِمُّ نُورِهِ).

قورئانیش دەفەرموێ لەبارەی ژیانی شەهیدانەوە لەجیهانی بەرزەخدا: (أَحْيَاءٌ عِنْدَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ، فَرِحِينَ بِمَا آتَاهُمُ اللّهُ مِنْ فَضْلِهِ وَيَسْتَبْشِرُونَ بِالَّذِينَ لَمْ يَلْحقُوا بِهِمْ مِنْ خَلْفِهِمْ) هەروەها دەفەرموێ: (وَيَتَّخِذُ مَا يُنْفِقُ قُرُبَاتٍ عِنْدَ اللّهِ وَصَلَوَاتِ الرَّسُول).

ئەوەتە پوختەی ئەم ئایەت‌و فەرموودانە بەڵگەی ڕۆشنن لەسەرئەوە كە پێغەمبەران دروودی خوای لەسەر بێ لەناو گۆڕەكانیاندا زیندوون‌و پەرستشی

خـودا دەكـەن‌و، قـسەو نـزای خێـر بـۆ ئـەهلی ئیمـان دەكـەن‌و، بەتـەنگی ئوممەتیانـەوە دێـن، سـەنرج بفـەرموون، كەچـۆن پێغەمبـەران لـەژیانی بەرزەخدا، بۆ بێ نازی‌و كەساسی گەلـەكانیان پەرۆشـن، لەفەرموودەیـەكی ساغی بوخاری‌و موسلیم دا دەفەرموێ: (لە شەوی ئیسرادا مووسا دەگریـا، خودا لێی پرسی: ﴿مَا أَبْكَاكَ ؟ قَالَ يَارَبِّي هَذا الغُلامُ الذِي بُعِثَ مِنْ بَعْدِي يَدْخُلُ مِنْ أُمَّتِهِ أفْضَلُ مِمَّا يَدْخُلُ مِنْ أُمَّتِي﴾. لەفەرموودەیـەكا، كەپێـشەوا تەرمذی رەحمەتی خودای لێ بێ دەیگێڕێتەوە دەفەرموێ: (ئەسما دەفـەرموێ: چووم بۆلای ئوم سەلەمە (رەزای خوای لێ بێ) ڕوانیم ئوم سـەلەمە دەگری، گوتم: خێـرە بۆچی دەگـری؟ فـەرمووی: لەخـەوما پێغەمبـەرم دی دروودی خوای لەسەر بێ خـۆڵ بەسـەرو ڕیشیەوە بـوو، عـەرزیم كـرد: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! ئـەوە چ خێرتـە بـۆ وات لێهـاتووە؟ پێغەمبـەر دروودی خوای لەسەر بێ فـەرمووی: نـەختێ لەمەوبەر بەدیار حوسەینی كوڕمەوە بووم، لەبەر چاوی خۆم كوشتیان.

جا وابەندەش لەسەر ئەم بنیاتـە داوا لـەخودای گـەورەو مـەزن دەكـەم كـە ئـەم سـڵاوات‌و تكـاو هەواڵانـەمان ڕابگەیـەنی بەپێغەمبـەری ئـازیزو خۆشەویـست دروودی خوای لەسەر بێ سـا بەشـكوو خـودا بـەلوتفی خـۆی بـەرتكاو شەفاعەتی ئەو زاتەمان بخات، ئەی خۆشەویـست! ئـەی پێغەمبـەری خـودا! دروودو سـڵاوی خـودات لــێ‌بێ، ڕەحمــەت‌و بــەرەكات‌و سـڵاوتی زۆری بێ‌شوماری خوات لەسـەر بێـت، سڵاوی فریـشتەو سـەرجەمی مـسوڵمانانت لـێ بێت، بەتایبەتی سڵاوی گەلی كوردی سـەرجەم مـسوڵمانی ستەمدیدەی ستەمبارت لـێ بێ، ئـەی موحەممـەد! ڕوودەكەمـە تـۆو دەتكـەم بـە تكاكـار لەلای پەروەردگارم كەئەم مرازەمان جێ‌بەجێ بفەرموێ: كـە لەقیامەتـداو لەگـشت مەڵبەنـدو حـاڵ‌و مـەقامێكی شـیاودا، بەسـەر بـەرزی و بـە

ڕووسووری، بەخزمەت پێغەمبەری خوداو یارە نازدارەکانی بگەین‌و، تێرتێر سەیری نووری جەماڵیان بکەین.

هەروەها بەخزمەت مامۆستاو فەقێ‌و دۆست‌و برادەرو خزم‌و کەس‌و کارو خۆشەویستانی خۆمان شادببینەوە، وە لە بەهەشتا بەتایبەتی لەخزمەتیاندا بەوپەڕی شادی‌و خۆشییەوە پێکەوە دابنیشین‌و جەخاری دەردی دووریی ئازیزان لە دڵ دەرکەین‌و، وەك جاری جاران شادو شکور ببینەوە بە یەکترو تێرتێر سەربکەینەوە سەرڕانی دایك‌و باوکمان و ئۆخەی بکەین، وە لە دنیادا تا ئاخر هەناسە بە بێ‌وەیی‌و بەخۆشی‌و بە سەربەرزی بژین‌و، داماوو کەساسی بەردەستی دۆست‌و دوژمن نەبین!

ئازیزان! ئەی ئاشقانی بەرنامە پیرۆزەکەی موحەممەد (درودی خوای لەسەر بێ) خوا یاربێ ئێمەی دوعا گۆی ئێوە لەم خزمەتی نامە پیرۆزەدا، لەهێڵی ڕاست‌و ڕەوانی قورئانی پیرۆزو، لەڕێبازی ڕاست‌و دروستی سوننەت‌و، لەشا ڕێگەی ژیاننامەو سیرەتی ڕاستەقینەی حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) دەرناچین، بەپشتی خودا لە بیدعەت‌و ئەفسانەو ئیسرائیلیات‌و شەتەحات زۆر دوور دەبین، هەقیشمان نییە بەسەر کەسانێکەوە کە هەزارو یەك شەڵتاخ‌و بوختان بۆ سەرجەمی نەتەوەو گەلی موحەممەد (درودی خوای لەسەر بێ) دەکەن‌و، بەقسەی ئەوان بێت هەرخۆیان مسوڵمانی ساخن، گوایە ئەو خەڵکەی‌تر هەمووی بیدعەتکارو شتی تری وان!

تەنانەت توسل بە پێغەمبەریش بە شیرك دادەنێن! ئەمە لەکاتێکا کە لە فەرموودەی صەحیحی بوخاریدا هەیە کە تەوەسسول بە خۆشەویستانی خودا، لەلای خودا دروستە، لە بوخاری شەریفدا دەفەرموێ: (عَنْ أَنَسَ أنَّ عُمَرَ بْنَ الخَطَّاب رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ كَانَ إذا قُحِطُوا

استَسْقَى بالعَبَاسِ بْنِ عَبْدِالمطَّلِبِ، فَقَالَ: اللَّهُمَّ إِنَّا كُنَّا نَتَوَسَّلُ إِلَيْكَ بِنَبِيِّنَا فلَتَسقِينَا وَإِنَّا نَتَوَسَّلُ إِلَيْكَ بِعَمِ نَبِيِّنَا فاسْقِنَا، قَالَ: فَيُسْقَونَ).

ئێستاش كاتی ناردنی ئەم عەریزەیەیە، كە دەینێرین بۆ خزمەتی پێغەمبەری خۆشەویست، لەخودای گەورەو سەروەر داواكارین كەبەلوتفو كەرەمی خۆی بیگەیەنێت پێی، وەدوعاو نزاكانمان گیرا بكاو، مرادمان بداو، نائومێدمان نەكاو، پێغەمبەرمان لێ ڕازی بكاو، بەر شەفاعەتو تكای ئەو زاتەمان بخاتو، لە هەردوو ژیانو لە هەردوو جیهانا تۆ تكاكارو پارێزەرمان بیت ئەی پێغەمبەری خودا، وەقورئان چەتری سەر سەرمان بێت!

بسم الله الرحمن الرحيم

سوپاس بۆ خودا، سڵاو لە حەزرەت
درووود لە یاران، ڕەحمەت لە ئوممەت
خۆشەویستی خوا، ئەحمەدی نازدار!
تا چەكەرەو چووز شین دەكا بەهار
تا بانگ دەدرێ لەدێهاتو شار
سڵاوات لە تۆ بە سەدان هەزار
تا گوڵ لە گوڵشەن دەشەكێتەوە
بە شنۆی ڕەحمەت دڵ دەشنێتەوە
شەونم بە هەتاو دەشۆرێتەوە
بارانی درووود داتكرێتەوە!
تا مەل دەخوێنێ لەسەر چڵی دار
بە شنەی باوەڕ دڵ دەبێ بێدار

بە شەو بە ڕۆژ، بێ حەدوو شومار
بۆ گیانی پاکت سڵاوی بۆندار
*_*_*_*_*_*_*_*_*_*_*

ئەی خۆشەویستی گەلی کورد زمان
ئەحمەدی سەروەر تاجی سەرسەرمان
بە قەد گەڵاو گیاو گوڵی کوردستان
بارانی ڕەحمەت بدا لە گۆڕتان
*_*_*_*_*_*_*_*_*_*_*

کۆتری نامەبەر! شنە بای ڕەحمەت
ڕابەری نێوان حەزرەت و نومەت
تکام ئەمەیە کە بەبێ زەحمەت
ئەم نامە بەری بۆ خزمەت حەزرەت:
لەپاش بەیانی عەرزی سڵاوم
ئاواتی گەورەم ئەی نووری چاوم!
بەسەیری دیدار بڕێژم چاوم
بەڵکوو ببینابێ هەتاکوو ماوم!!
قوربان! کوردێکم ئەشقی قورنانت
ئەک جارێ سەد جار بم بەقوربانت
تەشریفێ بێنە بۆ کوردستانت
دوعای بۆ بکە، دەستم دامانت
وا لە باوەشیا زۆر لە یارانت
تامەزرۆن لەبۆ میهری جارانت
وان لە ئامێزیا نوێنەری جوانت

لـــه خـــزمو دۆســـت نـــەوەو بـــاوانت!
بـــۆ كـــوردان بوونـــه چـــەتری ئەمـــانت
چـــاوەڕێن لـــەبۆ تەشـــریف هێنانـــت
كاتـــێ تـــەوابوو گەشـــتو ســـەیرانت
بمبـــه لەگـــەڵ خـــۆت بـــۆ دەركـــەوانت
كاتـــێ كـــوردێ هـــات بـــوو بەمـــیوانت
ئەگـــەر نـــەیزانی كاكـــه زمانـــت
بفـــەرموو دەبم بـــه تـــەرجومـــانت
خـــودا بمكـــاته بـــاڵ كـــەردانت
ڕۆح بـــەقوربانت، ســـەر بـــەقوربانت
چـــاو بـــەقوربانت، دڵ بـــەقوربانت!

## له گەنجینەی كۆنی دۆزراوەدا پێنج یەك هەیە

٧٢٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ : أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (العَجْمَاءُ جُبَارٌ، وَالبِئْرُ جُبَارٌ، والمَعْدِنُ جُبَارٌ، وفي الرِّكَازِ الخُمْسُ).
(الحديث ١٤٩٩ – أطرافه فى: ٢٣٥٥، ٦٩١٢، ٦٩١٣)[١٣١]:

ئـــەبو هـــورەیره (ڕەزای خـوای لێ بـێ) فـــەرمووی: پێغەمبـــەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (چـوار پـێو وەڵس ئەگـەر شتێ زامـار بكـەن، بـەبێ سووچی خاوەنەكـەیان خـوێنی نییـە، هـەروەها كـانو بیریـش ئەگـەر شـتێكیان تێكەوت، یارمان بەسەر شتێكا، خوێنی نییه، گەنجینەی كۆنی دۆزراوەیش پێنج یەكی هی زەكاته). (تاج/٢/٢٨ – ش/ت/ن).

(١٣١) اخرجه مسلم في الحدود، باب: جرح العجماء جبار.. رقم: ١٧١٠.

## باسی لێپرسینەوەی زەكات كۆكەرەوە

٧٢٣- عَنْ أَبي حميدٍ السَّاعِدِيّ رَضِي اللّٰهُ عَنْـهُ قَـالَ: أَسْـتَعْمَلَ رَسُـولَ اللهِ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَجُلاً مِنَ الأَسْدِ عَلى صَدَقَاتِ بَنى سُلَيْمٍ، يُدْعى ابْنُ اللّتْبِيَّةِ فَلَمَّا جَاءَ حَاسَبَهُ. (الحديث ١٥٠٠)[١٣٢]:

ئەبوحومەیدی ئەل - ساعیدی (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- پیاوێكی ئەسدی كرد بە سەركاری سەر زەكات، ناوی ئیبنوللوتبییە بوو، كابرا كە هاتەوە، گوتی: ئەمە هی ئێوەیەو هی زەكاتە، ئەمەیش هی خۆمە بەدیاری بۆم هاتووە!.

جا پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- سەركەوتە سەر دوانگەو ڕاوەستاو ستایش‌و سوپاسی خودای كردو، فەرمووی: ئەمە چی پێ‌دەڵێن! هەندێ سەر كار كەدەینێرم بۆ شوێنێ كە دێتەوە دەڵێ: ئەمەیان زەكاتەو هی ئێوەیە، ئەمەیشیان هی منە بە دیاری بۆم هاتووە، جائەگەر وایە ئەدیی بۆچی لەماڵی بابی، یا لەماڵی دایكی دانانیشێت، هەتا بزانێ كەدیاری بۆ دێ یا نا...) (تاج/٣/٢٩٥ ز/١٠٩ ف/١).

## باسی داخ كردنی وشتری زەكات

٧٢٤- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِـي اللّٰـهُ عَنْـهُ قَـالَ: غَـدَوْتُ إلى رَسُـولِ اللهِ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِعَبْدِ اللهِ بْنِ أَبي طَلْحَةَ لِيُحَنِّكَهُ، فَوَافَيْتُهُ في يَدِهِ المِيسَمُ يَسِمُ إِبِلَ الصَّدَقَةِ. (الحديث ١٥٠٢ - طَرَفاهُ في: ٥٥٤٢، ٥٨٢٤)[١٣٣]:

(١٣٢) أخرجه مسلم في كتاب الأمارة، باب تحريم هدايا العُمّال ج/١٢ص٢٢٠ شرح مسلم للنووي - المترجم).

(١٣٣) وافقه مسلم علي تخريجه (كاب اللباس والزينة. باب: جواز رسم الحيوان في غير الوجه ج/١٤ ص ٩٨ شرح مسلم. نووي - المترجم).

ئەنەس (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: کەدایکم عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوطەلحەی بوو، کەدایك برای منە، فەرمووی پێم: ئەی ئەنەس! ئاگات لەم کوڕەبێ، هیچی توخن نەکەوێو هیچ نەخوا هەتا دەیبەیت بۆ خزمەتی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) و مەلاشووی شیرین دەکا. ئەنەس فەرمووی: منیش سەرلەبەیانی منالەکەم برد بۆلای پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) کەچوومە خزمەتی لەناو باخێکابوو، سەردەرییەکی کێرکێری جەونی لەبەردا بوو، داخێکی بەدەستەوە بو، وشتری زەکاتی پێداخ دەکرد. (تاج/٤-١٥٢-١+٢+٣+٤ ز/٤٨).

## ٣١- باسەکانی زەکاتی سەرفیترە (أبْوابُ صَدَقَةِ الفِطْر)

٧٢٥- عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: فَرَضَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ زَكَاةَ الفِطْرِ، صَاعاً مِنْ تَمْرٍ أَوْ صاعاً مِنْ شَعِيرٍ، عَلَى العَبْدِ والحُرِ، وَالذَّكَرِ والأُنْثى، والصَّغِيرُو الكبير، مِنَ المسْلِمينَ، وَأَمَرَ بِهَا أنْ تؤَدَى قَبْلَ خُرُوجِ الناسِ إلى الصَّلاةِ. (الحديث ١٥٠٣ – أطرافه في: ١٥٠٤، ١٥٠٧، ١٥٠٩، ١٥١١، ١٥١٢)[١٣٤]:

ئیبنو عومەر (رەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) مەنێ خورما، یا مەنێ جۆ، سەرفترەی دانا لەسەر هەموو مسوڵمانێ، ئیتر بەندە بێ، یا ئازادبێ، نێرینە بێ، یا مێینە بێ، گەورە بێ یا بچووك، وەفەرمانیشی کرد: کە لەپێش ئەوەدا مەردوم بڕۆن بۆ نوێژی جەژن سەرفترەکە بدەن.

واتە: واباشە کە سەرفترە نەکەوێتە دواى نوێژی جەژن بەڵکوو لە پێشتر بدرێ). (تاج/٢/٣٤ – ش/د/ن).

(١٣٤) أخرجهُ مُسلِمٌ في الزكاة، باب: زكاة الفطر.. رقم: ٩٨٤.

٧٢٦- عَنْ ابى سعيدِ الخدرىّ رَضِي اللّٰهُ عَنْـهُ قَـالَ:كُنَّـا نُخْـرِجُ في عهـدِ رَسُولِ اللهِ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ الفِطْرِ صَاعاً مِنْ طَعَامٍ أَوْ صَـاعَاً مِـنْ شَـعِيرٍ أَو صَاعَاً مِنْ تَمْرٍ أَوْ صَاعاً مِنْ إقِطٍ أَوْ صَاعَاً مِنْ زَبيبٍ. وَقَالَ أبو سـعيد: وَكَـانَ طَعَامُنَا الشَّعيرُ وَالزبيبُ وَالأَقِطُ وَالتَمْرُ). (الحديث ١٥٠٦)[١٣٥]:

ئەبوسەعیدی خـودری (رەزای خوای لێ بێ) دەفـەرموێ: لەسـەردەمی پێغەمبـەر خۆیدا -درودی خوای لەسەر بێ- مـەنێ خۆراكمـان دەدا لـەباتی سـەرفترە، وەك: مـەنێ خورما، یامەنێ جۆ، یامـەنێ مێـووژ، یامـەنێ كەشـك) (تـاج/٢/٣٥ز — ١٥ — ش/د/ت/ن).

٧٢٧- عَنِ ابْنِ عُمَر رَضِي اللّٰهُ عَنْهُما قَالَ: فَـرَضَ رَسُـولُ اللهِ صَـلّى اللّٰـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَدَقَةَ الفِطْرِ، صَـاعاً مِـنْ شَـعيرٍ أَوْ صَـاعاً مِـنْ تَمْـرٍ، عَلَـى الـصغيرِ والكبيرِ، وَالحُرِ والمَمْلُوك. (الحـديث ١٥١٢): واتاكـەی لـە ژمـارە (٧٢٥) دا رابوورد.

## ڕاڤەو ڕوونكردنەوە:

صاع واتە: مەن. مامۆستا مەلا عەبدولكەریمی بیارە - خودا دەست بـە عەمری پیرۆزی بگرێ، لە بەرگی یەكەمی شەریعەتی ئیسلامدا لە لاپـەڕە/ ٢٢٢دا دەفـەرموێ: پێـنج وەسـق دەكاتـە سـێ سـەد صـاع، بـە پێوانـەی كـوردەواری دەكاتـە نزیكـەی چـل و پێـنج تەنەكـە. بڕوانـە: (ب/١ ژ/١٤٨ ل/١٦٧).

(١٣٥) أخرجه مسلم في الزكاة، باب: زكاة الفطر علي المسلمين من التمر والشعير، رقم: ٩٨٥.

بسم الله الرحمن الرحيم

شێخی عەسقەلان -ڕەزاو ڕەحمەتی خودای گەورەی لێبێ- لە پایانی نامە (کتاب)ی زەکاتدا، بۆمان ڕوون دەکاتەوە: کە نامەی زەکات سەدو حەفتاو دوو فەرموودەی بەرزەوە کراو (مەرفووع)ی وا تیادا، پەیوەستەکانیان سەدو نۆزدە فەرموودەن، ئەوانی تریان موتابەعەو بێڕشتەن، دووبارەبووەکانی سەد فەرموودەی ڕێکن، پاڵفتەکەیان حەفتاو دوو فەرموودەن، پەنجاو نۆ فەرمودەیان لە تەجریدەکەدا هەن لەژمارە (٦٦٦) وە هەتا ژمارە: (٧٢٤) = ٧٢٤ — ٦٦٥ = ٥٩. پێشەوا موسلیمیش -ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێبێ- گشت فەرمووده پاڵفتەکانی گێڕاوەتەوە، بێجگە لەم حەڤدەیەیان:

١. فەرموودەکەی ئەبوزەڕ، ژمارە (١٤٠٦) لەفەتح دا، لە تەجریدەکەدا نییە.
٢. فەرموودەکەی ئیبنوعومەر، سەبارەت بەڕاڤەی ئایەتی: ﴿وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ...﴾ ژمارە (١٤٠٤) لە تەجریدەکەدا نییە.
٣. فەرموودەکەی ئەبو هورەیرە: (لاتَقُومُ السَعَة حَتَّى يَكْثُرَ فيكُمُ المَالَ) ژمارە (٦٧٥ ت = ١٤١٢ف). بڕوانە پەراوێزی ژمارە: (٦٧٥) لە تەجریدەکەداو بڕوانە (صم/٧/٩٧ = شەرحی صەحیحی موسلیم نەوەوی ل — ٩٧. هەروا لەشوێنی تریش).
٤. فەرموودەکەی عەدی کوڕی حاتەم: (جاءَ رَجُلانِ أَحَدُهُمَا يَشْكُو العَيْلَةَ) ژمارە (٦٧٦ ت = ١٤١٣ف). بڕوانە پەراوێزی ژمارە: (٦٧٦ت = ١٤١٣ ف + ریاض/١- ژ = ١٣٩/٢٣ ز/١٣).
٥. فەرموودەکەی عائیشە (رەزای خوای لێ بێ) : (أَيُّنَا أَسْرَعُ لُحوقاً بِكَ) ژمارە: (٦٨١ ت = ١٤٢٠ ف)، بڕوانە: ژمارە (٦٨١) هەروا: (صم/١٦/٨- باب فضائل أم المؤمنين زينب — كتاب فضائل الصحابة).
٦. فەرموودەکی مەعنی کوڕی یەزید: (٦٨٣ت = ١٤٢٢ف).

٧. فەرموودەکەی ئەبوبەکری صەدیق (فِي إِيثَارِهِ بِمَالِهِ) لە تەجریدەکەدا نییە، معلقە، بێ ڕشتەیە، لەنێوانی ژمارە/١٤٢٥ و ١٤٢٦دایە.

٨. ئەبو هورەیرە: (خير الصدقة عَنْ ظَهْرِ غِنى) ژمارە: (١٤٢٦ – ف) لە تەجریدەکەدا نییە.

٩. ئەنەس لە ئەبوبەکرەوە لەبابەت نووسینەوەی زەکاتەوە ژمارە: (٦٩٤ت = ١٤٤٨ف).

١٠. ئیبنو عومەر: (لايجمع بين متفرق ولايفرق بين مجتمع) ژمارە: (١٤٥٠ فتح) لەتەجریدەکەدا ژمارەی بۆ دانەنراوە، وا لەدوا ژمارە (٦٩٤)ەوە.

١١. ئەبو سەعیدی خودری، داستانەکەی زەینەبی ژنی ئیبنو مەسعوود، ژمارە (٧٠١ت = ١٤٦٢ف).

١٢. فەرموودەکەی ئەبولاس: (حَمَلَنَا النبيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى إِبِلِ الصَّدَقَةِ للحَج) بێ ڕشتەو بێ ژمارەیە، لە تەجریدەکەدا نییە، لە فەتحەکەدا وا لەنێوانی ژمارە (١٤٦٧) و (١٤٦٨)ەوە.

١٣. زوبەیر: (لأَنْ يأخُذَ أَحَدُكُمْ حَبْلَهُ فَيَحْتَطِب)، ژمارە: (١٤٧١ ف) لە تەجریدەکەدا نییە.

١٤. سەهلی کوڕی سەعد، ژمارە: (٧١٣ت = ١٤٨١ف) بڕوانە پەراوێزی ژمارە/٧١٣ لەتەجریدەکەدا.

١٥. ئیبنو عومەر (فِيما سَقَتِ السَّمَاءُ العَشْرُ) ژمارە: (٧١٤ ت = ١٤٨٣ف).

١٦. فەضلی کوڕی عەبباس لەبارەی نوێژ لەناو ماڵی کابەدا لە تەجریدەکەدا نییە، بێ ڕشتەیە وا لەدوا ژمارە/ ١٤٨٣ەوە لە فەتحەکەدا.

١٧. ئەبو هورەیرە داستانی کۆتەرە دارەکەو ئەمانەتەکە، ژمارە: (٧٢١ت = ١٤٩٨ف).

ماموستای عەسقەلان دەیفەرموێ: (لەم نامەیەدا بیست بیستراو (أثر) یشی واتیادا، کە لە هاوڕێیانی پێغەمبەرو پەیڕەوان (سەحابەو تابیعین)ە وە، گێڕدراونەتەوە.

# ٣٢- نامەی حەج (كِتَابُ الحَجّ)

(تێبینی: نامەی حەج لە ریاض الصالحین دا وا لە بەرگی سێ دا ل/١٨٩ بەشی کوردی).

## ١- باسی گەورەیی‌و پێویستبوونی حەج
## باب: وجوب الحج وفضله

٧٢٨- عَنْ عَبْدِاللهِ بْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ قالَ: كَانَ الفَضْلُ رَدِفَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَجَائَتِ امْرَأَةٌ مِنْ خَثْعَمَ، فَجَعَلَ الفَضْلُ يَنْظُرُ إِلَيْهَا وَتَنْظُرَ إِلَيْهِ، وَجَعَلَ النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَصرِفُ وَجْهَ الفَضْلِ إلى الشِقِ الآخَرِ، فَقَالَتْ: يَارَسُولَ اللهِ، إِنَّ فَرِيضَةَ اللهِ عَلى عِبادِهِ فِي الحَجّ أَدْرَكَتْ أَبِي شَيْخاً كَبِيراً، لايَثْبتُ عَلَى الرَّاحِلَةِ، أَفأَحُجُّ عَنْهُ. قَالَ: (نَعَمْ). وَذلِكَ فِي حَجَّةِ الوَدَاعِ. (الحديث ١٥١٣- اطرافه فی: ١٨٥٤، ١٨٥٥، ٤٣٩٩، ٦٢٢٨)[١٣٦]:

عەبدوللای کوڕی عەباس (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: فەضلی برام، لە حەجی مالاوایی دا، لەپاشکۆی پێغەمبەردا بوو، لەوکاتەدا ژنێ لەهۆزی خەزعەم هات، پرسیاری هەبوو، فەضل دەستی کرد بە تەماشاکردنی ژنەکە، ژنەکەیش دەستی کرد بە تەماشاکردنی فەچل، جاپێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- دەستی نا بەرووی فەضلەوەو بەرچاوی گرت، تا ڕێگەی تەماشاکردنی بگرێ. ژنەکە گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! حەج کە فەرزی خودایە لەسەر بەندەکانی، کەوتۆتە سەر باوکم، لەحاڵێکا کە پیرەمێردێکی ئیختیاری وایە، خۆی بەسەر ولاخەوە ناگرێ، جا ئایا مرۆڤی پەککەوتووی وا حەجی لەسەر دەمێنێ؟ وە ئەگەر لەسەری

(١٣٦) أخرجه مسلم في الحج، باب: الحج عَنِ العاجز.. رقم: ١٣٣٤.

دەمێنێ ئاشکرایە کەخۆی ناتوانێ حەج بکا، جا ئایا دەبێ کە من لە باتی خۆی حەجی بۆ بکەم؟ پێغەمبەر ـدرودی خوای لەسەر بێـ فەرموی: (ئا، حەجی لەسەر دەمێنێ، وەدەیش بێ کە تۆ حەجی بۆ بکەی!) ئەم پرسیارو وەڵامەیش لەکاتی حەجی ماڵاواییدا بوو. (تاج/٢/١٥٤ ف/٧+ ل/١٥٦ ز/٨٠+ ل/٢٣١).

ئەم بەهرانە لەم فەرموودەیە وەردەگیرێن:

١- حەج فەرزە

٢- کاتێ حەج لەسەر کەسێ پێویست بوو، ئەگەر لەبەر هۆیەکی ڕەوا خۆی نەیدەتوانی حەج بکا، دەبێ وەکیل حەجێ بگرێ، حەجی بۆ بکا. بۆیە دەگوترێ: حەجی ماڵاوایی، چونکە پێغەمبەر لەم حەجەدا ماڵاوایی لە موسوڵمانان کرد.

فەضلی کوڕی عەباس هەق ئامۆزای پێغەمبەرە، برای هەقی ئیبنو عەباسە، کوڕی گەورەی عەباسە، لە غەزای مەککەو غەزای حونەیفا لە خزمەت پێغەمبەردا بوو، لەحەجی ماڵاوایدا پێغەمبەر ـدرودی خوای لەسەر بێـ بۆ ڕێزلێنان لە پاشکۆی خۆیەوە سواری کردبوو، لەکاتی شۆردنی تەرمی پیرۆزی پێغەمبەردا، عەلیو فەضل و ئوسامەی کوڕی زەید شۆردیان، هەرئەوانیش دایان هێڵایە ناو قەبرەکەیەوە، عەلی تەرمەکەی دەشۆردو فەضل ئاوەکەی دەکرد بە دەستیدا. فەضل پیاوێکی قژجوانی سپیلکەی قۆزبوو. زۆرکەس لەوەوە فەرموودەی گێڕاوەتەوە، وەك عەبدوڵڵای برایو ئەبو هورەیرەو تەنانەت عەباسی باوکیشی یەك فەرموودەی لەوەوە گێڕاوەتەوە. پێغەمبەر ـدرودی خوای لەسەر بێـ خۆی ژنی بۆ هێناو، خۆی مارەییشی بۆدا، یەك کچی لەدوا بەجێما، ناوی ئومکولثوم بوو، شووی کرد بە

حەسەنی کوڕی عەلی، لەپاش ئەو شووی کرد بەئەبوموسای ئەشعەری. ڕا جیایی‌یەکی زۆر هەیە لەبارەی مێژووی مەرگیەوە، وادەردەکەوێ ئیبنوعەباس ئەم فەرموودەی لە فەضل وەرگرتبێ (بڕ: ت/٢/١٧٢-٥).

لێرەدا ئاماژە بۆ خاڵێکی گرنگ، لەهەندێ لایەنی ژیانی هاوڕێیانی پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێ دەکەین، کە ئەویش ئەمەیە: (لە سوننەتو سیرەتدا چەسپاوە، کەگوناه، کەم تا زۆر لەناو یارانی پێغەمبەردا بووە، هەیانبووە نەزەری حەرامی کردووە، وەك ئەمەی فەزڵو ئەم ژنە، هەیانبووە ماچی لە ژن سەندووە، هەیانبووە دزی کردووەو دەستی لەسەر دزی بڕاوە، هەیانبووە داوێنپیسی کردووەو لەسەر داوێنپیسی داری حەددی لێدراوە، هەیانبووە بادەی نۆشیوەو حەددی بادەنۆشی لێدراوە.

بەڵام ئەم جۆرە شتانە نابێ بکرێن بە مەهانە بۆ تانەدان لێیان، ئەوەی کەگومانی تیادا نییە: هاوڕێیانی پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێ باشترین چینی نەتەوەی ئیسلام بوون وەئەم جۆرە گوناهانە کاتی بووە، بەرەبەرە تەوبەیان لێکردووە، بەهۆی ئامادە بوونی مەجلیسی پێغەمبەرەوەو جێبەجێکردنی فەرمانەکانی خوداوە، هەموویان گەیشتوونەتە پلەی یەقینو باوەڕی تەواو، وەهەموو دادپەروەرو عادڵ بوون. کورتو پوخت نابێ ئێمە کوێرانە ئەم جۆرە هەڵوێستانەیان بکەین بە ئەیارەو پێوەر، چونکە ئەنجامی کاری ئەم زاتانە بەس زانا گەورەکان دەیزانن).

٧٢٩- عنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَرْكَبُ رَاحِلَتَهُ بِذِي الْحُلَيْفَةِ، ثُمَّ يُهِلُّ حِينَ تَسْتَوِي بِهِ قَائِمَةً. (الحديث ١٥١٤ – طرفه في: ١٦٦)[١٣٧]:

---

(١٣٧) أخرجَهُ مُسلِمٌ في الحَجِ، باب: الاهلالِ من حَيثُ تَنبعِثُ بهِ راحِلتهُ رقم ١١٨٧.

ئیبنوعومەر (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: جاران پێغەمبەر کەوڵاخەکەی سەری دەخستە سەر کێوی بەیدا، لەلای مزگەوتەکەی ژولحولەیفە ڕادەوەستا، ئەنجا ئیحرامی دادەبەست، واتە: نێتی چوونە ناو حەجی دەهێنا بەگوتنی ئەم گوتەیە: (لَبَّيْكَ اللهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيكَ لاشَرِيْكَ لَكَ، لَبَّيْكَ إنَّ الحَمْدَ والنِعْمَةُ لَكَ، وَالمُلْكَ لاشَرِيكَ لَكَ). (ت/٢/١٧٠ ف١).

٧٣٠- عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ : أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَجَّ على رَحْلٍ وَكَانَتْ زامِلَتَهُ. (الحديث ١٥١٧):

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) لە حەجی ماڵاوایدا، بەسواری وشترێکی بێ کەژاوە حەجی کرد، لەسەر کورتانێکی ڕووتەوە، بارو بنەکەشی لەهەمان وشتر نرابوو.

## ڕاڤەو ڕوونکردنەوە:

دەستووری دەوڵەمەندانو گەورە پیاوانو ئاغاو بەگەکان لە سەفەردا وایە، بۆ کەشخەییو ڕابواردن سواری کەژاوە دەبن، وەبارو بنەکەشیان دەنێن لە وشترێکی یەدەك کەپێی دەڵێن بارەبەر، لە عەرەبیدا بە وشتری سواری دەڵێن: (راحلة) بە وشتری باریش دەڵێن: (زاملة = بارەبەر: بارکێش).

جا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) لەبەربێ هەوایی، وشتری سوارییەکەی کۆپانێکی ئاسایی سادەی پێوە بوو، وەهەمان وشتر تفاقی سەفەرکەیشی هەڵ دەگرت.

٧٣١- عَنْ عائِشَةَ أُمِ المُؤمِنينَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْها أَنَّها قالَتْ: يارَسُولَ اللهِ، نَرَى الجِهَادَ أفْضَلَ العَمَلِ، أَفَلاَ نُجَاهِدُ ؟ قَالَ: (لا، لَكُنَّ أَفْضَلُ الجِهَادِ حَجٌّ

مَبْـرُورُ). (الحـديث ١٥٢٠ – أطرافـه فـي: ١٨٦١، ٢٧٨٤، ٢٨٧٥، ٢٨٧٦)[١٣٨]:

دایکی مسوڵمانان عائیشەی کچی ئەبوبەکری صدیق (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئێمە خەبات‌و غەزاکردن بەباشترین کردەوە دەزانین، چونکە ئەوەندە بەزۆری لەقورئان‌و سوننەتدا، باسی گەورەیی دەکرێ، جا ئایا ئێمەی ژنانیش وەك پیاوان نەچین بۆ غەزاو خەباتگێڕان؟ فەرمووی -درودی خوای لەسەر بێ- : (نەو، چونکە بۆ ئێوەی ژنان حەجی باش گەورەترین غەزاو خەباتە). (تاج/٢/١٤٩ – ب/ن).

٧٣٢– عَنْ ابى هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ قَالَ: سَمِعْتُ النبيَّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يقُولُ: (مَنْ حَجَّ للهِ فَلَمْ يَرْفُثْ وَلَمْ يَفْسُقْ، رَجَعَ كَيَوْمِ ولَدَتْهُ أُمُّهُ). (الحديث ١٥٢١ – طرفاه في: ١٨١٩، ١٨٢٠)[١٣٩].

ئەبوهورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەگوێی خۆم لە زاری پیرۆزی پێغەمبەرم -درودی خوای لەسەر بێ- بیست دەیفەرموو: (هەرکەسێ بۆ خودا، حەجێ بکاو، لەکاتی کردنی حەجەکەدا، پارێز لەکەیف کردن لەگەڵ ژندا بکاو، گورێز لە هەرزەگۆیی‌و قسەی پڕوپووچ بکاو، گوناه نەکا، ئەوە وەك ئەو ڕۆژەی کە لەدایك بووە، لەگوناه پاك دەبێتەوە). (تاج/٢/١٤٩ + ریاض/٣/٩٣٣ ز/٢٣٣).

٧٣٣– عَنِ ابْنِ عَباسٍ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ قَالَ: إنَّ النبيَّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَقَّتَ لأهلِ المَدِينَةِ، ذا الحُلَيفَةِ، ولأهْلِ الشَّامِ الجَحْفَةَ، وَلأَهْلِ نَجدٍ قَرْنَ المَنازِلَ، ولأهْلِ اليَمَنِ يَلَمْلَمْ، هُنَّ لَهُنَّ، وَلِمَنْ أتَى عَلَيْهِنَّ مِنْ غَيْرِهِنَّ، مِمَّنْ أرَادَ الحَجَّ

---

(١٣٨) أخرجه مسلم في الحج، باب فضل الحج والعمرة (ج/٩/١١٩ صم – المترجم).

(١٣٩) أخرجه مسلم في الحج، باب: فضل الحج والعمرة (ج/٩/١١٩صم – المترجم).

والعُمْرَةَ، وَمَنْ كَانَ دُونَ ذلِكَ فَمِنْ حَيْثُ أَنْشَأَ، حَتىَّ أَهْلُ مَكَّةَ مِنْ مَكَّةَ).
(الحديث ١٥٢٤ – طرافاه في: ١٥٢٦، ١٥٢٩، ١٥٣٠، ١٨٤٥)[١٤٠]:

ئیبنوعەباس (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر -درورودی خوای لەسەر بێ (ذولحولەیفە) کەئێستا ناودارە بەبیری عەلی دیاری کردووە بۆ جێگە ئیحرام دابەستنی خەڵکی مەدینە، وە بۆ خەڵکی شامیش جوحفە، وەبۆ خەڵکی نەجدیش قەرنولمەنازیل، وەبۆ خەڵکی یەمەنیش یەلەم لەم، وەفەرمووی: (ئەم شوێنانە جێگەی ئیحرام دابەستنن بۆ ئەو کەسانەی کە دێن بۆ حەج و عەمرە، لەخەڵکی ئەم وڵاتانەو، لەخەڵکی ئەو وڵاتانەی تریش کە بەسەر ئەم شوێنانەدا دێن بۆ حەج و عەمرە، وەکەسێ لەم شوێنانەی ناومان هێنان نزیکتربوو، ئەوە جێگەی ئیحرام دابەستنی لەو شوێنەوەیە کەلێیەوە دەکەوێتەڕێ! تەنانەت خەڵکی مەککە لە مەککەوە ئیحرام دادەبەستن!) (تاج/٢/١٦٠- ش /د/ت/ن).

٧٣٤- عَنْ عبدِاللهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَاخَ بالبَطْحاءِ، بِذِي الحُلَيْفَةِ فَصَلى بِها، وَكَانَ عَبْدُاللهِ بْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ يَفْعَلُ ذلِكَ) (الحديث ١٥٣٢): بڕوانە: ژمارە:٢٩٥ ت = ٤٨٤ فتح)[١٤١].

٧٣٥- عَنْ عَبْدِاللهِ بن عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَخرُجُ مِنْ طَرِيقِ الشَّجَرَةِ، وَيَدْخُلُ مِنْ طَرِيقِ المَعَرِّس، وأَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إذا خَرَجَ إلى مَكَّةَ يصَلي في مَسْجِدِ الشَّجَرَةِ، وإذا رَجَعَ صَلَّى بِذي الحَلَيْفَةِ، بِبَطْنِ الوَادِي، وَبَاتَ حَتَّى يُصْبِحَ. (الحديث ١٥٣٣)[١٤٢]:

---

(١٤٠) أخرجه مسلم في الحج، باب: مَوَاقيت الحج والعمرة، رقم: ١١٨١.

(١٤١) أخرَجَهُ مُسلِمَ في الحَج، باب: التعريس بذي الحليفة.. رقم: ١٢٥٧.

(١٤٢) أخرجه مسلم في الحَج، باب: استحباب دخول مكة من الثنية العُليا. رقم: ١٢٥٧ (بڕوانە: ژمارە / ٢٩٥ ت = ٤٨٤ف).

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێ) کاتێ لە مەدینە بوو، کەدەچوو بۆ شوێنێکی تر، لەڕێگەی ئەل-شەجەرەوە لەمەدینە دەردەچوو، کەناوی جێگەیەکی شەش میل لەمەدینەوە دوورە، دەکەوێتە سەر ڕێگەی مەدینە بۆ مەککە، وا لەلای مزگەوتەکەی ذولحولەیفەدا، وەکاتێ دەگەڕایەوە بۆ مەدینە، وەك نوێژی جەژن، ڕێگەی دەگۆڕی، لەڕێگەی موعەررەسەوە دەهاتە ناو شارەوە، کەوا لەخوار مزگەوتەکەی ذولحولەیفەوە، دەستووری پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) وابوو، کە لەمەدینەوە دەچوو بۆ مەککە، لەمزگەوتی شەجەرە، کەوا لە ذولحولەیفە نوێژی دەکرد، کاتێ دەگەڕایەوە لەذولحولەیفە، وە لەناو شیوی عەقیق دادەبەزی و نوێژی دەکردو لەوێ وچانی دەگرتو هەتا بەیانی لەوێ دەمایەوە، ئەوجا دەکەوتەڕێو لەڕێگەی موعەررەسەوە داخڵی ناوشار دەبوو. مەبەستی پێغەمبەر لەم وچانە ئەوەبوو کە خەڵکەکە بەو شەوە لەناکاو هەڵنەکوتنە سەر ماڵ و منداڵیان).

٧٣٦- عَنْ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِوادِي العقيقِ يَقولَ: (أَتَاني الليلَةِ آتٍ مِنْ رَبي فَقَالَ: صَلِّ في هذا الوَادِي المُبارَكِ، وَقُل: عُمْرةٌ في حَجَّةٍ). (الحديث ١٥٣٤ – طرفاه في: ٢٢٣٧، ٧٣٤٣)[١٤٣]:

پێشەوا عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەشیوی عەقیق، کەوا لەنزیك بەقیع، کە چوارمیل لە مەدینەوە دوورە، گوێم لەپێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) بوو، دەیفەرموو: (ئەم شەو فریشتەیێ، لەلایەنی پەروەردگارمەوە هات بۆلام، دەففەرمووی پێم: لەم شیوە پیرۆزەدا نوێژ بکە، وە بفەرموو: ئەوا

(١٤٣) لم يوافقه مسلم علي تخريجه (فتح/٣-خاتمة كتاب الحج – المترجم).

ئیحرامـــی عـــەمرەم لەگـــەڵ حەجابەیەکـــەوە دابەســـت). (ت/٢/١٧٨-ب/د/ئەحمەد).

٧٣٧- عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللَّهُ عَنْهما عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ رُؤِيَ وَهُوَ في مَعَرَسٍ بِذِي الحُلَيفَةِ، بِبَطْنِ الوَادِ، قيلَ لَهُ: إِنَّكَ بِبَطْحاءَ مُبارَكَةٍ (الحديث ١٥٣٥)[144]:

ئیبنـــو عومـــەر -رەزای خوایـان لێ بێ- فـــەرمووی: پێغەمبـــەر -دروودی خـوای لەسـەر بێ- فەرمووی: لە موعەررەس، لە ذولحولەیفە، لەناو شیوی عەقیقا، لەخەون دا پێم گوترا: تۆ وایت لەناو شیوێکی زیخەڵاناوی پیرۆزدا).

٧٣٨- عَنْ يَعْلى بْنِ أُمَيَّةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ أَنَّهُ قَالَ لِعُمَرَ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ: أَرِني النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حِينَ يُوحى إِلَيْهِ، قَالَ: فَبَيْنَما النبيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بالجِعْرانَةِ، وَمَعَهُ نَفَرٌ مِنْ أَصْحابِهِ، جَاْءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: يارَسُولَ اللهِ، كَيْفَ تَرى في رَجُلٍ أحْرِمِ بِعُمْرةٍ، وَهُوِ مُتَضَمِخٌ بِطيبٍ؟ فَسَكَتَ النبيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَاعَةً، فَجاءَهُ الوَحيُ، فاشارَ عُمَرُ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ إلى يَعْلى، فَجَاءَ يَعْلى وَعلى رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثوْبٌ قَدْ أُظِلَّ بِهِ، فَأَدْخَلَ رَأسَهُ، فإذا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُحْمَرُّ الْوَجْهِ، وَهُوَ يَغِطُّ، ثُمَّ سُرِّيَ عَنْهُ، فَقَالَ: (أَيْنَ الَّذى سأَلَ عَنْ العُمْرَةِ). فَأُتيَ بِرَجُلٍ، فَقَالَ: (إِغْسِلَ الطِّيبَ الَّذي بِكَ ثَلاثَ مَرَّاتٍ، وانزَعْ عَنْكَ الجُبَّةَ، واصْنَعْ في عُمْرَتِكَ كَما تَصْنَعُ في حَجِتِكَ). (الحديث ١٥٣٦ - أطرافهُ في: ١٧٨٩، ١٨٤٧، ٤٣٢٩، ٤٩٨٥)[145]:

یـــەعلای کـوڕی ئومەییـــە (رەزای خـوای لێ بێ) بـــەئیمامی عومـــەری فـــەرموو: لەکاتێ هاتنی وەحی بۆ پێغەمبەر، پێغەمبەرم نیشان بدە، پێغەمبـەر -دروودی

---

(١٤٤) أخرجه مسلم في الحج، باب: التعريس بذي الحليفة والصلاة بها، رقم: ١٣٤٦.

(١٤٥) أخرجه مسلم في الحج، باب: مايباح للمحرم يجمع.. رقم: ١١٨٠.

خوای لەسەر بێ لەجیعرانـە بـوو، کـە یەکێکـە لەجێگـەی دابەسـتنی ئیحـرام، دەکەوێتـە خـاکی حیللـەوە، لـەنێوانی طـائیـف و مەککەدایـە، لەمەککـەوە نزیکترە، لەوێ لە جیعرانە، کاتێ پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێ لـەناو کۆمـەڵێ، لە هاوڕێیانیدا بوو، پیاوێ ڕیش‌و قژی خۆی لـەبۆنی خۆشا زەرد کردبـوو، وە جبەیەکی لەبەردا بوو، هاتە خزمەتی پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێ عـەرزی کـرد: ئـەی ڕەوانـەکراوی خـودا ئیحرامـی عـەمرەم دابەسـتووەو بـەم شێوەیەشـم کـە دەمبیـی ؟ پێغەمبـەر دروودی خوای لەسەر بێ تاوێـك بـێ‌دەنگ بـوو، ئـەوجا سـروش (وحـی)ی بۆهـات، عومـەریش دروودی خوای لەسەر بێ ئامـاژەی بـۆ یەعلا کرد، جا یـەعلا هـات، ڕوانـی پۆشاکێ وەك چەترو پـەردە دراوە بـە پێغەمبەرا، یەعلا دەفەرموێ: سەرم کـرد بـەژێر ئـەو پەردەیـەدا، تەماشـام کـرد: وا پێغەمبـەر دروودی خوای لەسەر بێ لەبـەر قورسـی بـاری هـاتنی سرووشـی، ڕووی سـوور سـوور هەڵگـەڕاوەو وەك خـەوتووی هەناسـە سـواربوو، پرخـە پرخـی دێ. پاشـان بەرەبـەرە فەرامۆشـی بـۆ هـات‌و ئـەو حاڵەتـە بەری‌داو بـاری لەشـی سـووك بـوو، وەهاتـەوە سـەرباری ئاسایی، ئـەوجا فـەرمووی: (ئـەوەی کـە لـەبارەی عـەمرەوە پرسـیاری هـەبوو کـوا لەکوێیـە؟( جـا پیاوەکەیان هێنا بۆ خزمەتی، فەرمووی: (سێ جار ئەم بۆنە خۆشە بشۆرە کـە داوتـە لـەخۆت، وە جبەکەشـت لەبـەرت داکەنـە، عـەمرەیش لـەم لایەنانـەوە وەك حـەج وایـە، لەبەرئـەوە لـە حەجەکـەتا چـی دەکـەی لـە عەمرەکەشتا هەمان شت بکە).

**ڕوونکردنەوە:**

بڕوانە: تاج/٢/١٦٢/٢ز- ٨٣.

ئەم داستانە ئەوكاتە ڕوویداوە، کە پێغەمبەر «درودی خوای لەسەر بێ» لەغەزای حونەین گەڕاوەتەوە، لەساڵی هەشتی کۆچیدا بوو. ئەم جۆرە بەهرانە لەم فەرموودەیە وەردەگیرێن:

١- موفتی لە وەڵامدانەوەدا پەلە نەکا، هەتا زانستی تەواو لەبارەی پرسیارەکەوە مسۆگەر نەکا وەڵام نەداتەوە.

٢- کەهەندێ شت لە عەمرەو لە حەجا یەك بڕیاریان هەیە.

٣- هەندێ حوکم هەیە، بە وەحی چەسپاوە، کە ئەو وەحیە غەیری قورئانە، کەواتە مەرج نییە هەموو وەحیێ قورئانی دەورەوە کراوبێ.

یەعلای کوڕی ئومەییەی تەمیمی، هاوڕێی پێغەمبەر بوو، لە ڕۆژی ئازادکردنی مەککەدا ئیسلام بوو پیاوێکی دەوڵەمەندی زۆر سەخی بوو، ئامادەی شەڕی تائیف و حونەین‌و تەبووك بووە، لەخزمەت پێغەمبەردا، نۆزدە فەرموودەی هەیە، لە موقەددیمەی فەتحولباریدا دەفەرموێ: سێ فەرموودەی لە بوخاری شەریفدا هەیە، یەکێکیان ئەم فەرموودەیەی ئێرەیە، کە صەفوانی کوڕی دەیگێڕێتەوە لێیەوە، یەعلا پیاوێکی ناوداری لێهاتووبوو، لەبەرئەوە لە کاتی حوکمڕانی هەر چوار جێنشینەکانی پێغەمبەردا، ڕۆڵی گەورەی بینیوە، ئەبوبەکرکردی بەکاربەدەستی سەر حلوان لەکاتی جەنگی ڕیددەدا، لە سەردەمی عومەردا بوو بە عامل لەسەر هەندێ لە وڵاتی یەمەن، لە سەردەمی عوسمانیشدا بوو بەکاربەدەستی عوسمان لەسەر صەنعاو ئەو ساڵەی کە عوسمان شەهید کرا هات بۆ حەج، زۆر لەدژی بکوژانی عوسمان خەباتی گێڕا، لەگەڵ عائیشەدا ئامادەی جەنگی ئەل - جەمەل بو، ئەو حوشترەی کە لەوجەنگەدا لەژێر حەزرەتی عائیشەدا بوو «رەزای خوای لێ بێ»، کە شەڕەکە بەناوی ئەو وشترەوە ناودارە، ناوی عەسکەر بوو، یەعلا بە دووسەد لیرەی زێڕ کڕی‌و دای بە

عائیشه، لەو ڕووداوە دڵتەزێنەدا سواری بوو !

لەپاشا لەگەڵ ئیمامی عەلیدا ئامادەی شەڕی صفین بوو، لەم شەڕەدا لە ساڵی (٣٨) دا شەهید کرا، ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێبێ.

## باسی بەکارهێنانی بۆنی خۆش لەکاتی ئیحرام دابەستن دا

٧٣٩- عَنْ عائِشَةَ رَضِي اللّٰهُ عَنْها زَوْجِ النبيّ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَتْ: كُنْتُ أُطَيِّبُ رَسُولَ اللهِ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لإحْرامِهِ حِينَ يُحْرِمُ، وَلِحِلِّهِ، قَبْلَ أَنْ يَطُوفَ بِالبَيْتِ). (الحديث ١٥٣٩ - أطرافه في: ١٧٥٤، ٥٩٢٢، ٥٩٢٨، ٥٩٣٠)[١٤٦]:

عائیشه (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بۆ خۆم بۆنی خۆشم دەدا لە پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- لەکاتی ئیحرام بەستندا، بەڵام لەپێش ئەوەدا کە ئیحرام ببەستێ، وە هەروەها بۆ ئیحرام شکاندنیش، لەپاش ڕەجمی شەیتانو سەرتاشین، لەپێش ئەوەدا کە تەوافی بەیت بکا، بۆنی خۆشم لەپێغەمبەر دەدا). (تاج/٢/١٦٧ ز/٨٧).

## باسی لۆك کردنی قژو پەستانەوەی لەکاتی ئیحرام بەستنا

٧٤٠- عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُهِلُّ مُلَبِّداً). (الحديث ١٥٤٠ - أطرافه في: ١٥٤٩، ٥٩١٤، ٥٩١٥)[١٤٧]:

(١٤٦) أخرجه مسلم في الحج، باب: الطيب للمحرم عند الاحرام، رقم: ١١٨٩.

(١٤٧) أخرجه مسلم في الحج، باب: التلبية وصفتها ووقتها، رقم: ١١٨٤.

ئیبنو عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- لەپێش ئیحرام دابەستندا، قژە سەری خۆی، بە سرێژو دەرمانو شتیوا، وەك لباد، دەپەستایەوەو دەیچەسپان بە یەکەوە، ئەوجا بەچاوی خۆم پێغەمبەرم دی بەو شێوەیە، بەدەنگی بەرز دەستی کرد بە تەلبییە کردنو ئیحرامی دابەست. مەبەست لەم لۆك کردنە ئەوەیە کەلێی هەڵنەوەرێ ورشكو ئەسپێ هەڵنەهێنێ).

٧٤١- وَعَنْهُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: مَاأَهَلَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلاَّ مِنْ عِنْدِ المَسْجِدِ، يَعني: مَسْجِدِ ذي الحُلَيْفَةِ.. (الحديث ١٥٤١) [١٤٨]:

دیسان ئیبنوعومەر -ڕەزای خوایان لێ بێ- لەبەرپەچی قسەی هەندێ کەسا، کە دەیان گوت: ئیحرام دابەستن لەسەر تەختاییەکەی کێوی بەیدائە، فەرمووی: (بە خوا پێغەمبەر هەرگیز ئیحرامی حەجی دانەبەستووە مەگەر لە لای مزگەوتەکەی ذولحولەیفەدا، کە ئێستا پێی دەگوترێ: بیری عەلی).

## ڕوونکردنەوە:

نموونەیێ لەکۆکردنەوە (جەمع) لەنێوانی دوو فەرموودەی بەدیمەن جیاوازدا، هاوڕێیان (ڕەزای خوای لێ بێ) کۆمەڵێکیان دەیانفەرموو: پێغەمبەر لە مزگەوتەکەی ذولحولەیفە ئیحرامی دابەست، هەندێ تریان دەیانفەرموو: شەو لە ذولحولەیفە مایەوە، بەیانی کە سواری وشترەکەی بو، کە وشترەکە ڕێك هەڵسایە سەرپێ ئەوکاتە ئیحامی دابەست، هەندێ تر دەیانفەرموو:

(١٤٨) اخرجه مسلم في الحج، باب: أمر أهل المدينة بالاحرام من عند مسجد ذي الحليفة، رقم: ١١٨٦.

شەو لە مزگەوتەکە مایەوە تا بەیانی، ئنجا سواربوو ڕۆیشت، تا وڵاخەکەی سەری خستە سەرشاخی بەیداو، لەویٚ ئیحرامی دابەست. سەعیدی کوڕی جوبەیر (رەزای خوای لێ بێ) گوتی: گوتم بە ئیبنوعەباس: ئەی باوکی عەباس! سەرم سوڕماوە لە ڕاجیایی هاوڕێیانی پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- لەبارەی جێگەی ئیحرام دابەستنی پێغەمبەرەوە، هەر کۆمەڵێ شوێنێ دەڵێ؟

ئیبنو عەباس (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: (من لەم بارەیەوە لە هەمووکەسێ باشتری لێ دەزانم، ئاشکرایە کە پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- لە پاش کۆچ یەك حەجی کردووە، هۆی ڕاجیایی ئەو خەڵکە ئەمەیە: پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- جاڕی دا کەوا دەچێ بۆ حەج، عەشاماتێکی زۆر لەگەڵیدا چوون بۆ حەج، لەبەر زۆرییان کۆمەڵ کۆمەڵ لە مەڵبەندەکانی حەج دا بەخزمەتی دەگەیشتن، مەودا نەبوو کەهەموویان هەموو کاتێ لەخزمەتیا بن، خەڵکەکەیش لە هەمووولایەکەوە بەرودوا کۆمەڵ کۆمەڵ لێی کۆدەبوونەوە، جاکاتێ پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- دوو ڕکات نوێژی لە مزگەوتەکەی ذولحولەیفە کرد، هەر لەو مەجلیسەیدا کاتێ لە دوو ڕکاتە نوێژەکەی بۆوە، حەجی لەسەر خۆی پێویست کردو بەدەنگی بەرز لەببەیکەی کردو ئیحرامی دابەست، جائەوانەی لەوێ بوون ئەوەیان لە پێغەمبەرەوە وەرگرتو لەبەر کرد، پاشان کاتێ لە ذولحولەیفە بەڕێکەوت، کە سواری وشترەکەی بوو، وە وشترەکە ڕێك هەڵسایە سەرپێو پێغەمبەر جێگەی خۆیگرت لەسەرپشتی، دیسان بەدەنگی بەرز دەستی کردەوە بەتەلبییەکردن، کۆمەڵێکیش ئاگای لەمەبوو، ئاگای لەئیحرام دابەستنی یەکەمی نەبوو، لەپاشا پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- کەوتە ڕێو ڕۆیشت، هەتا سەرکەوتە سەرکێوی بەیدا، هەمدیسان لەوێش بەدەنگی بەرز، دەستی کردەوە بەلەببەیکە کردن، کۆمەڵێکیش لەمکاتەدا لەوێ بوون، ئەمەیان

لەبەرکرد، جا هەرکۆمەڵێ لەمانە، بەپێی ئاگاداری خۆیان قسەیان لە جێگەی ئیحرام دابەستنی پێغەمبەرکردووە، وەهەمووشیان ڕاستیان کردووە).

## سواربوونو لەپاشکۆدا سواربون لەحەج دا

٧٤٢- عَنِ ابْنِ عَبَّاس رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ: أَنَّ أُسَامَةَ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ كَانَ رِدْفَ النبيَ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ عَرَفَةَ إلى المُزْدَلِفَةِ، ثُمَّ أَرْدَفَ الفَضْلَ مِنَ المُزْدَلِفَةِ إلى مِنىً، قَالَ: فكِلاهُمَا قَالَ: لَمْ يَزلَ النبي صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُلَبِي حَتَى رمى جَمْرَةَ العَقَبَةِ. (الحديث ١٥٤٣ - طرفه في: ١٦٨٦) و (الحديث ١٥٤٣- أطرافه في: ١٦٧٠، ١٦٨٥، ١٦٨٧)[١٤٩].

ئیبنو عەباس ـرەزای خوایان لێ بێـ فەرمووی: لەحەجی ماڵاواییدا، ئوسامە لە پاشکۆی پێغەمبەرەوە سواربوو بوو، لەکێوی عەرەفەوە هەتا موزدەلیفە، پاشان پێغەمبەر ـدروودی خوای لەسەر بێـ لە موزدەلیفە، هەتا مینا، فەزڵی کوڕی عەباسی خستە پاشکۆی خۆی. فەرمووی: هەردووکیان ئوسامەو فەزڵ، دەیان فەرموو: پێغەمبەر ـدروودی خوای لەسەر بێـ لەو ماوەیەدا هەرخەریکی (لبَّیك)کردن بوو، هەتا ڕەجمی شەیتانی تەواوکرد، لە کۆگا بەردەکەی جەمرەتول عەقەبە). (تاج/٢/١٢٧ ف/٥ ـش/د/ت).

## جلو بەرگی کەسێ لەئیحرام دا بێ

٧٤٣- عَنْ عَبْدِاللهِ بْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ قالَ: أنطَلَقَ النبيُّ صَلَّى اللّٰهُ

(١٤٩) أخرجه مسلم في الحج، باب:استحباب إدامة الحاج التلبية حتي يشرع في رمي...، رقم:١٢٨١.

عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنَ المَدِينَةِ، بَعْدَمَا تَرَجَلَ وَادَّهَنَ، ولَبِسَ إزارَهُ وَرِداءَهُ، هُو وَأَصْحابُهُ، فَلَمْ يَنْهَ عَنْ شَيءٍ مِنَ الأَرْدِيَةِ وَالأُزُرِ تُلْبَسُ، إلاَّ المُزَعْفَرَةَ التي تَرْدَعُ عَلَى الجِلْدِ، فأَصْبَحَ بِذِي الحُلَيْفَةِ، رَكِبَ رَاحِلَتَهُ، حَتَّى اسْتَوى عَلى البَيْداءِ أهَلَّ هُوَ وَأَصْحابُهُ وقَلَّدَ بَدَنَةَهُ، وذلَكَ لَخَمْسٍ بَقِينَ مِنْ ذي القَعْدَةِ، فَقَدِمَ مَكَّةَ لأَرْبَعِ لَيالٍ خَلَوْنَ مِنْ ذي الحِجَّةِ، فَطَافَ بالبَيْتِ وَسَعى بَيْنَ الصَّفا وَالمَرْوَةِ، وَلَمْ يَحِلَّ مِنْ أجْلِ بُدْنِهِ، لأَنَّهُ قَلَّدَهَا، ثُمَّ نَزَلَ بأعلى مَكَّةَ عِنْدَ الحُجُون وَهُوَ مَهِلٌ بالحَج وَلَمْ يَقْرب الكَعْبَةَ بَعْدَ طَوافِهِ بَها حَتَّى رَجَعَ مِنْ عَرَفَةَ، وَأَمَرَ اصْحابَهُ أنْ يُطَوفُوا بالبَيْتِ وَبَيْنَ الصَّفا وَالمَرْوَةِ، ثُمَّ يُقَصِروُ مِنْ رُؤُسِهِمْ، ثُمَّ يَحلُّوا، وَذلِكَ لِمَنْ لَمْ يَكُنْ مَعَهُ بَدَنَةُ قَلَّدَهَا، وَمنْ كانَتْ مَعَهُ امرَأَتُهُ فَهيَ لَهُ حَلالٌ، والطيبُ والثيابُ). (الحديث ١٥٤٥ – طَرَفاهُ في: ١٦٢٥، ١٧٣١)[١٥٠]:

عەبدوڵلای کوڕی عەباس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خۆشەویست لە مەدینە سەرو ڕیشی خۆی بەبۆنی خۆش چەورکردو شانەی کرد، وەخۆیو هاوڕێیانی، سەرو دوو پەشتەماڵ (ئیزارو ریدا) یان لەبەرکردو ئنجا بەرەو مەککەی نازدار کەوتنە ڕێ، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ڕێگەی لەبەرکردنی هەمووجۆرە پەشتەماڵێکی دا، بێجگە لەوانەی کە زەعفەراناوییەکی وەهابن کە ڕەنگ بدەنەوەو لەش زەرد بکەن، جا ئەو ڕۆژە چووە ذولحولەیفە، وەشەو لەوێ مایەوە، وەبەیانی سواری وڵاخەکەی بوو، وەڕۆیشت تا سەرکەوتە سەرکێوی بەیدا، جا لەوێ خۆیو هاوڕێیانی ئیحرامیان بەست، وەئەو وشترە دیاریانە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) هێنابوونی، کە لەمەککە بیانکات بەقوربانی، لەوێ نیشانەی کردنو سەرو جووت سۆڵی کردە ملیان، جا کەئەمانەی کرد هێشتا لە مانگی ناوجەژنان

(١٥٠) لم يُوَافِقْهُ مُسْلِمٌ عَلي تخريجه، فتح/٣/٥٩٦ – خاتمة كتاب الحج – المترجم).

پێنج ڕۆژی مابوو، لەڕۆژی چوارەمی مانگی قوربانـدا گەیشتە مەککە، جا تەوافی بەیتی کردو، سەعی نێوانی صەفاو مەڕوەی بەجێ هێنا، وەخۆی ئیحرامی نەشکاند، چونکە وشتری دیاریی (هەدیی)ی هێنابوو لەگەڵ خۆی، ئنجا لەسەرو مەککەوە، لەلای حەجوون دابەزیو بارگەکەی خست، وە پێغەمبەر درودی خوای لەسەر بێ تەنیا ئیحرامی حەجی بەستبوو، کە تەوافی کەعبەی کرد، ئیتر توخنی نەکەوتەوە تا لەکێوی عەرەفە گەڕایەوە، بەڵام فەرمانیدا بە هاوڕێکانی واتە: بەو کەسانەیان کە وشتری دیاری بەیتو قوربانییان لەگەڵ خۆیان نەهێنابوو، فەرمانی پێکردن: کە تەوافی بەیت بکەنو تەوافی نێوانی صەفاو مەڕوە بکەنو، ئنجا مووی سەری خۆیان کورت بکەنەوەو ئیحرام بشکێنن، وەبیکەن بە عەمرە، وە لەم ماوەیەدا کە ئیحرام دەشکێنن تا ئیحرامی حەج دەبەستن، ئەوەی ژنی خۆی لەگەڵ بێ، وەك جاران بۆی حەڵاڵە، وەهەروەها بەکارهێنانی بۆنی خۆشو پۆشینی جلوبەرگی ئاسایی). (تاج/٢/١٦٨ ف/٤).

## باسی تەلبییە کردن

٧٤٤- عَنْ عَبْدِاللهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ أنَّ تَلْبِيَةَ رَسُولَ الله صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لَبَّيْكَ اللهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لاَشَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إنَّ الحمدَ والنِعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ، لاَشَرِيكَ لَكَ). (الحديث ١٥٤٩)[151].

ئیبنو عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەببەیکە کردنی پێغەمبەر درودی خوای لەسەر بێ وابوو: (لبيك اللهمَّ لبيك، لبيكَ لاَشريكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إنَّ الحَمْدَ

(١٥١) أخرجه مسلم في الحج، باب: التلبية وصفتها ووقتها (حم، ٨ ص ٨٨ = الجلد الثامن، صحيح مسلم بشرح النووي). — المترجم).

والنعمةَ لَكَ والمُلْكَ، لاشَرِيكَ لَكَ):

واتە: پەروەردگارا! هەمیشە کەمەری بەندەییم بەستووە بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانی تۆ، تۆ بێچوون و بێ هاوەڵی، سوپاس و ستایش هەربۆ تۆیە، وە بەخشش و نازو بەهرەو نیعمەت و دارایی و پاشایی و خاوەنی، هەرلەخۆت دێ و هەرلەخۆت جوانە، بێ چوونی و بێ هاوەڵی تۆ ئاشکراو نمایانە). (تاج/٢/ ١٧٠ف ١-ش/د/ت/ن).

٧٤٥- عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَنَحْنُ مَعَهُ بالمدِينَةِ الظُّهْرِ أَرْبَعاً، والعَصْرَ بِذِي الحُلَيْفَةِ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ باتَ بِهَا حَتَّى أَصْبَحَ، ثُمَّ رَكِبَ حَتَّى اسْتَوَتْ بِهِ عَلى البَيْداءِ، حَمِدَ اللهَ وسَبَّحَ وَكَبَّرَ، ثُمَّ أَهَلَّ بِحَجٍّ وَعُمْرَةٍ، وَأَهَلَّ النَّاسُ بِهِما، فَلَمَّا قَدِمْنَا أَمَرَ النَّاسَ فَحَلّوا، حتى كَانَ يَوْمُ التَّرْوِيَةِ، أَهَلّوا بِالحَجِ، قَالَ: وَنَحَرَ النبِيُّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَدَنَاتٍ بِيَدِهِ قِياماً، وَذَبَحَ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بالمدينةِ كَبْشَيْنِ أَمْلَحَيْنِ). (الحديث ١٥٥١)[١٥٢]:

ئەنەس (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) کە چوو بۆ حەجی ماڵاوایی، لە مەدینە نوێژی نیوەڕۆی بە چوارڕکات بۆمان کرد، ئنجا کەوتەڕێ، کەگەیشتە ذولحولەیفە، لەوێ نوێژی عەصری بە قەصر، بە دوو رکات، بە جەماعەت بۆمان کرد، ئەوجا شەو لەوێ مایەوە هەتا بەیانی، نوێژی بەیانی لەوێ بۆ کردین، پاشان سواربوو ڕۆیشت تاوڵاخەکەی ژێری سەری خستە سەرشاخی بەیدا، جالەوێ سوپاس و ستایشی خودای کردو سوبحانەڵلاو ئەڵلاهو ئەکبەریکرد، ئنجا بەو تەلبیە

(١٥٢) لاحظ فتح/٣ - خاتمة ص ٥٩٦ وقال العيني: أخرجه مسلم في الصلاة. عيني /١٧٥/٩ -المترجم.

کـەوا لەفـەرموودەی ژمـارە (٧٤٤)دا ئیحرامـی حـەج و عـەمرەی پێکـەوە دابەسـتو، خەڵکەکـەیش ئیحرامـی حـەجو عـەمرەیان دابەسـت، بـەڵام کەچووینە مەککـە فـەرمانی کـرد بەخەڵکەکـە ئیحرامیـان شـکاند، ئنجـا لـەڕۆژی هەشـتەمی مـانگی قوربانـا، کەدەکاتـە ڕۆژی تەروییـە، ئەوانـەی کـە ئیحرامیـان شـکاندبوو، سـەرلەنوێ ئیحرامیحـەجیان بەسـتەوە. فـەرمووی: پێغەمبەر ـدروودی خوای لەسەر بێـ بەدەستی خۆی چەند وشـترێکی لەمەککـە سـەربڕی، لەکاتی سەربڕینەکەدا وشترەکان بەپێوە ڕاوەستابوون لەسەرسێ قاچ.

کاتـێ گەڕاشـەوە بـۆ مەدینـە دوو بـەرانی تـەوی سـەربڕیو کـردی بـە قاوەڵتی بەبۆنەی گەڕانەوەیەوە لە حەج). (تاج/٢/١٧٧-١).

٧٤٦- عَنْ نَافِعٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: كَانَ ابْنُ عُمَرَ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ إذا صَلَّى بِالفداةِ بِذِي الحُلَيْفَةِ، أَمَرَ بِراحِلَتِهِ فَرُحِلَتْ ثُمَّ رُكِبَ فَـإذا اسْتَوَتْ بِـهِ اسْتَقْبَلَ القِبْلَةَ قائِماً ثُمَّ يُلَبِّي حَتَى يَبْلُغَ الحَرَمَ، ثُمَّ يُمْسِكُ حَتَّـى إذا جَـاءَ ذاطَـوىً باتَ بِهِ حَتَّى يُصْبِحَ فَإذا صَلَّى الغَداةَ اغْتَسَلَ، وَزَعَـمَ أَنَّ رَسُـولَ اللهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَعَلَ ذلِـكَ). (الحـديث ١٥٥٣ – أطرافـه فـي: ١٥٥٤، ١٥٧٣، ١٥٧٤)[١٥٣]:

نافیع (ڕەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی: جاران کاتـێ ئیبنوعومـەر ـڕەزای خوایان لێ بێـ لـە ذولحولەیفـە نوێـژی بـەیانیی دەکـرد، ئەوسـا فـەرمانی دەدا وشـترەکەیان کۆپـان دەکـرد بـۆی، ئـەوجا سـواردەبوو، جـا کەبەباشـی لەسەرپـشتی وشترەکەی خۆی دەگرتو ڕێك دادەمەزرا لەسەرپشتی، بەسـەر وشـترەکەوە قیـت دادەنیـشتو ڕووی دەکـردە ڕووگـەی پـیرۆز، ئـیتر دەسـتی دەکـرد

(١٥٣) لاحظ نفس المصدر السابق وقال العيني: أخرجه مسلم في صحيحه عن أبي الربيع عن حماد عن أيوب عيني /٩ / ١٧٩- المترجم).

بەتەلبییەکردنو بەینەبەینە بەبێ پسان تەلبییەی دەکرد، تادەگەیشتە خاکی حەرەم، ئەوجا بەتەوافو ئەرکەکانی تری حەجەوە خەریك دەبوو، کەمتر دەیپەرژایە سەر تەلبییە، هەتا دەچووە زووطەوا، کەئێستا پێی دەگوترێ: (آبار الزاهد) لەوێ شەو دەمایەوە هەتا بەیانی، جاکاتێ لەوێ نوێژی بەیانیدەکرد، ئەوسا خۆی دەشۆرد، بە قسەی ئیبنو عومەر، پێغەمبەر خۆشی ـدروودی خوای لەسەر بێـ ئاوای دەکرد).

## ڕوونکردنەوە:

نافیعی کوڕی سەرجیس (ڕەزای خوای لێ بێ)، تابیعیـیە، ئازادکراوی ئیبنوعومەر بووە، فەقێشی بووە، لەئەصڵا خەڵکی مەغریبە، لەغەزایەکا دیلکراو بەرپشکی ئیبنوعومەرکەوت، لەخزمەتی ئیبنو عومەردا بوو تاکاتی مەرگی، زانستو فەرموودەیەکی زۆری لێوەرگرت، عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ناردی بۆ میصر، هەتا خەڵکەکەی لە سوننەتی پێغەمبەردا شارەزا بکات، وە لەو مەودایەدا ڕۆڵێکی جوانی بینی، زۆرینەی فەرموودە شوناسە گەورەکان ڕیوایەتیان لێوە کردووە، ساڵی سەدو حەڤدە لە مەدینە کۆچی دوایی کرد (ڕەزای خوای لێ بێ).

٧٤٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ النبيُّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَمَّا مُوسَى: كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَيْهِ، إِذِ انْحَدَرَ في الوَادِي يُلَبِّي). (الحديث ١٥٥٥ – طَرَفَاه في: ٣٣٥٥، ٥٩١٣) [١٥٤]:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر ـدروودی خوای لەسەر بێـ جارێ لە مەدینەوە دەڕۆیی بۆ مەککە، گەیشتە شیوێ، فەرمووی: (ئەم شیوە کوێیە؟)

(١٥٤) أخرجه مسلم في الإيمان، باب: الإسراء برسول الله ﷺ الي السماوات، رقم: ١٦٦

عەرزیان کرد: ئەمە وادیلئەزرەق (شیوە شین)ە. فەرمووی: (دەڵێی ئێستایش لەبەرچاومە کە مووسا -سەلامی خوای لێ بێ- کە لەشەوی ئیسرادا دیم، لەددانەی یاڵەکەوە دادەپەڕی، دوو پەنجەی دانابوو لەناو دووکونە گوێچکەی خۆیدا، لەناو ئەم شیوەوە ڕادەبووردو، هاواری دەکرد لەخوداو دەنگی لەببەیکە کردنی بەبەرزی دەهات..). (تاج/٤/١٣٨٧ - م).

## ڕوونکردنەوە:

ئەو بەهرانەی کە لەم فەرموودەیەو وێنەیەوە، وەردەگیرێن:

١. ﴿الأنبِيـاءُ أحْيَـاءٌ عِنْـدَ رَبِهِـمْ يُرْزَقُـون: پێغەمبەران زیندوون، لە خزمەت خوداوەندا ڕزق‌و ڕۆزییان پێدەدرێ﴾.

٢. پێغەمبەران لەژیانی بەرزەخا خواپەرستی دەکەن، وەك نوێژکردن‌و حەج کردن‌و یادی خودا، بگرە کاری دنیایشیان لێ صادردەبێ، وەك گریان و ڕۆیشتن‌و هاوارکردن و جل لەبەرکردن‌و هەست بەسۆزو شەفەقت و سەر شانەکردن‌و قسەو گفتوگۆکردن‌و چاك و چۆنی لەگەڵ یەکا.

٣. حەج و عەمرە تایبەت نین بەنەتەوەی ئیسلامەوە، ئەوەتا پێغەمبەرانی تریش وەك: ئیبراهیم و عیسا و یونس و مووسا – تەواف‌و حەج و تەلبیەو نوێژ ئەمانە دەکەن. (بڕوانە: ب/١ ژ/١٥٩ ل/١٧٢).

## ئیحرام دابەستن وەك ئیحرام دابەستنی کەسێکی تر دروستە

٧٤٨– عَنْ أبي مُوسى رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: بَعَثَنِي النَبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلى قَوْمٍ باليَمَنِ فَجِئْتُ وَهُوَ بالبَطْحَاءِ، فَقَالَ: (بِمَا أهْلَلْتَ). قلْتُ: أَهْلَلْتُ

كإهْلال النَّبِيِّ صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: (هَلْ مَعَكَ مِنْ هَدْيٍ) قُلْتُ: لا، فَأمَرَنِي فَطُفْتُ بالبَيْتِ وَبالصَّفَا والمَرْوَةِ ثُمَّ امرَنِي فَأَحْلَلْتُ فَاتَيْتُ أمرَأةً مِنْ قَوْمي فَمَشَطَتْنِي، أوْ غَسَلَتْ رأسي. فَقَدِمَ عمرُ رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ، فَقَالَ: إنْ نَأخُذْ بِكِتَابِ اللهِ فَإنَّهُ يَأمُرُنَا بالتَّمامِ، قَالَ اللهُ: (وَأتِمُّوا الحَجَّ وَالعُمْرَةَ لله). وَإنْ نَأخُذْ بِسُنَّةِ النبِيِّ صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَإنَّهُ لَمْ يَحِلَّ حَتَّى نَحَرَ الهَدْيَ.(الحديث ١٥٥٩ – أطرافه في: ١٥٦٥، ذ١٧٢٤، ١٧٩٥، ٤٣٤٦، ٤٣٩٧)[١٥٥]:

ئەبو مووساى ئەشعەرى (رەزاى خواى لێ بێ) فەرمووى: پێغەمبەر -دروودى خواى لەسەر بێ- لەساڵی دەی کۆچیدا، ناردمی بۆ یەمەن کردمی بەسەرکاری سەرهۆزەکەی خۆم، جا ساڵی حەجی ماڵاوایی چووم بۆ حەج، کەچوومە بەرەوە پێغەمبەر -دروودى خواى لەسەر بێ- لە ئەبطەح بوو، واتە: لە (موحەصەب = تەحصیب = حەصبە = بەطحاء = خەیفی بەنی کینانە) لە سەرەتای حەجەوە بوو، فەرمووی: (ئیحرامت چۆن دابەستووە؟) گوتم: ئاوا ئیحرامم دابەستووە: پێغەمبەر -دروودى خواى لەسەر بێ- چۆن ئیحرامی دابەستووە منیش وەك ئیحرام بەستنەکەی ئەو ئیحرامم دابەست. فەرمووی: (ئاژەڵی دیاری بەیتت هێناوە لەگەڵ خۆت، کە لەشەرعا پێی دەگوترێ: هەدی بەیت؟). گوتم: نەو، پێم نییە. فەرمووی: (دەی مادەم دیاری بەیتت لەگەڵ خۆت نەهێناوە برۆ تەوافی بەیتو تەوافی صەفاو مەروە بکە، ئەوجا ئیحرام بشکێنەو تەمەتووعو خۆشی وەربگرە، منیش وام کردو فەرمانەکانی پێغەمبەرم بەجێ هێناو ئەوجا ئیحرامم شکاندو چووم بۆلای ژنێکی خزمی خۆم قژەکەمی بۆ شانە کردم – یافەرمووی: سەری شۆردم.

(١٥٥) قال المعيني:. وأخرجهُ مسلمٌ في الحج (عيني / ٩/ ١٨٨، صم/٨ ص١٩٨) ـ المترجم).

ئـەبو مووسـا (رەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی: جاكاتـێ سـەردەمی جێنـشینی ئیمـامی عومــەر (رەزای خـوای لێ بـێ) هــات، وەباســی ئــەوەم دەكــردو فــەتوای تەمەتتوعم لە حەجدا دەدا، دوایی بیستمەوە كەعومـەر (رەزای خوای لێ بێ) نـەهی لە تەمەتتوع دەكاو تەمەتتوعی لە حەجا پێ ناخۆشە.

جاكاتێ بەخزمـەتی عومـەر گەیشتم‌و ئەمـەم عـەرزی كـردو عـەرزیم كرد تۆ بۆ تەمەتتوعت لەحەج دا پێ‌ناخۆشە، عومـەر لـەوەڵاما فـەرمووی: (مـن ئیحـرام ناشـكێنم‌و ڕام وانییـە، چـونكە شـتێوا پێـچەوانەی نامـەی خــوداو ســوننەتی پێغەمبــەرە -درودی خـوای لەسەر بێ- ئــەوەتا قورئــان بــەدەق دەفـەرموێ: ﴿وَأَتِمُّـوا الحَـجَّ وَالعُمْـرَةَ للهِ – واتـە: ئـەی مـسوڵمانان! حـەج‌و عەمرەتان كەدەست پێكـرد، تـەواویان بكـەن، وە هـەر بـۆ خـودا ئـەنجامیان بدەن﴾. خۆ ئەگەر كار بەسوننەتی پێغەمبـەریش بكـەین، پێغـەمبـەر -درودی خوای لەسەر بێ- خـۆی كـە حـەجی دابەسـت ئـیتر ئیحرامـی نەشـكان هـەتا ئـاژەڵی دیاری بەست (حەرەم)ی سەربڕی).

بـۆ تێگەیـشتنی تـەواو لـەم داسـتانی نێـوانی ئەبوموسـاو ئیمـامی عومەرەوە بڕوانە تاج/٢/١٧٤ ز/٩٠) باسی تەمەتتوع.

## كاتی حەج كردن‌و مانگەكانی حەج

٧٤٩- عَنْ عائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنها قالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ الله صَلّى اللّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ في أَشْهُرِ الحجِ، وَلَيالي الحَجّ، وَحُرُمِ الحـجِ، فَنَزَلْنـا بِـسَرَف، قَالَـتْ: فَخَرَجَ إلى أصْحَابِهِ فَقَالَ: (مَنْ لَمْ يَكُـنْ مِـنْكُمْ مَعَـهُ هَـدْى، فَأَحَـبَّ أَنْ يَجْعِلَهَـا عُمْرَةً فَلْيَفْعَلْ، وَمَنْ كَانَ مَعَهُ الهَدْيُ فَلاَ). قَالَتْ: فالآخِذُ بِهـا والتـارِكُ لَهَـا مِـنْ أصْحابِهِ قالَتْ: فَأما رَسُولُ اللهِ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَرِجالٌ مِنْ أَحابِـهِ، فَكـانُوا

أَهْلَ قُوَّةٍ، وَكَانَ مَعَهُمُ الهَدْى، فَلَمْ يَقْدِرُوا عَلَى العُمْرةِ، قالَتْ: فَدَخَلَ عَلَى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَنَا أَبْكِي فقالَ: (ما يُبْكِيكِ ياهَنْتاهُ). قُلْتُ: سَمِعْتُ قَوْلَكَ لأَصْحابِكَ، فَمُنِعْتُ العُمْرَةَ، قَالَ: (وَما شَأْنُكِ) قُلْتُ: لاأُصلي، قَالَ: (فَلاَ يَضِيرُكِ، إنَّما أنْتِ امْرَأَةٌ مِنْ بَناتِ آدمَ، كَتَبَ اللهُ عَلَيْكِ ماكَتَبَ عَلَيْهِنَّ، فَكُونِي في حَجَّتِكَ، فَعَسى اللهُ أَنْ يَرْزُقَكيهَا).

قالَتْ: فَخَرَجْنا في حَجَتِهِ حَتَّى قَدِمْنَا مِنَى، فَطَهُرْتُ، ثُمَّ خَرَجْتُ مِنْ منى، فَأَفضْتُ بالبَيْتِ، قَالَتْ: ثُمَّ خَرَجْتُ مَعُه في النَّفَرِ الآخِرِ، حَتَّى نَزلَ المُحَصَّبَ، وَنَزَلْنا مَعَهُ، فَدَعَا عَبْدالرَّحمنِ بْنَ أبي بَكْرٍ، فَقَالَ: (اخْرُجْ بأُخْتِكَ مِنَ الحَرَمِ فَلْتُهِلَّ بِعُمْرَةٍ، ثُمَّ افْرُغَا، ثم ائْتياها هُنا، فَإني أَنْظُرُكُمَا حَتَّى تَأْتِياني). قالَتْ: فَخَرَجْنَا حَتَّى إذا فَرَغْتُ، وَفَرَغْتُ مِنَ الطَوافِ، ثُمَّ جِئْتُهُ بِسَحَرٍ فَقالَ: (هَلْ فَرَغْتُمْ) فقلتُ: نَعَمْ، فآذَنَ بالرَّحيلِ في أصْحابِهِ، فارْتَحلَ النَّاسُ فَمَرَّ مُتَوجِهاً إلى المدينَةِ). (الحديث ١٥٦٠)[١٥٦]:

عائيشه (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەمانگەکانی حەج و لە شەوەکانی حەج و لەشوێن و کات و بارودۆخەکانی حەج دا، لەساڵی حەجی ماڵاوایىدا، لە خزمەت پێغەمبەردا، لەگەڵ جەماوەرێکی حەجکاری زۆردا، لەمەدینەوە بەرەو مەککە کەوتینەڕێ بۆ حەج، ڕۆیشتین هەتا گەیشتینە سەرەف، کە ناوی شوێنێکە دەکەوێتە سەر سنووری مەککە، لەوێ بارو بنەمان خست و دابەزین. عائیشە فەرمووی: جا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەگومەزییەکەی دەرچوو، تەشریفی برد بۆ ناو هاوڕێکانی، پێیانی فەرموو؛ (هەرکەسێ ئاژەڵی دیاریی بەیتی پێ نییە، ئەگەر حەزدەکا

---

(١٥٦) قالَ العيني: (وَأخرجَهُ مسلم في الحج، ايضا) (صم/٨ ص١٣٨. باب حَج الحائض إلي ص١٥٠) — المترجم).

باحەجەکەی هەڵوەشێنێتەوەو بیکات بە عەمرە، بەڵام ئەوەی کە ئاژەڵی دیاریی بەیتی واپێ با بەردەوام بێ لەسەر حەجەکەی‌و ئیحرام نەشکێنێ). عائیشە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جا بەپێی حاڵ، هەندێ لە هاوڕێیانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) حەجەکەیان کرد بە عەمرە، وە هەیانبوو نەیانکرد بە عەمرەو بەردەوام بوون لەسەر حەج).

عائیشە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەڵام پێغەمبەرو کۆمەڵێ لە هاوڕێیانی تەوانایان هەبوو، ئاژەڵی دیاریی خانەی خودایان پێ بوو، لەبەرئەوە ڕێگەی عەمرە کردنیان نەبوو. عائیشە فەرمووی: جا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) تەشریفی هات بۆ لام، من لەوکاتەدا دەگریام، فەرمووی: (ها کچکە! ئەوە چیتە بۆ دەگری ؟!). گوتم: گوێم لەفەرمایشتەکەی تۆبوو، دەبینم ئەم عەمرەیەم لە کیس چوو. فەرمووی: (بۆچی چیتە کەوا ناتوانی عەمرە ئەنجام بدەی ؟!) گوتم: بێنوێژم، نوێژو شتی تری وام بۆ ناکرێ! فەرمووی: (قەیناکات، زیانی نییە بۆت، ئەوە شتێکی خوانووسە، تۆیش یەکێکیت لەکچانی نەوەی ئادەم، خودا لەچارەی هەموو مێینەیەك لەنەوەی ئادەم ئەم بێنوێژییەی نووسیوە، کەواتە: بەردەوام بە لەسەر حەجەکەت، خوا یاربێ عەمرەکەیشت بە نسیب دەبێ).

عائیشە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئیتر پێ بەپێی پێغەمبەر لەو حەجەیدا، لەگەڵی ڕۆیشتین، هەتا گەیشتینە مینا، لەوێ لە بێنوێژیی پاکەوە بووم، ئەوجا لە میناوە چووم بۆ مەککە، لەوێ تەوافی ئیفاچەی بەیتم کرد.

عائیشە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەپاشا لە خزمەت پێغەمبەردا لە ڕۆژی سیازدەی قوربانـدا، لـە ڕۆژی چـوارەمی ڕۆژەکانی مینادا، دەرچووم، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) ڕۆیشت هەتا لەموحەصەب دابەزی، وەئێمەش

لەوێ لە خزمەتیدا دابەزین. جا عەبدوڕڕەحمانی برامی بانگ کردو پێی فەرموو: (لەگەڵ عائیشەی خوشکتا بڕۆ، تا لە بەست (خاکی حەرەم) دەچنە دەرەوە، با لە تەنعیم عائیشە ئیحرامی عەمرە دابەستێ، کاتێ لێبوونەوە وەرنەوە بۆلای خۆم بۆ ئێرە، چونکە من لێرە چاوەڕوانتان دەکەم هەتا دێنەوە بۆ لام).

عائیشە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جامن و عەبدوڕڕەحمانی برام دەرچووین، هەتا لەعەمرەکە بوومەوە، وەلەتەوافی وەداع بوومەوە، ئەوجا لە بەرە بەیانا چوومەوە بۆ خزمەت پێغەمبەر.

فەرمووی: (وادیارە لەعەمرەکەت لێبوویتەوە؟). گوتم: بەڵێ، ئەوسا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) جاڕیدا بەناو هاوڕێیانیدا کەوا دەگەڕێینەوە، ئەوسا خەڵکەکە کەوتنە ڕێو بەرەو مەدینە گەڕانەوە). (بڕ:بەرگی/١ ل/٣٤٨)

٧٥٠- وَعَنْها رَضِي اللّٰهُ عَنْها في رِوايَةٍ: قَالَتْ: خَرَجْنا مَعَ النبِيّ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ولا نُرَى إلا أنَّهُ الحَجُّ، فَلَمَّا قَدِمْنا تَطَوَّفْنا بالبَيْتِ، فَأمَرَ النبِيُّ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَنْ لَمْ يَكُنْ ساقَ الهَدىَ أنْ يحِلَّ، فَحَلَّ مَنْ لَمْ يَكُنْ سَاقَ الهَدىَ وَنِساؤُهُ لَمْ يَسُقْنَ فَأحْلَلْنَ، قَالَتْ صَفيَّةُ: مَاأُراني إلاَّ حَابِسَتُهُمْ، قَالَ: (عَقْرى حَلْقى، أَوَ ماطُفْتِ يَوْمَ النَّحْرِ؟) قالَتْ: قُلْتُ: بَلى، قَالَ: (لابَأسَ انفِرِى). (الحديث: ١٥٦١)[١٥٧]:

دیسان لەگێڕانەوەیەکی تردا عائیشە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ساڵی حەجەکەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) لەمەدینەوە لەخزمەت پێغەمبەردا کەوتینە ڕێ بۆ مەککە، وامان هەست دەکرد کە دەچین بۆ حەج و بەس،

(١٥٧) أخرجهُ مسلم في الحج، باب: بيان وجوه الأحرام... رقم: ١٢١١.

کاتێ گەیشتینە پێشەوە تەوافی بەیتمان کرد، ئەوجا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمانی کرد: هەرکەسێ ئاژەڵی دیاری خانەی خودای واپێ با ئیحرام بشکێنێ، جائەوانە ێکەدیاری بەیتیان پێنەبووکردیان بە عەمرەو ئیحرامیان شکاند، ژنەکانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) ئاژەڵی دیاری بەیتیان نەهێنابوو لەگەڵ خۆیان، لەبەرئەوە ئەوانیش ئیحرامیان شکاند، شەوی نەفر، سەفییە (رەزای خوای لێ بێ) کەوتە سەر بێنوێژیی، جا صەفییەی هاوسەری پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (وابزانم گلتان دەدەمەوە، چونکە کەوتوومەتە بێ نوێژییەوەو هێشتا تەوافی ماڵاوایی (طهوا في ويداع) یشم نەکردووە، پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەش بەبارو زار بە ئازار بێ، بۆ خێر بە دەمیا نایێ ئەی ڕۆژی جەژن تەوافی نەکردووە ؟).
عائیشە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: گوتم: با، ئەی پێغەمبەری خودا ئەو تەوافەی کردووە، بەڵام تەوافی ماڵاوایی نەکردووە؟ فەرمووی: (دەبا بکەوێتە ڕێ لەگەڵمان دەڕۆینەوە بۆ مەدینە، مادەم تەوافی فەرزی بەجێهێناوە، تەوافی ماڵاوایی بۆ ئەو، لەبەرئەوەی کە بێ نوێژە، نەشی کات قەیناکات (تاج/٢/٢٢٧-٦).

## ڕوونکردنەوە:

صەفییەی کچی حویەیی کوڕی ئەخطەبی نەضرییە (رەزای خوای لێ بێ) بە ڕەگەز جوولەکەیە، لە نەوەی حەزرەتی هاروونی برای حەزرەتی مووسایە سڵاوی خودا لەسەر پێغەمبەری خۆمان و ئەوانیش بێ- لە غەزای خەیبەردا یەخسیرکرا، کاتێ ژنە تاڵانییەکان دابەش دەکرێن بەسەر جەنگاوەرەکانا، صەفێ بەر دەحیەی کەلبی دەکەوێ، بەڵام لەپاشا عەرزی پێغەمبەر دەکەن، کە صەفێ شازادەیە، هەر قابیل بەخۆیەتی، ئیتر پێغەمبەریش وەریدەگرێتەوە لەدەحیەو مارەیکرد لەخۆیو ئازادیکردو

ئازادکردنەکەی خستە بری مارەیی بۆی. صەفییە خاتوون دە فەرموودەی گێڕاوەتەوە، یەك فەرموودەی لە بوخاریدا هەیە.

صەفیٚ زۆر هێمنو بەڕێزو سەلارو هۆشمەند بوو، لە سەرەمەرگا عەرزی پێغەمبەری کرد: ئەی پێغەمبەری خودا ! سوێندم بەخودا حەزدەکەم کە ئەم ئێش‌و ئازارەی تۆ بەمنەوە بوایە نەوەك بەتۆوە، پێغەمبەر ـدروودی خوای لەسەر بێـ فەرمووی: ڕاست دەکەیت.

قسە دەگاتەوە بە صەفیٚخان کە حەزرەتی عائیشەو حەزرەتی حەفصە دەڵێن: صەفیٚ بنە جووە، ئێمە لەو باشترین، ئێمە ئامۆزای پێغەمبەرین، ئەو کچە جوولەکەیە، ئەویش لەداخا دەست دەکا بەگریان، پێغەمبەر دەچیٚ بە سەریا، دەڕوانیٚ دەگری، دەفەرمویٚ: ئەوە بۆچی دەگری؟ دەڵیٚ: حەفصەی ژنت‌و عائیشەی ژنت پێم دەڵێن: من کچە جوولەکەم‌و تانەی بنە جوویيم لیٚ دەدەن. پێغەمبەر فەرمووی: بۆ پێت نەگوتن: منیٚ کە باوکم هاروون پێغەمبەر بیٚ و، مامەم موسا پێغەمبەر بیٚ وٚ، مێردم موحەممەد پێغەمبەر بیٚ، ئیتر چۆن ئێوە لە من باشتر دەبن. لەمانگی ڕەمەزانی ساڵی پەنجای کۆچیدا، لە سەردەمی موعاوییەدا خاتوو صەفیٚ گیانی پاکی سپارد. ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێبیٚ. (بڕوانە: تاج/٩٣/٣ ف/٣ + ل/٨٢ ف/٢ + تاج/١٦١/٥- ف/١ + تاج/٢٢٣/٨ ف/١).

٧٥١- وَعَنْهَا - في رِوايَةٍ أُخْرى- قالَتْ: خَرَجْنا مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَامَ حَجَّةِ الوَداعِ، فَمنَّا مَنْ أَهَلَّ بِعُمْرةٍ، وَمِنَّا مَنْ أَهَلَّ بِحَجَّةٍ وَعُمْرةٍ، وِمِنَّا مَنْ أَهَلَّ بالحَجِ، وَأَهلَّ رَسُولُ الله صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بالحَجِ، فَأَمَّا مَنْ أَهَلَّ بالحَجِ، أوْ جَمَعَ الحَجَّ والعُمْرةَ، لَم يَحِلُّوا حَتَّى كَانَ يَوْمُ النَّحْرِ. (الحديث ١٥٦٢)[158]:

(١٥٨) وجه آخر من حديث عائشة (رضي الله عنها) الذي سبق برقم:٧٥٠ - المترجم

لەگێڕانەوەیەکی تردا عائیشە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەساڵی حەجی ماڵاواییدا، لەمەدینەوە لەخزمەت پێغەمبەردا، لەمانگەکانی حەجا، بەرەو مەککە کەوتینە ڕێ، لەسەر ئەم سێ شێوەیە ئیحراممان دابەست: هەمان بوو بەس ئیحرامی عەمرەی بەستبوو، هەمان بوو ئیحرامی حەج و عەمرەی بەسەر یەکەوە بەستبوو، هەمان بوو بەس ئیحرامی حەجی بەستبوو، پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- ی بەس ئیحرامی حەجی بەستبوو، جا ئەوانەی کە تەنیا ئیحرامی حەجیان بەستبوو، لەگەڵ ئەوانەدا کە ئیحرامی حەج و عەمرەیان بەسەر یەکەوە بەستبوو، ئیحرامیان نەشکاند هەتا یەکەم ڕۆژی جەژن). (تاج/٢/١٧٣- د - ش/د/ن).

٧٥٢- عَنْ مَرْوَانَ بْنِ الْحَكَم قَالَ: شَهِدْتُ عُثْمانَ وَعَلِياً رَضِي اللّهُ عَنْهُ ثُمانُ يَنْهى عَنِ المتْعَةِ، وَأنْ يُجْمَعَ بَيْنَهُمَا، فَلَمَّا رَأى عَلِيٌّ أَهَلَّ بِهِمَاك لَبَّيْك بِعُمْرَةٍ وَ حَجَّةٍ، قَالَ: مَاكُنْتُ لأدَعَ سُنَّةَ النَّبِيّ صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وْلِ أحِدٍ (الحديث ١٥٦٣ - طرفه في١٥٦٩) [١٥٩]:

مەڕوانی کوڕی حەکەم فەرمووی: ساڵێ لەسەردەمی جێنشینیی عوسماندا، دەرچووین بۆ حەج، لە عوسفان، کە دەوری سیی و شەش میل لە مەککەوە دوورە، خۆم بە دیارەوە بووم، عوسمان نەیی دەکرد لە موتعەی حەج، هەروا نەیی دەکرد لە قیران کە ئەوەیە حەج و عەمرە تێکەڵ بکرێن و بەیەکەوە بکرێن، بەڵکو ڕای وابوو حەج لەسەر شێوەی إفراد بکرێ، واتە: حەج بەجیا، بکرێ و عەمرە بەجیا، ئیمامی عەلی کە ئەمەی بینی فەرمووی: ئەی عوسمان ! ئەمەی تۆ دەیڵێیت پێچەوانەی ئەوەیە کە پێغەمبەر خۆی کردوویەتی !

(١٥٩) أنظر مسلم: الحج، باب: جواز التمتّع، رقم: ١٢٢٣

جا بۆ ڕێنمایی‌و بۆ پیادەکردنی گوتار بەکردار، عەلی خۆی بە پێچەوانەی نەهیەکەی عوسمانەوە، عەمرەو حەجی بەیەکەوە دابەست‌و فەرمووی: (لَبَيْكَ بِعُمْرَةٍ وَحَجَّةٍ: خودایە ! ئیحرامی حەج و عەمرە بەیەکەوە بۆ تۆی گەورە دادەبەستم). عەلی ئەوجا فەرمووی: (بەقسەی کەس واز لە ڕێبازو سوننەتی پێغەمبەر ناهێنم -درودی خوای لەسەر بێ-)

٧٥٣- عَنِ ابْنِ عَبّاسَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ قالَ: كانُوا يَرَوْنَ أنَّ العُمْرَةَ في أشْهُرِ الحّج مِنْ إفْجَرِ الفُجُورِ في الأرضِ، وَيَجْعَلُونَ المحرَّمَ صَفَراً، وَيَقُولُونَ إذا بَرأ الدَّبَرْ، وَعَفَا الأَثرُ، وَانسَلَخَ صَفرْ، حَلّتِ العَمْرةُ لِمَنِ اعْتَمَرْ. قَدِمَ النبيُّ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ وأَصْحابُهُ صَبيحَةَ رابِعَةٍ مُهِلينَ بالحَجِ، فَأَمَرَهُمْ أنْ يَجْعَلُوها عُمْرةً، فَتعاظَ ذلِكَ عِنْدَهُمْ، فَقالُوا: يارَسولَ الله أيُّ الحِلِّ ؟ قالَ: (حِلٌّ كُلُّهُ). (الحديث ١٥٦٤)[١٦٠]:

ئیبنوعەباس (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەسەردەمی پێش ئیسلاما، هۆزی قوڕەیش و ئەوانەی کەلەسەر ئایینە پووچەکەی قوڕەیش بوون، وایان دانا بو کەکردنی عەمرە لەمانگەکانی حەجدا۔ لەگوناهە هەرە گەورەکانەو لەوە خراپتر ڕووی نەداوە لەسەر ڕووی زەوی! وە لەباتی مانگی موحەڕڕەم، کە خۆی یەکێکە لەو چوار مانگە کە ناودارن بە ئەشهەرول حوروم، کە ڕەجەب و شەعبان و قوربان و موحەڕرەمن، دەچوون مانگی صەفەریان دەکرد بە مانگی حەرام، لە جیاتی موحەررەم. وەئاوا کاتی کردنی عەمرەیان دیاری دەکردو دەیانگوت: کاتێ زام‌و ناوکەڕێژی پشتی ولاخی ژێر حاجیان، لەپاش تەواوکردنی حەج ساڕێژ بوو، وەشوێنەواری کاروانی حاجیان کوێرەوە بوو، وەمانگی موحەررەم

---

(١٦٠) اخرجه مسلم في الحج، باب: جواز العمرة في أشهر الحج رقم: ١٢٤٠.

تەواو بوو، ئەو حەلە هەركەسێ بیەوی عەمرە بكا، عەمرەی بۆ دروست بوو!

جا كاتێ لەحەجی ماڵاواییدا، كە پێغەمبەرو هاوڕێكانی -دروودی خوای لەسەر بێ- لەبەیانی ڕۆژی چوارەمی مانگی قورباندا هاتن بۆ مەككە، ئیحرامی حەجیان بەستبوو، ئیتر پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمانی پێكردن، كە حەجەكەیان بكەن بە عەمرەو، لەپاشا ئیحرام بشكێنن لەپاش تەواوكردنی كردارەكانی عەمرە، بەڵام ئەوان ئەم كارە زۆر گەورەوگران بووە لەسەر شانیان، چونكە ئەوان لەوەوپێش شتی وایان نەدیبوو، وەكردنی عەمرەیان لەمانگەكانی حەجدا، بەگوناهێكی گەلێ گەورە دادەنا، ئنجا كە بەباشی لە باسەكە تێگەیشتن گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا ! بەم ئیحرام شكاندنە چیمان بۆ حەلاڵ دەبێتەوە، لەو شتانەی كەبەهۆی ئیحرام بەستنەوە لێمان قەدەغە بوو بوون؟ فەرمووی: (هەموو شتێكتان بۆ حەلاڵ دەبێتەوە). (تاج/٢/٢٤٥ -١-١/د)

٧٥٤- عَنِ ابْنِ عُمَرَ عَنْ حَفْصَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، زَوْجِ النبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهَا قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَا شأنُ النَّاسِ حَلُّوا بِعُمرَةٍ وَلَمَ تَحْلُلْ أَنْتَ مِنْ عُمْرِتِكَ؟ قَالَ: إني لَبَّدْتُ رَأسِ، وَقلدْتُ هَدْيِي، فَلا أَحِلُّ حَتىَّ أنْحَرَ). (الحديث ١٥٦٦ - أطرافُهُ في: ١٦٩٧، ١٧٢٥، ٤٣٩٨، ٥٩١٦)[١٦١]:

ئیبنوعومەر لە حەفصەی خوشكیەوە كە هاوسەری پێغەمبەر بوو -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (ئەی پێغەمبەری خودا ! ئەوە بۆچی ئەو خەڵكەی تر ئیحرامیان شكاندو كردیان بە عەمرە، كەچی تۆ وات نەكرد؟ فەرمووی: (ئاخر من قژە سەری خۆم پەستاندووەتەوەو، وشتری دیاریی بەیتم لەگەڵ خۆم هێناوەو، نیشانەم كردوون و، سەرو جووت سۆڵم

(١٦١) اخرجه مسلم في الحج، باب: بيان ان القارن لايتحلل الأ.. رقم: ١٢٢٩.

كردۆته مليان، تا خەڵك بزانن كە ئەوە دياريى بەيتە، لەبەرئەوە من ئيحرام ناشكێنم هەتا قوربانى سەرنەبڕم).

٧٥٥- عَنْ شُعْبَةَ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ قالَ: أخْبَرَنَا أبوُ جَمْرَةَ، نَصْرُ بْنُ عِمْرانَ الضُبَعِيُّ، قَالَ: تَمَتَّعْتُ فَنَهاني ناسٌ، فَسَألْتُ ابنَ عَباسٍ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ فَأمَرَني، فَرأيْتُ في المَنامِ كأنَّ رَجُلاً يَقُولُ لي: حَجٌّ مَبْرُورٌ، وَعَمْرَةٌ مُتقبَّلَةٌ، فَأخْبَرْتُ ابْنَ عَباسٍ، فَقَالَ: سُنَّةُ النبيَ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقالَ: لي أقِمْ عِندِي فَأجْعَلُ لَكَ سَهْماً مِنْ مالي، قَالَ شُعْبَةُ: فقُلْتُ: لِمَ؟ فَقَالَ: لِلرُّؤْيا الَتِي رَأيْتُ. (الحديث ١٥٦٧ – طرفه: ١٦٨٨)[١٦٢].

شوعبە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەبو جەمرە، نەصرى كوڕى عيمرانى چوبەعى هەواڵى پێمان دا، فەرمووی: جارێ چووم بۆ حەج تمتعم كرد، چەند كەسێ گوتيان شتى وا مەكە، منيش بۆ ئەم مەسەلەيە لە ئيبنو عەبباسم پرسى، فەرمووی: بيكە قەيناكا، جا شەوێ لە خەوما، وەك پياوێ پێم بڵێ: حەجەكەت پيرۆزبێ و عەمرەكەت قەبووڵ بێ ! منيش ئەم خەونەم بۆ ئيبنو عەبباس گێڕايەوە، فەرمووی: ئەڵلاهو ئەكبەر، ئەڵلاهو ئەكبەر، حەج و عەمرە لەسەر شێوەی تەمەتتوع، سوننەتە، پێغەمبەر خۆ (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمانى پێكردووە، ئەوجا ئينو عەباس فەرمووی پێم: (لەلاى من بمێنەوە، پشكێ لە سامانەكەمت بۆ دەبڕمەوە، وەئەم خەونەت لەبارەی موتعەی حەجەوە بۆ مەردوم بگێڕەرەوە) شوعبە فەرمووی بە ئەبوجەمرەم گوت: لەبەرچى وايفەرموو ؟ فەرمووی: لەخۆشى ئەم خەونە كەمن لەم بارەيەوە بينيم، كە بەڵگەی ڕاستو دروستى فەتواكەی ئيبنو عەباس بوو، سەبارەت بەكردنى عەمرەو حەج لەسەر شێوەی تەمەتتوع).

(١٦٢) أخرجه مسلم في الحج، باب: جواز العمرة في أشهر الحج، رقم: ١٢٤٢.

## ڕوونکردنەوە:

ئەم چەند بەهرانە لەم فەرموودەیە وەردەگیرێن:

١. مژدانـە دروسـتە، کەسـێ هـەواڵێکی خۆشـت پـێ دەدا، واباشـە خـەڵاتی بکەی، مژدانەیەکی سامانی پێ بدەی.

٢. کاتـێ قـسەی زانـایی ڕێکـی حـەق دەرچـوو، خۆشـحاڵی دەربـڕین بـۆی دروستە.

٣. دروسته خەونی باش، بەتایبەتی کە هی پیاوێکی باش بـێ، بکـرێ بـە پاڵپشت بۆ بەڵگەی شەرعیو، لەم بارەیەوە استئناسی پێ بکرێ.

٤. گێڕانەوەی خەون بۆ زانا کارێکی باشە.

٥. ئـەڵڵاهو ئەکبـەر کـردن لـەکاتی ڕوودانـی خۆشـی و لـەکاتی گەیـشتنی هەواڵی خۆشدا باشەو کارێکی پەسەندە.

٦. کار بەظاهیری بەڵگە دەکرێ، هەتا بە بەڵگەیێ غەیری ظاهر تـەرجیح دەکرێ.

٧. ڕاجیـایی لـەنێوان زانایانـدا دروسـتە، بـەنیازی ئـەوە کـە فەرمایـشتی بەهێز کارێکی بەڵگەکاری پێ بکرێ، هـەروەك دەبـێ بـەهۆی ڕەحمـەت بۆ ئوممەت.

٨. شـوعبەی کـوڕی حـەججاج (رەزای خوای لێ بێ) تـابیعی تابیعىیـە، بەیـەکڕایی زانایـان پێـشەوایەکە لەپێـشەوایانی فـەرموودە، شـوعبە لـەپیاوان (رجـال)ی صـحیحەینە، جێگـەی بتمانـەی شـێخی بوخـاریو شـێخی موسلیمە، تەنیا ئەو لـە (کوتـوبی سـیتتە = شـەش پـەڕاوە) کـەدا نـاوی شوعبەی کوڕی حەججاجە، بـەڵام شـوعبە نـاوی تـر، کـە نـاوی بـاوکی جیابـێ لـە نەسـائیو ئـەبوداودا هەیـە، شـوعبەی کـوڕی تەوئـەمیش

هەندێ دەڵێن: صەحابیيە، ئەگەر وابێ شوعبەناو لەناو یارانی پێغەمبەردا هەیە، لە ئیصابەدا دەفەرموێ: شوعبەی عەنبەری، پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- بە ذوئەیبی کوڕی دەفەرموێ: (خودا پیت و فەڕت تێخاو بتهێڵێ بۆ باوك و دایکت) کەچی لە تەرجەمەی ناوی ذوئەیبا، لە ئیستیعاب‌و لەاصابەدا: ذوئەیبی کوڕی شوعثەم نووسروە، لە ئیستیعابدا: ذوئەیبی کوڕی شوعثەنی عەنبەریش نووسراوە، لەئیصابەش دا ئاماژە بۆ شوعثەن کراوە!

پێشەوا موسلیم -ڕەحمەتی خودای لێ بێ- پەسەن‌و مەتحێکی زۆری جوانی شوعبە دەکا، بەتایبەتی لەپێشەکی صەحیحی موسلیم دا دەفەرموێ: (پێشەوایانی فەرموودەناسەکان وەك: مالیکی کوڕی ئەنەس‌و شوعبەی کوڕی حەجاج‌و سوفیانی کوڕی عویەینەو یەحیای کوڕی سەعیدی قەططان‌و عەبدو ڕڕەحمانی کوڕی مەهدی و.. لەپێشەوا پایە بەرزەکانی فەرموودەن).

سوفیانی ثەوری – کە هاوڕێی فەقێیەتی بووە، ئاوا شوعبە دەنرخێنێ: (شوعبە میری ئیماندارانە لەزانستی فەرموودەدا). ئیمامی ئەحمەد دەفەرموێ: (لەم بوارەدا شوعبە بەتەنیا خۆی نەتەوەیەکی سەربەخۆیە).

یەحیای کوڕی سەعید دەفەرموێ: (لە سوفیانی ثەوری و شوعبەو مالیکی کوڕی ئەنەس‌و ئیبنو عویەینەم پرسی لەبارەی پیاوێکەوە کە (ثبت = چەسپاو) نەبێ، گەلێ جار هەندێ پیاو لەبارەی پیاوی واوە پرسیارم لێ دەکەن ؟!

فەرموویان: (تەنیا ئەوەندەیان پێ بڵێ: کە ئەو پیاوە چەسپاو (ثبت)

نییه). عەبدوڵلای کوڕی موبارەك دەفەرموێ: (چووم بۆ خزمەت شوعبە، کە گەیشتمە خزمەتی گوێم لێبوو دەیفەرموو: ئەو پیاوە عوببادی کوڕی کەپیرە پارێز لەگێڕانەوەی فەرمووده لەوە وەبکەن).

عەبدوڵلای کوڕی موعاذی ئەل عەنبەری دەفەرموێ: باوکم فەرمووی: نامەم نووسی بۆ شوعبە، لەبارەی ئەبوشەیبەوە، کە قازی واسیط بوو، لێیم پرسی، فەرمووی: شوعبە بەنامە وەڵامی دامەوە، فەرمووبوی: ڕیوایەتی لێوە مەکە، واتە: زەعیفو لاوازە.

جا لەبەرئەوەی کە ئاژاوە دروست نەبێ، نامەکەی من بۆیم نووسی بوو دەدڕێنی، نەبادا بگاتەوە بەقازی و بەحوکمی ئەوەی کە قازییە کێشەیێ، ئازارێ، ناهەمواریەکمان بۆ دروست بکا.

نموونەیێ لە (جەرحو تەعدیل) ئیمامی موسلیم ڕەحمەتی خودای لێبێ دەفەرموێ: مەحموودی کوڕی غەیلان فەرموودەی پێمان فەرموو، ئەبو داوود فەرموودەی پێمان فەرموو: فەرمووی: شوعبە پێی فەرمووم: بچۆ بۆ لای جەریری کوڕی حازم، پێی بڵێ: (ڕەوانییە بۆت کە گێڕانەوەی فەرمووده لە حەسەنی کوڕی عومارەوە ئەنجام بدەیت چونکە درۆدەکا).

ئەبوداوود فەرمووی: گوتم بەشوعبە: بۆم ڕوون بکەرەوە چۆن؟ شوعبە فەرمووی: (چەند شتێکی بۆمان گێڕایەوە لەحەکەمەوە، کە چوومە بنج و بناوانی وانەبوو، بێبناغە بوو) گوتی: پێم گوت: وەکو چی؟ فەرمووی: لە حەکەممم پرسی: ئایا پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێ نوێژی لەسەر تەرمی شەهیدەکانی ئوحود کردووە ؟

فەرمووی: نوێژی لەسەر نەکردوون، کەچی حەسەنی کوڕی عومارە لە حەکەمەوە، لە میقسەمەوە، لە ئیبنوعەبباسەوە، دەفەرموێ: پێغەمبەر

دروودی خوای لەسەر بێ نوێژی مردووی لەسەر تەرمی شەهیدانی ئوحود کردووەو ناشتوونیشی).

لە حەکەمم پرسی: سەبارەت بەمناڵی زۆڵ چی دەفەرمووێ ؟

فەرمووی: (نوێژ لەسەر تەرمی زۆڵ دەکرێ) عەرزیم کرد: لە فەرموودەی کێدا شتیوا گێڕدراوەتەوە ؟

فەرمووی: لە حەسەنی بەصرییەوە دەیگێڕنەوە، کەچی حەسەنی کوڕی عومارە لەم بارەیەوە دەڵێ: حەکەم لە یەحیای کوڕی جەززارەوە لە عەلی کوڕی ئەبو تالیبەوە !).

مەبەست لەم ڕوونکردنەوە لە پلەی یەکەما، پیادەکردنی زانستی فەرموودەیە، ئاشنابوونە بە کەڵە پیاوانی فەرمووده شوناس، لەبەرئەوە درێژە پێدانی بێ بەهرە نابێ.

هەندێ زانیاری بەنرخی تر لەبارەی شوعبەوە، شوعبە زمان پیس بوو، کەسناوی ئەبو بوسطامە نازناوی ئەزدییە، لە واسیط و لە بەصرە ژیاوە، فەرموودەی لە زۆرکەس وەرگرتووە، خۆی فەقێو شاگردی زۆری هەبووە، شوعبە مامۆستای بوخارییە، واتە: شێخی شێخەکەیەتی، لەم فەرموودەی کە واین لەخزمەتیدا، ڕشتەکەی لەصەحیحی بوخاریدا ئاوایە: بوخاری دەفەرمووێ: (حَدثنا آدَمُ حدَّثَنا شُعبَةُ.. تاد) هەندێ لەمامۆستاکانی شوعبە:

١- عەطای کوڕی سائیب، عەطا لەکۆتایی تەمەنیدا تووشی تێکەڵ و پێکەڵی بووبوو، بەڵام سوفیانی ثەوری، شوعبە لەسەردەمی متمانە پێکراویدا فەرموودەکانیان لێ بیستووە، لەبەرئەوە فەرموودەی ئەم دوو

زاته له عەطاوه ئیحتیاجی پێدەكرێ، هەروا ئەو فەرموودانەی كەوان لە صەحیحەینداو لەعەطاوەن هی پێش ئیختیلاط (تێكەڵ و پێكەڵی)ن.

٢- الحكم: ثقه بوو، جێگەی باوەڕ بوو، متمانه پێكراوی فەرموودەناسان بوو، لەپیاوانی صەحیحەینه، نەوەوی لەبارەیەوه دەفەرموێ: (ج/١/٦٣): (حەكەمی كوڕی عوتەیبه یەكێكه لە شەرعزانه گەورەكانی تابیعین و، یەكێكه لەبەنده هەره خواپەرستەكانی تابیعین).

یەكەم فەرموودەی لەبوخاریدا فەرموودەی ژماره (١١٧)میه لە فەتح الباریدا. شێخی عەینی دەفەرموێ (ج/٢/١٧٨): (پیاوێكی خواناسی سۆفیلكەی سوننەتپەروەر بوو، جێگەی متمانەی فەرمووده شوناسان بوو، كۆمەڵی فەرمووده شوناسەكان فەرموودەكانی ئەویان گێڕاوەتەوه، ساڵی سەدو چوارده، یا سەدو پازدەی كۆچی مردووه).

٣- مەنصوری كوڕی معتمری كوڕی عەبدوڵڵا، لە پیاوانی صحیحین و شەش پەڕاوەكەیه، شێخی بوخاری لەصەحیحی بوخاریدا فەرموودەكانی لەم زاتانەوه دەگێڕێتەوه: لە شوعبەو ثەوری و ئیبنو عویەینەو شەیبانو ڕوحی كوڕی قاسمو حەممادی كوڕی زەیدو جەریری كوڕی عەبدولحەمید، پێشەوا نەوەوی دەفەرموێ: (ئەحمەدی كوڕی عەبدوڵڵا دەفەرموێ: چەسپاوترینی خەڵكی كووفه مەنصووره، ڕاستو ڕەوانه وەكو دووخ، كەسێ نییه لە فەرمووده شوناسان كە ڕەخنەی لێی هەبێ، شەست ساڵ بەڕۆژ بەڕۆژوو دەبوو، بە شەویش شەونوێژی دەكرد، پەرستشو زوهدو وەرعی لە ئەندازه بەدەر بوون، میریی بەزۆر ویستی بیكا بە قازی قەبووڵی نەكرد، ڕەحمەتی خودای لێ بێ..).

هەندێ لە شاگردەكانی شوعبه:

١- يـەحیای كـوڕی سـەعیدی قـەططـان، كەسـناو (كونیـە)ی ئـەبو سەعیده، كۆمەڵەی فەرمودەناسـەكان فـەرموودەكانی ئـەویان گێڕاوەتـەوە، بـەكۆی دەنـگ، بـەبێ ڕاجیـایی دایاننـاوه بەپێـشەوایەكی پایەبـەرزی حوججـەی متمانـە پێكـراو، شـاگردی ئـەم زاتانـە بـووه، لەگێڕانـەوەی فەرموودەدا:

یـەحیای ئەنـصاری و موحەممـەدی كـوڕی عـەجلان و ثـەوری و ئیبنوئـەبیء ذیئـب و مالیـك و شوعبەوكەسـانی تـریش، ئـەم زاتانـەیش شاگردی ئەوبوون.

ثەوری و ئیبنوعویەینـەو شـوعبەو عەبـدوڕڕەحمانی كوڕی مەهـدیو ئەحمـەدو یـەحیای كوڕی معینو عـەلی كوڕی مـداینی و ئیسحاقی كوڕی ڕاهەوەیـە و.. كەسـانی تریـشن كەواتـە: هەنـدێ لـە فـەقێكانی مامۆستاشـی بـوون، وەك: ثـەوری و شـوعبە، شـتی وایـش لەگێڕانـەوەدا هـەر زۆر زۆرە، یەحیای كوڕی معین دەفەرموێ: (بیست ساڵی ڕەبـەق لەسـەر یـەك هـەموو شەوو ڕۆژێ یەحیای كوڕی سـەعید، خـەتمێكی قورئـانی دەكـرد، چل سـاڵ لەسەر یەك یەحیا لەكاتی زەوادا ئامادەی مزگەوت دەبوو).

٧٥٦ – عَنْ جابِرِ بْنِ عَبْدِاللهِ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ: أَنَّهُ حَجَّ مَعَ النبِيِّ صَـلّٰى اللّٰـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ سَاقَ البُدْنَ مَعَهُ، وَقَدْ أَهَلُّوا بالحَجِّ مُفْرِداً، فَقَالَ لَهُمْ: (أَحِلُّوا مِنْ إِحْرامِكُمْ، بِطَوافِ البَيْتِ وَ بَينَ الصفَا وَالمَرْوَةِ، وَقَـصِّرُوا، ثُـمَّ أَقِيمُـوا حَـلالاً، حتىَّ إذا كانَ يَوْمُ الدَّرْوِيَةِ فَأَهِلُّوا بالحَجِّ، وَاجْعَلُوا التي قَدِمْتُمْ بها مُتعَة). فَقَـالُوا: كَيْفَ نَجْعَلُهَا مُتْعَةً وَقدْ سَمَّيْنَا الحَجَّ ؟ فَقَالَ: (أَفعَلُوا ما أَمَرْتُكُم، فَلَوْلا أني سُقْتُ الهَدْيَ لَفَعَلْتُ مِثلَ الذي أَمَرْتُكُمْ، وَلكِنْ لايَحِـلُّ مِـنِي حَـرامٌ حَتَّـى يَبْلُـغَ الهَـدْيُ مَحِلَّهُ) فَفعَلُوا. (الحديث ١٥٦٨):[١٦٣]

جابیری كوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خوای ل بێ) فەرمووی: لەحـەجی ماڵاواییـدا كـە

١٦١/ اخرجه مسلم في الحج عيني (٢٠٢/٢/٩) حم ١٦٦/٨- مَذَاهِبُ العُلَماء في التَحَلُّلُ المُعْتَمِرُ المُتَمَتِعُ – المترجم).

پێغەمبەر -درروودی خوای لەسەر بێ- وشتری دیاری بەیتی لەگەڵ خۆی برد، خۆم لەخزمەتیدا چووم بۆ حەج، لەوحەجەدا حەجکاران بەس ئیحرامی حەجیان بەجیا دابەستبوو، لەسەر شێوەی ئیفراد پێغەمبەر -درروودی خوای لەسەر بێ- بەیارانی فەرموو: (حەجەکەتان هەڵوەشێننەوەو بیکەن بە عەمرە لەسەر ئەم شێوەیە: تەوافی بەیتو سەعی نێوانی صەفاو مەڕوە بکەنو موی سەرتان کورت بکەنەوە ئیتر کردارەکانی عەمرە تەواو. ئیتر لەوەپاش لەم ماوەیەدا بەبێ ئیحرام لە مەککە بمێننەوە، هەتا ڕۆژی تەروییە، کەڕۆژی هەشتەمی مانگی قوربانە، ئەوسا سەرلەنوێ لەناو مەککەوە ئیحرامی حەج بەجیا داببەستنەوە، وەئەو حەجەی کە بەتەنها، لەپێش هاتنتانا بۆ مەککە ئیحرامیتان بەستبوو لەسەر ئەم شێوەیەی باسکرا بیکەن بە عەمرە، وەلەم ماوەیەدا هەتا ڕۆژی تەروییە پشوو وەرگرنو بیکەن بەحەسانەوە). حاجیان فەرموویان: چۆن بیکەین بەعەمرەو پشوو وەرگرین، خۆ ئێمە لە سەرەتاوە ناوی حەجمان لێ ناوەو نێتی حەجمان هێناوە ئیتر چۆن بیکەین بە عەمرە ؟ پێغەمبەر -درروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (من چیتان پێ دەڵێم بەبێ چەندو چون بیکەن، خۆشم لەبەرئەوە نەبێ کە ئاژەڵی دیاری بەیتم لەگەڵ خۆم هێناوە، هەمان شتم دەکرد کە بە ئێوە دەڵێم بیکەن، بەڵام ئەو شتانەی کە بەهۆی ئیحرام بەستنەوە لەمن قەدەغە بووە، بۆم ڕەواو حەڵاڵ نابنەوە- هەتا ئاژەڵە دیارییەکانم نەگەنە جێگەی دیاریکراوی خۆیانو کاتی سەربڕینیان نەیەت، کە ئەوەیە لە ڕۆژی دەی قوربانـدا لە مینا سەربڕێن و بدرێن بە پێشیاوان). (تاج /٢/١٧٤-١).

**ڕاڤەو ڕوونکردنەوە:**

هـەدیی شوێنی سـەربڕینو کـاتی سـەربڕینی تایبـەتی خـۆی هەیـە. هەدیی بـەیت ئاژەڵێکـە کـە دەست بـدا بـۆ قوربـانی، کەواتـە: بـزنو مـەڕو ڕەشەوڵاخو وشتر دەست دەدەن بۆ ئاژەڵی دیاری بـەیت، گامێشیش دەبێ، چـونکە گـامێش بـۆ حوکمـە شـەرعییەکان، حـوکمی ڕەشـەوڵاخی هەیـە، هەدیی هەیەتی نەدرە، ئەوە حوکمی نەزری هەیە، هەیـەتی خێـری ڕووتـە واتە: تطوعه — ئەم جۆرەیان هەموو کەسێ دەتوانێ لێی بخوات.

هـەدیی بـەیت جیایـە لـە قوربـانیو لـە ئـاژەڵی کـەفارەت و لـە خێـری ئاسـایی، ئەمـە بەشێوەیەکی گشتی، بـە زۆرینـەی کـات کـاتی سـەربڕینی هـەدیی بـەیت ڕۆژانـی سـەربڕینی قوربانییـە، بـۆ زانیـاریی تـەواو بڕوانـە (مفتی المحتاج/١ ص/٥٣٢-٥٣٥ — بـاب الاحصار والفوات) + (تـاج/٢/ ٢٥٥ز — ١٢٧- باسی ئاژەڵی دیاریی بەست) + (بڕ: ژمارە: ٧٨٦).

٧٥٧– عَنْ عِمْرَانَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: تَمَتَّعْنَا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَنَزَلَ الْقُرْآنُ، قَالَ رَجُلٌ بِرَأْيِهِ مَاشَاءَ). (الحديث ١٥٧١– طرفه في: ٤٥١٨)[١٦٤]:

موطەرریف فەرمووی: لە سـەرەمەرگا، عیمرانـی کـوڕی حوصـەین (ڕەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی پـێم: فەرموودەیـەکت پـێ دەڵـێم، هیوایـە کـەخودا بیکا بەمایـەی بـەهرە بـۆت: پێغەمبـەر خـوای (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) و ئێمـەش لەخزمەتیـدا بـە تەمـەتتوع حـەجمان کـردووە، وە هـەتا خۆشـی کۆچـی دوایی کرد ئەمکارە لەسەر ئەم شێوەیە وەك خۆی مـابوو، نـە پێغەمبـەر

(١٦٤) قـال الـشيخ العَـيني: (والحـديث أخرجـه مـسلم في الحـج — ٢٠٤/٩ — العَـيني — المترجم)

لەپێش مەرگیدا یاساخی کردبوو، وە نە قورئان قەدەغەی کردبوو، لە گێڕانەوەی ئەم شوێنەدا: (عیمرانی کوڕی حوصەین (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئایەتی پشوودان و حەسانەوە، لەنێوانی عەمرەو حەجدا، کە ناوداره بە ئایەتی تەمەتتوعی حەج، لە نامەی پیرۆزی خودادا هاتووە، ئێمە خۆمان لەگەڵ حەزرەت خۆیدا، عەمرەو حەجمان لەسەر ئەو شێوەیە کەوا لە ئایەتەکەدا کردووە، وەهەتا حەزرەتیش (درودی خوای لەسەر بێ) کۆچی دوایی کرد، ئەم کارە لەسەر ئەم شێوەیە وەك خۆی مابوو، وە نە قورئان قەدەغەی کردبوو، وە نە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) یاساخی کردبوو ئیتر هەندێ کەس- وەك ئیمامی عومەر، یا ئیمامی عوسمان بێ - لەلای خۆیەوە بە ئارەزووی خۆی شتێ بڵێ، کە جیابێ لەم شێوەیەی کە من لەم فەرموودەیەدا ڕوونم کردەوە، ئەوە لەبەر ئەوەی بە ڕای خۆیەتی بایەخی نییە). (تاج/٢/١٧٦/ ١٧٨).

٧٥٨- عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دَخَلَ مَكَّةَ مِنْ كَداءٍ، مِنَ الثَّنِيَّةِ العُلْيَا التِي بِالبَطْحَاءِ، وَيَخْرُجُ مِنَ الثنيَّةِ السُّفْلى) (الحديث ١٥٧٥) طرفه في: ١٥٧١ [١٦٥]:

ئیبنوعومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر وابوو لە کەدائەوە (واتە: لەدانەی ژووروووەوە کە پێی دەگوترێ: ثەنییە تولعولیا، کەوا لەناو بەطحادا) دەڕۆیشتە ناو شاری مەککەوە، وە لەدانەی خوارووشەوە کە پێی دەگوترێ: ثەنییەتول سوفلا، لە مەککە دەردەچوو). (تاج/٢/١٨١ز-٩٣- ش/د/ت/ن).

٧٥٩- عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنها قالَتْ: سَأَلْتُ النَبِيّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ

(١٦٥) أخرجَهُ مسلم في الحجِ، باب: استحباب دخول مكة من الثنية العليا.. رقم: ١٢٥٧

وَسَلَّمَ عَنِ الجَدْرِ اَمِنَ البَيْتِ هُوَ؟ قَالَ: (نَعَمْ) قُلْتُ: فَمَالَهُمْ لَمْ يُدْخلوهُ في البَيْتِ؟ قَالَ: (إنَّ قَوْمَكِ قَصَّرَتْ بِهِمْ النَّفَقَةُ). قلتُ: فَما شَأنُ بابِهِ مُرْتَفِعاً؟ قَالَ: (فَعَلَ ذلَكَ قَوْمُكِ، لِيُدْخِلُوا مَنْ شَاؤُوا وَيَمْنَعُوا مَنْ شَاؤوا، ولَوْلاَ أَنَّ قَوْمَكِ حَديثٌ عَهْدَهُمْ بِالجاهِلِيَّةِ فَأَخَافُ أَنْ تُنكِرَ قُلُوبُهُمْ، أَنْ أُدخِلَ الجَدْرَ في البَيْتِ، وَأَنْ أُلْصِقَ بَابَهُ بالأَرْضِ) (الحديث: ١٥٨٤)[١٦٦].

عائیشه (رهزای خوای لیّ بیّ) فەرمووی: پرسیارم کرد لەحەزرەت -درودی خوای لەسەر بیّ- ئایا حیجری ئیسماعیل لەبنەڕەتدا بەشێکە لەماڵی بەیت یا نا ؟ فەرمووی: (بەڵێ بەشێکە لە ماڵی بەیت) عەرزیم کرد: ئەی بۆچی ئێستا نەخراوەتەوە سەر بەیت؟ فەرمووی: (چونکە گەلی تۆ کاتێ کەکابەیان دروست کردەوە دەستیان کورت بوو). گوتم: ئەی بۆچی دەرگای بەیت بەرزە؟ فەرمووی: (گەلی تۆ کە هۆزی قورەیشە، بۆیە وا لەبەرزی دەرگای بەیتیان دروست کردووە، هەتا بەئارەزوی خۆیان کێیان ویست کە بچێتە ناوی، ڕێگەی پێ بدەن‌و، کێیان نەویست نەهێڵن بچێتە ناوی، لەبەرئەوە نەبێ کە گەلی تۆ هێشتا نۆ مسوڵمانانن و، دەترسم لەدڵەوە پێیان ناخۆش بێ، دەنا حیجرم دەخستەوە سەر بەیت‌و دەرگاکەیشم لەسەر زەوییەکە دادەنا، نەوەك وەك ئێستای ئاوا بە بەرزەوە) (تاج/٢/٢٧٣ز– ١٣٥- ش/ت) بەیت واتە: کەعبە.

## ڕوونکردنەوە:

مەککەو مەدینەو مەسجیدولحەرام‌و کەعبەو بەیت‌و قیبلەو حەرەم‌و حەرەمی مەککی‌و حەرەمی مەدەنی‌و مەسجیدولئەقصاو خاکی پیرۆزو

---

(١٦٦) أخرجه مسلم في الحج، باب: جدر الكعبة وبابها، رقم: ١٣٣٣).

زۆر ناوی تری شوێنە پیرۆزەکانی دیاری موقەددەسە، وەك کێوی عەرەفەو جەبەلو رەحمەو میناو موزدەلیفەو مەشعەرولحەرام و تەنعیمو.. تاد، ئەم جۆرە شوێنانە هەر یەکێکیان بگریت، نەخشەو ڕێگەو سنوورو نەخشەی تایبەتی خۆی هەیە، لەکتێبە گەورەکاندا بەڕوونی ڕونکراونەتەوە، ئەوەیشی پەیوەندی بە مەساجیدو چۆنێتی و جوغرافیاوە هەبێ لەشوێنی خۆیان زۆر بەجوانی ڕوون کراونەتەوە.

ئەوەی کە زۆر مەبەستمە کە لەم شوێنەدا ئاماژەی بۆ بکەم ئەمەیە:

١- (خاڵێکی زۆر گرنگ لەم فەرموودەیە وەردەگیرێ، کە ئەویش ئەمەیە: دڵی کۆمەڵەی مسوڵمانان ڕابگیرێ، کەئێستا پێی دەگوترێ: ڕێز گرتنی هەستی جەماوەر، ئەوەی کە لەسەردەمی پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەر بێ) پێی دەگوترا: أسْتِصلاحی قُلُوبي مؤلَّفە، گەرچی عومەر لەکاتی خۆیدا فەرمووی: ئێستا ئیسلام عەزیزو بەهێزە، کارمان بەمانە نەماوە، بەڵام بەڕاستی ئێستا کاتی ئەوە هاتۆتەوە..).

٧٦٠- عَنْ عائِشَةَ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ أنَّ النَبِيَّ صَلّٰی اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لَهَا: (يَا عَائِشَةُ لَولاَ أنَّ قَوْمَكِ حَدِيثُ عَهْدٍ بِجَاهِلِيَةٍ، لأَمَرْتُ بِالبَيْتِ فَهُدِمَ، فَأَدْخَلْتُ فِيهِ مَا أُخْرِجَ مِنْهُ، وَأَلْزَقْتُهُ بالأَرْضِ، وَجَعَلْتُ لَهُ بَابَيْنِ بَاباً شَرْقِياً وَبَاباً غَرْبِياً، فَبَلَغْتَ بِهِ أَسَاسَ إبْراهِيمَ) (الحديث ١٥٨٦)[١٦٧]:

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) پێی فەرمووم: هۆزی تۆ نۆ مسوڵمانن لەبەرئەوە دەترسم کە لەدڵەوە پێیان ناخۆش بێ، ئەگینا کەعبە (بەیت) م دەڕوخانو لەئاستی زەوی مزگەوتەکە تەختی بنەکەیم دادەناو، دەرگەکەیشم لەسەر تەختی زەویەکە دادەنا، وە دوو

(١٦٧) اخرجه مسلم (صم/٩/٩١رقم ١٣٣٥ — المترجم).

دەرگایشم بۆ دروست دەکرد: دەرگایێ لە خۆرهەلاتیەوەو دەرگایێ لە خۆرنشێنیەوە، تا لە دەرگایەکیانەوە خەلك بچنە ژورەوەو، لەو دەرگاکەی تریانەوە برۆنە دەرەوە، وەشەش بالێشم لە حیجری ئیسماعیل دەخستە سەری، چونکە قورەیش کە کابەیان دروست کردووە - لەبەر دەست کورتی- کورتیان کردەوەو، لەسەر بناغەکانی ئیبراهیم دروستیان نەکردەوە. (تا/٢/٢٧٣- ش/ت).

٧٦١- عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ أَنَهُ قَالَ: يارَسُولُ اللهِ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أيْنَ تَنْزِلُ فِي دارِكَ بِمَكَّةَ ؟ فَقَالَ: (وَهَلْ تَرَكَ عَقِيلٌ مِنْ رِباعٍ أَوْ دُورٍ). وَكَانَ عَقِيلُ وَرِثَ أبا طَالِبٍ، هُوَ وَطَالِبٌ وَلَمْ يَرِثْهُ جَعْفَرٌ وَلاَعَلِيٌ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ شَيْئَاً، لأنهما كَانَا مُسْلِمَيْنِ، وَكَانَ عَقِيلٌ وَطَالِبٌ كَافِرَيْنِ. (الحديث ١٥٨٨- أطرافه في:٣٠٥٨،٤٢٨٢، ٦٧٦٤) [١٦٨]:

ئوسامەی کوڕی زەید (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەکاتی گرتنی مەککەدا گوتم: ئەی پێغەمبەری خوداسبەینێ لەکوێ دادەبەزی، ئایا بارگەکەت لە خانووەکەی مەککەت دەخەیتو ئەوێ دەکەی بەبارەگای خۆت؟ فەرمووی: (جا بۆچی عەقیل هیچ خانووبەری بۆ ئێمە هێشتۆتەوە، هەتا تیا دابەزین؟).

ئەوجا فەرمووی: (نە مسوڵمان کەلەپوور لە نامسوڵمانان وەردەگرێ، وە نە نامسوڵمان کەلەپوور لە مسوڵمان وەردەگرێ، هیچیان کەلەپور لە هیچ کامیان وەرناگرن). بە زوهرییان گوت: ئەی کێ کەلەپورو میراتەکەی ئەبوطالیبی برد بۆ خۆی؟! فەرمووی: عەقیل و طالیب بردیان و تەریکەی باوکیان بوو بە میراتی ئەوان، چونکە ئەبوطالیبی باوکیان

(١٦٨) اخرجه مسلم في الحج، باب: النزول بمكة للحاج وتوريث دورها رقم: ١٣٥١.

لەسەر دینی هۆزەکەی مرد، عەقیل و طالیبیش ئەو کاتە نامسوڵمان بوون‌و لەسەر دینی ئەو بوون، بەڵام جەعفەری کوڕی‌و ئیمامی عەلی کوڕی لەبەرئەوەی ئەوکاتە مسوڵمان بوون میراتیان لە ئەبوطالیبی باوکیان نەبرد). (تاج/٨/٢٣٢ ز/٩٥ ف/٣) + (تاج/٦/٢١٣ ز/١٠ ف/٢٢).

## ڕاڤەو ڕوونکردنەوە:

جەعفەرو عەلی‌و عەقیل‌و طالیب هەرچواریان برابوون، هەق ئامۆزای پێغەمبەر بوون، چونکە کوڕی ئەبوطالیبی مامەی پێغەمبەر بوون، جەعفەر دە ساڵ لەعەلی گەورەتربوو، عەقیلیش دە ساڵ لەجەعفەر گەورەترە، طالیبیش دە ساڵ لە عەقیل گەورەترە، طالیبیان لەغەزای بەدردا، بێ سەروشوێن بوو، مسوڵمان نەبوو، جەعفەریان لەکۆچکارە پێشینەکان بوو، کۆچی کرد بۆ وڵاتی حەبەشە، لەغەزای خەیبەردا گەڕایەوە، بۆ خزمەت پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێ لە مەدینە، فەرمووی: (نازانم بەکام لەم دوو مژدەیە شادمانترم بەهاتنی جەعفەر، یا بە ئازادکردنی خەیبەر). ناوداره بە جەعفەری طەییار، واتە: جەعفەری باڵدار، چونکە لە غەزای مۆتەدا لە وڵاتی شام، لە شەڕ لەگەڵ سوپای ڕووم دا، کە شەهیدکرا، هەردوو دەستی بڕا، وەتەرمەکەی بەشەهیدی کە دۆزرایەوە زیاتر لە نەوەت سەرەڕم‌و دەمەشیرو جێگە تیری پێوەبوو، لەوەدوا پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێ فەرمووی: جەعفەرم دی لە بەهەشتا لەگەڵ فریشتەکاندا بە دوو باڵ دەفڕی. ئیبنوعومەر (رەزای خوای لێ بێ) دەستووری وابوو، کاتێ سڵاوی لە عەبدوڵلای کوڕی جەعفەر دەکرد، دەیفەرموو: سڵاو لەتۆ، ئەی‌کوڕی خاوەنی دوو باڵ!

له فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئیمشەو جەعفەرم پێگەیشت، لەناو پۆلێ فریشتەدا بوو، هەردووباڵی خەڵتانی خوێن بوو. جەعفەر برای باوكو دایکی ئیمامی عەلی بوو، دەڵێن: بیستو شەشەم کەس بووە کە مسوڵمان بووە، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (هەم شێوەی شیرینتو هەم ڕەفتاری جوانت لەخۆم دەچێ !) جەعفەر هەژارانی زۆر خۆش دەویست، خزمەتی زۆری دەکردن، بەدەستی خۆی نانو ئاوی بۆ دادەنانو لەلایان دادەنیشتو قسەو گوفتوگۆی لەگەڵدا دەکردن، پێغەمبەریش ناوی نابوو: باوکی هەژاران ! لەکاتی موئاخاتدا (برایەتی بەستن دا) پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) کردی بە برای موعاذی کوڕی جەبەل، نەجاشی پاشای حەبەشەو تاقمەکەی لەسەر دەستی جەعفەردا مسوڵمان بوون، کاتێ جەعفەر هاتەوە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) ناوچەوانی ماچ کرد.

جەعفەر دەوری چل ساڵ ژیاوە، لە ساڵی هەشتی کۆچیدا لە غەزای مۆتەدا شەهید بوو، بڕوانە: (تاج/٥/١٠٥ ز/١٨ ف/١+٢+٣+ ٤+ ٥+ تاج/ ٢٤٤/٨ ز/١٠٠). عەقیل درەنگ مسوڵمان بوو، لەساڵی ئازاد کردنی مەککەدا ئیسلام بوو، چەند فەرموودەیەکی گێڕاوەتەوە، لە بوخاریدا فەرموودەی نییە، زانایەکی ڕەگەزناس بوو، لە مزگەوتەکەی مەدینەدا قاڵیچەیەکی دادەخستو لەپاش نوێژ لەسەری دادەنیشتو خەڵك لەدەوری کۆمەڵ دەبوون، فێری زانستی ڕەگەزناسیی دەکردن، وەڵام ئامادەبوو، وەڵامەکانی دەمکوتکەر بوو، لە عەلی برای جیاوەبوو، لەگەڵ موعاوییەی نەیاری عەلیدا بوو، دەڵێن: ڕۆژێ موعاوییە دەڵێ: (عەقیل دەزانێ من بۆی لە عەلی برای باشترم بۆی، بۆیە لەگەڵ ئێمەدایەو وازی لە عەلی هێناوە !). عەقیل (رەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: (قسەی ڕاستت دەوێ، براکەم بۆ ئایینم بۆ

من له تۆ باشتره، وه تۆ بۆ من بۆ جیهانم لەو باشتری بۆم، وەمن ئێستا دوای دنیا کەوتووم، وه له خوا داوادەکەم که ئاخرم بەخێر بگێڕێ).

له سەرەتای جێنشینی یەزیدی کوڕی موعاوییەوە مردووه.

ئیبنوعەبدولبەر لەئیستیعابا دەفەرموێ: خۆم فەرموودەیەکم گێڕاوەتەوە: پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- پێی دەفەرموێ: ئەبویەزیدمن لەبەر ئەم دوو هۆیە دووجار تۆم خۆش دەوێ – جارێ لەبەرئەوە کەخزممی، جارێکیش لەبەرئەوە کە دەزانم ئەبوطالیبی مامەم تۆی زۆر خۆش دەویست، ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێ بێ.

٧٦٢– عَنْ أبي هُرَيْرَةَ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ قالَ: قَالَ رسُولُ الله صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حِينَ أَرادَ قُدُومَ مَكَّةَ: (مَنْزِلُنَا غَداً إنْ شَاءَ اللهُ بِخَيْفِ بَنِى كِنَانَـهِ، حَيْثُ تَقَاسَمُوا عَلَى الكُفْرِ) يَعْنِي ذلِكَ المحَصّبَ، وَذلِكَ أَنَّ قَرَيْشاً وَكِنانَةَ تَحالَفَتْ عَلى بَنِي هَاشِمِ وَبَني عَبْدِ الْمطلِبِ، أَوْ بَنى المطَّلِبِ: أَنْ لايُنَاكِحُوهُمْ، وَلا يُبايِعُوهُم، حَتَّى يُسْلِمُوا إلَيْهِمَ النَبِيّ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). (الحديث ١٥٩٠) أطرافه في:١٥٨٩،٣٨٨٢،٤٢٨٤، ٤٢٨٥،٧٤٧٩) [١٦٩]:

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: هێشتا له مینا بووین که حەزرەت -درودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی پێمان کاتی ویستی بگەڕێتەوە بۆ مەککە: (خوا حەزکا سبەینێ له خەیف، له قوقزایییەکەی بەنی کینانه قۆناخ دەگرین – واته: له موحەصەب – واته: لەو شوێنەدا کەکاتی خۆی دوشمنەکانی ئیسلام پەیمانیان بەست لەسەر کوفر).

ئەم ڕووداوەیش ئاوا بووه: کاتی خۆی کافرەکانی قوڕەیش‌و بەنی

(١٦٩) أخرجه مسلم في الحج، باب: استحباب النزول بالمحصّب يوم النفر والصلاة به، رقم: ١٣١٤.

كینانـه، لـەو جێگایـەدا لـەدژی بـەنی هاشـم‌و بـەنی مـوطـطـەلیب -كـە پارێزگاری پێغەمبەریان دەكرد- بووبـوون بەیـەك‌و سوێندیان بۆ یـەكتری خواردبوو لەسەر ئەمە: (هەتا بەنی هاشم‌و بەنی موططەلیب، پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- نەدەن بەدەستیانەوە، بۆ ئەوەی بیكوژن، نە ژن‌و ژنخوازییـان لەگەڵ بكەن‌و نە سەوداو مامەڵە !). (تاج/٢/٢٢٧ز - ١١٥- ش)

## ڕاڤەو ڕوونكردنەوە:

لە ژیاننامەی پێغەمبەردا هاتووە: (كاتێ قورەیش بێ باوەڕانی مەككە بیـستیانەوە كـە پادشـای حەبەشـە نەجاشـی، ڕێزێكـی زۆری جەعفـەرو هاوڕێكانی پێغەمبـەری گرتـووە، ئـەوەیان زۆر پـێ نـاخۆش بـوو، ئاگریـان تێبـەربوو، لـەدڵی خۆیانـا گوتیـان: وابـڕوا كـاری موحەممـەد سـەردەگرێ، ئێمـەی تیادەچـین، ئـیتر بـە كـۆی ڕا بڕیاریانـدا كـە پێغەمبـەر بكـوژن، پەیماننامەیـەكیان لـەناو خۆیانـا نووسـی، هـەموو كۆمـەكی‌و سـەوداو مامەڵەیی لەگەڵ خزمان‌و كەسوكاری پێغەمبەردا ڕابـرگن، هـەتا ناچاریان بكەن كە پێغەمبەریان تەسلیم بكەن، ئەو تۆمارنامەیان بۆ گرنگی پێدان لەناو ماڵی كابـەدا هەڵواسی، وە بۆمـاوەی سێ ساڵ ئابلۆقەیـەكی ئـابووری سەختیان سەپان بەسەر بەنی هاشم‌و بەنی عەبدول موططەلیبدا، لەگـەڵ گەمارۆیـەكی كۆمـەڵایتی، وە لـە (شـعبی ئـەبوطـالـب)دا عـەزڵیان كـردن‌و هـەموو پەیوەندیـیـەكیان لەگەڵـدا بـڕین، گەلـێ گەلـێ لـەم ئابلۆقـە ئابووریـیـە سـەختتر، كـە ئێـستا ئەمـەریكا خـستوویەتیە سـەر عێـراق! یا عێـراق داینـاوە لەسـەر كوردسـتان ! خـوا تۆڵـەی سـەخت لـە هـەموو ناهەقیكارێ بسەنێ.

پاشان پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- بەفەرمانی خودا، هەواڵی پێیاندا، کە بە فەرمانی خودا مۆریانە ئەو شوێنانەی لە تۆمارنامەکە خواردووە، کە زۆرو ناحەقی‌و ستەمی تیادا نووسراوە، بەڵام ئەو شوێنانەی هێشتۆتەوە کە ناوی خوای واتیادا. هەتا لەپاش گوفتوگۆیەکی دوورودرێژ لەساڵی دەی پێغەمبەرایەتیدا ئابڵۆقەکە هەلگیرا. دەڵێن: ئەو کابرایەی کە پەیماننامەکەی نووسی، دەستی تووشی گۆدی بوو، خودا پێی نواند.

٧٦٣- عَنْ أبي هُرَيْرَةَ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ عَنِ النَبِيّ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ قالَ: (يُخَرِبُ الكَعْبَةَ ذو السُوَيْقَتَيْنِ مِنَ الحَبَشَةِ). (الحديث ١٥٩١ – طرفه في: ١٥٩٦)[١٧٠].

ئەبو هورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (پیاوێکی دوو لاق باریکی حەبەشەیی کەعبە دەڕووخێنێ!). لەگێڕانەوەیەکی تاج دا: دەفەرموێ: دەڵێی وا لەبەرچاوم، ئەو کابرا قولەڕەشە پەیزەنە گەلاوگەلەی کە کابەی پیرۆز، بەرد بەبەرد هەڵدەتەکێنێ !).تاج/٢/٢٧٦ ز/١٣٧- ش)

٧٦٤- عَنْ عِائِشَةَ رَضِي اللّٰهُ عَنها قالَتْ: كانُوا يَصُومُونَ عَاشُوراءَ قَبْلَ أنْ يُفْرَضَ رَمضانُ، وَكانَ يَوْماً تُسْتَرُ فِيهِ الكَعْبَة، فَلَمَّا فَرَضَ اللّٰهُ رَمَضَانَ قَالَ رسولُ اللهِ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ: (مَنْ شَاءَ أنْ يَصُومَهُ فَلْيَصُمْهُ، وَمَنْ شَاءَ أنْ يَتْرُكَهُ فَلْيَتْرُكْهُ) (الحديث ١٥٩٢– أطرافه في: ١٨٩٣، ٢٠٠١، ٢٠٠٢، ٣٨٣١، ٤٥٠٢، ٤٥٠٤)[١٧١]:

---

(١٧٠) أخرجه مسلم في الفتن وأشراط السّاعة، باب: لاتقوم السّاعة رقم: ٢٩٠٩.

(١٧١) أخرجه مسلم في كتاب الصوم، باب صوم عاشوراء (صم ٨ ص ٤ وما بعدها الي ص ٧ – المترجم).

عائیـشه (رەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی: جـاران هـۆزی قـورەیش لەسـەردەمی نەزانیـدا ڕۆژووی ڕۆژی عاشورایان دەگـرت، کـەدەی مـانگی موحەڕڕەمـە، قورەیش له سەردەمی نەزانیدا، هەموو سالێ لـه دەی موحـەررەما بـەرگی نوێیان بۆ کعبه دەکردو بەرگه کۆنەکەیان دەگۆڕێ، پێغەمبـەریش -دروودی خوای لەسەر بێ- چـاوی لـەوان دەکـردو دەیگـرتو کاتـێ هـاتیش بـۆ مەدینـه هـەر دەیگـرتو، فەرمانیـشی بەمـسولمانان دەکـرد بـەگرتنی. جاکاتـێ خـودای گەوره ڕۆژوی مانگی ڕەمەزانی دانا لەسەر مسولمانان، ئیتر پێغەمبەر -دروودی خـوای لەسـەر بـێ- خـۆی وازی لـــەگرتنی ڕۆژووی ڕۆژی عاشـــورا هێنـــا، وه بەخەلکەکـەی فـەرموو: (هەرکەسـێ دەیـەوێ بـابیگرێ، وه هەرکەسـێ حەزدەکا باوازی لێبهێنێو ئیتر نەیگرێ).(تاج/٢/١٢٤ز-٥٩- ش/د/ت).

٧٦٥- عَنْ أبي سَعِيدٍ الخُدريّ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ عَنْ النَبِـيّ صَـلّى اللّٰـهُ عَلَيْـهِ وَسَلّمَ قَالَ: (لَيُحَجَّنَّ البَيْتُ وَلَيُعْتَمَرَنَّ بَعْدَ خُرُوجِ يَـأْجُوجَ وَمَـأْجُوجَ) (الحـديث ١٥٩٣)[١٧٢]:

ئەبوسەعیدی خودری (رەزای خوای لێ بێ) له پێغەمبەرەوه دەفـەرموێ -دروودی خوای لەسەر بێ-: (لـەپاش پەیـدابوونی یـەئجووجو مـەئجووجیش خـەلك هەردەچـن بۆخانەی خودا، بۆ کردنی حەج و عەمرە!).

## ڕووخانی کەعبه

٧٦٦- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ عَنِ الـنبيّ صَـلّى اللّٰـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلّمَ: (كَأَني بِهِ أَسْوَدُ أَفحَجُ، يَقلَعُها حَجَراً حَجَراً). (الحديث ١٥٩٥)[١٧٣].

وەرگەڕاوەکەی بەدەق لەکۆتایی ژماره (٧٦٣)دا ڕابورد.

(١٧٢) لم يُوافقه مسلم علي تخريجه (فتح/٣ خاتمة - ٥٩٦ - المترجم).

(١٧٣) لم يوافقه مسلم علي تخريجه (فتح/٣- خاتمة ٥٩٦ - المترجم).

## ماچ کردنی بەردە ڕەشەکە = حەجەرول ئەسوەد

٧٦٧- عَنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أنه جَاءَ إلَى الحَجَرِ الاسْوَدِ فَقَبَّلَهُ، فَقَالَ: إني أَعْلَمُ أَنَّكَ حَجَرٌ، لا تَضُرُّ وَلا تَنْفَعُ، وَلَولا أني رَأَيْتُ النَبي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُقَبِّلُكَ مَا قَبَّلْتُكَ. (الحديث ١٥٩٧- طَرَفاهُ في: ١٦٠٥، ١٦١٠)[١٧٤]:

پێشەوا عومەر (رەزای خوای لێ بێ) چوو بۆلای حەجەرولئەسوەدو ماچی کردو، فەرمووی: (ئەی حەجەرولئەسوەد من دەزانم کە تۆ بەردێکیت، نە زیان دەبەخشیتو، نە بەهرەو سوود، بەڵام ئەوەندە هەیە من خۆم بەچاوی خۆم پێغەمبەرم دیوە کە تۆی ماچ کردووە، بۆیە منیش ماچت دەکەم، ئەگینا ماچم نەدەکردیت) (تاج/٢/١٨٥ ز/٩٥- ١/ د/ت/ن) + (تاج/٢/١٨٥/ ز/٩٥ هەتا کۆتایی) + (ژ/٧٧٥).

### ڕاڤەو ڕوونکردنەوە:

چەند زانیارییەکی بەسوود لەم بارەیەوە، کە لەم فەرموودەیەوە وەردەگیرێن، ڕاگوێزیان دەکەم لە شەرحی عەینی و لەشەرحی فەتحول بارییەوە، لەگەڵ ڕەچاوکردنی ژمارە: ١٦٠٥و ١٦١٠ و١٦٠٩.

١. ئیبنوعەبباس (رەزای خوای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە -درودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: (بەردە ڕەشەکە کە کاتێ لە بەهەشتەوە هاتە خوارەوە، لەچڕی شیر سپیتر بوو، بەرەبەرە گوناهی ئادەمیزادەکان لەکاتی ماچکردنیدا ڕەشی کرد). تەرمزی دەفەرموێ: فەرموو دەیەکی دروستە (حەدیسێکی صەحیحە).

٢. بەردەڕەش زمانو دوو لێوی هەیە، هەروا دوو چاوی هەیە، قسە دەکا، لەڕۆژی قیامەتدا شایەتی بۆ ئەوانە دەدا کە بەهەق زیارەتیان کردووە.

---

(١٧٤) أخرجه مسلم في الحج، باب: استحباب تقبيل الحجر الاسود رقم: ١٢٧٠.

٣. بەردە ڕەشەکە لەخۆیەوە زیان یا سوود نابەخشێ، بەڵام بەفەرمانی خوا هەم سوود، هەم زیان دەبەخشێ.
٤. حەزرەتی عومەر هەمووجارێ سێ ماچی دەکرد.
٥. فەزڵ و گەورەیی بەردە ڕەش لەخواوەیە نەوەك لەخۆیەوە.
٦. کارێ پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- کردبێتی، بەبیانووی ئەوەی کەباوی بەسەرچووە، یا هۆکەی کاتی بووە، ئێستا ئەو هۆیە ڕۆڵی نەماوە، نابێ کارێ پێغەمبەر کردبێتی بەم جۆرە مەهانانە تەرك بکرێ. لەکاتی وادا، ڕاو قیاس کاریان پێ ناکرێ، بەڵکو اتباع پەسەندە.
٧. لەکاتی زیارەتکردنی بەردە ڕەشەکەدا ماچکردنی سێجار سوننەتە، وا باشە ماچەکە دەنگی نەیێ، هەردوولێوی لەسەر بەرەدەکە دانێ، ئەگەر مەودای ماچکردنی نەبوو دەستی پیابهێنێو دوایی دەستی خۆی ماچ بکات، لەحەدیسێکی موسلیما دەفەرموێ: (پێغەمبەر لەتەوافی بەیتدا بەگۆچانێ ئیستیلامی بەردەڕەشی کردو دوایی گۆچانەکەی ماچکرد).
٨. موتابەعەی پێغەمبەر دەبێ بکرێ، باهۆو بایستی پەیڕەوی - واتە: اتباعەکەیش - نەزانرێ، هەتا پەیڕەویی پێغەمبەر هەبێ کار بە ڕای ئەم و ئەو ناکرێ.
٩. خوا باوو فەزڵی هەندێ بەردو دارو ئاژەڵی داوە بەسەر هەندێ بەردو دارو ئاژەڵیتردا، وەك چۆن باوی هەندێ شوێنو کاتو ڕۆژی داوە بەسەر هەندێ شوێنو کاتو ڕۆژی تردا.
١٠. جابیر (رەزای خوای لێ بێ) دەستی بەبەردە رەشەکەدا هێناو چاوەکانی پڕبوون لە فرمێسك و ماچی کردو دەستەکانی دانا لەسەری و هێنانی بەڕووی خۆیدا بۆ موفەڕکی.
١١. ماچ کردنی شوێنە پیرۆزەکان بەمەبەستی موفەڕکی، وە هەروا ماچ کردنی گۆڕی پیاوچاکان و هەڵسان لەبەر چاکانو گەورە پیاوانو

هەروەها ماچکردنی دەستو پێو ڕیشو جەستەی پیاوچاکان کارێکی جوانی پەسەندە، بەپێی مەبەستو نیازەکەی (تاج/١٠/١٢٩-ز/٤٢).
بڕوانە: فتح الباري ج/٣ ص/٦٥، حيث قال الشيخ العَسْقَلانِي بِالنَصِّ: (.. واخْتَلُفَ فِي شَدِّ الرِّحَالِ إِلى غَيْرِها، كالذَّهَابِ إِلَى زِيَارَةِ الصَّالِحِينَ أَحيَاءً وَأَمْواتاً وَإِلَىَ المَواضِعِ الفاضِلَةِ، لِقَصد التَبَرُّك بِها وَالصَّلاةِ فِيها، فَقَالَ الشَيخ أَبُو مُحَمَد الجُوَيْنِي: يَحْرُمُ شَدُّ الرِّحَالِ إِلى غَيرِها.. إلخ.. إلى أن قَالَ العَسْقَلاني: (.. والصَّحِيحُ عِنْدَ إِمَامِ الحَرَمَين وَغَيرِهِ مِنَ الشَّافِعِيَّةِ أَنَّهُ لاَ يَحْرُمُ..)

١٢. ئەبو هورەیرە ناوکی ئیمامی حەسەنی ماچ کرد، گوتی: چونکە دیومە کە پێغەمبەری باپیرەت ئەو شوێنەی ماچ کردووە.

١٣. ثابیتی بەنانی هەمووجارێ دەستی ئیمامی ئەنەسی ماچ دەکردو دەیفەرموو: (ئەمە دەستێکە کە لەدەستی پێغەمبەر کەوتووە !).

١٤. ئیمامی ئەحمەد فەتوای داوە کە ماچکردنی قەبری پێغەمبەرو ماچ کردنی مینبەرەکەی قەیدی نییە.

١٥. ئیمامی ئەحمەد کراسێکی شافیعی شۆردو ئاوەکەی بۆ موبارەکیو موفەڕك خواردەوە! شێخی ئیبنوتیمیە لەم دووکارەی ئیمام ئەحمەد متعجب بوو!

١٦. ماچ کردنی بەرگو پەڕەی قورئانو پەڕاوی حەدیث وکتێبی شەریعەتو ماچ کردنی گۆڕی پیاوچاکان دروستە، بگرە موحیببی طەبەری دەفەرمویَ: (يُسْتَنْبَطُ مِنْ تَقْبِيلِ الحَجَرِ وأَسْتِلامِ الارْكَانِ جَوازُ تقبيل مَا فِي تقبيلِهِ تعظيمُ اللهِ تَعالى فانَ لَمْ يَرِدْ فيه خبرٌ بالندْب لَمْ يَرِدْ بالكَراهة). بڕوانە کۆتایی بەرگی یەکەمی تەرجەمەی فیقهی ئاسان بە کوردی (ل/٤٢١).

١٧. جێ بەجێکردنی سوننەت فەرقی قەولی و عەمەلی نییە.

١٨. دروستە کە دارو بەردو بێگیان قسە بکات، شت ببینێ، یا بگری، یاکەسێکی خۆش بوێ، یا ڕقی لێی بێ، وەك تەسبیحاتی زیخ و بەردە وردەو نان و چێشت و کۆڵەکەو گورگ و حووبی کێوی ئوحود.

٧٦٨- عَنْ عَبْدِاللهِ بْنِ أبي أَوْفى رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ قالَ: أعْتَمَرَ رَسُولُ اللهِ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَطافَ بالبَيْتِ، وَصَلَّ خَلْفَ المَقَامِ رَكْعَتَيْنِ، وَمَعَهُ مَنْ يَسْتُرُهُ مِنَ النّاسِ، فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: أَدخَلَ رَسُلُ اللهِ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الكعبةَ؟ قَالَ: لاَ. الحديث ١٦٠٠- أطرافه في: ١٧٩١، ٤١٨٨، ٤٢٥٥)[١٧٥]:

عەبدوڵلای کوڕی ئەبوئەوفا (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەساڵی حەوتی کۆچیدا، لە پێش ئازادکردنی مەککەدا، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) لە عەمرەتول قەچادا، کە عەمرەی کرد، تەوافی بەیتی کرد، دوو رکات نوێژی سوننەتی لە پشت مەقامی ئیبراهیمەوە کرد، کەسانێ لە خزمەتیدا بوون، بەریان لە خەڵك دەگرت، نەبادا نوێژەکەی پێ ببڕن، یا ئازارێکی بۆ دروست بکەن. پیاوێ پێی گوت: ئایا لەم عەمرەیەدا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) چووە ناو ژوری کەعبەوە؟ فەرمووی: نەء).

## هەندێ دەستووروو ئادابی دێنی کابەی پیرۆز

٧٦٩- عَنِ ابْنِ عباس رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ قَالَ: إنَّ رَسُولَ اللهِ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمَّا قَدِمَ، أَبى أَنْ يَدْخُلَ البَيْتَ وَفيهِ الآلِهَةُ، فَأمَرَ بِهَا فَأُخرِجَتْ، فَأخْرَجُوا صُورَةَ إبْراهِيمَ وَ إسْمَاعيلَ في أيْديِهما الازْلامُ، فَقَال رَسُولُ اللهِ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (قَاتَلَهُمُ اللّٰهُ أمَا وَاللهِ قَدْ عُلِمُوا أنَّهُما لَمْ يَسْتَقسِما بَها قَطٌّ). فَدَخَلَ البَيْتَ

---

(١٧٥) لم يُوَافِقْهُ مُسْلِمٌ علي تخريجهِ (فتح/٣/٥٩٦-خاتمة) – المترجم).

فَكَبَّرَ فِي نَوَاحِيهِ وَلَمْ يُصَلِّ فِيهِ). (الحديث ١٦٠١):

ئیبنوعەباس (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- کە تەشریفی هات بۆ مەککە، لەساڵی ئازادکردنی مەککەدا، هەتا بتەکان لەناو ژووری کابەدا بوون، قاییل نەبووکەبچێتە ناوی، جا پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمانی کرد بتەکانیان لێهێنایە دەرەوە، کە پەیکەری ئیبراهیمو ئیسماعیلیان لەبەیت هێنایە دەرەوە ئەزلامیان لە دەستا بوو، پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (دەك خودا بچێت بەگژیانا! ئەمە چۆن بوختانێکە کەئەم خودانەناسانە بۆ ئەم دووزاتەیان کردووە، دەسا بەزاتی خودا خۆیان زۆر باش دەزانن کە ئەو دوو پێغەمبەرە بەڕێزانە، هەرگیزاو هەرگیز بەم ئەزلامانە بەختو فاڵیان نەگرتۆتەوە).

جا کەخودا درۆینەکانیان لەبەیت دەرهێنا، ئەوجا حەزرەت -دروودی خوای لەسەر بێ- تەشریفی چووە ناو ژووری کابەو، لەناویدا دەستی کرد بە ئەڵلاهوئەکبەر کردن، بەتایبەتی لەلا تەنیشتەکانیدا، بەڵام نوێژی لەناویدا نەکرد). (تاج/٢/ ٢٧١ز-١٣٥٠- ب/د).

## ڕەمەل = لۆقەکردن لەکاتی تەوافی بەیت دا

٧٧٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاس رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَدِمَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَصْحَابُهُ، فَقَالَ الْمُشْرِكُونَ: إِنَّهُ يَقْدمُ عَلَيْكُمْ وَقَدْ وَهَنَتْهُمْ حُمَّى يَثْرِبَ فَأَمَرَهُمُ النبيّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يَرْمُلُوا الأَشْوَاطَ الثَلاثَةَ، وَأَنْ يَمْشُوا مَابَيْنَ الركنَيْنِ، ولَمْ يَمْنَعْهُ أَنْ يَأمُرَهُمْ أَنْ يَرْمُلُوا الأَشْوَاطَ كُلَهَا إلاَّ الإِبْقَاءُ عليهِمْ). (الحديث ١٦٠٢- طرفه فى ٤٢٥٦) [١٧٦]:

(١٧٦) أخرجَهُ مُسلِمُ في الحجِ، باب: استحباب الرمل في الطواف.. رقم: ١٢٦٤.

ئیبنوعەبباس (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەساڵی حەوتەمی کۆچیدا، کە پێغەمبەرو یارانی هاتن بۆ مەککە بۆ کردنی عەمرە، لەپاش ڕێکەوتنی حودەیبییە، هاوبەش پەیداکەرەکان گوتیان: وا محمد خۆی و تاقمەکەی دێن بۆ ناوتان لەرزو تای مەدینە کزو بێ هێزی کردوون!

پێغەمبەریش -درودی خوای لەسەر بێ- فەرمانی بەیارانی کرد: کە لەسێ سەری پێشەوەی تەوافدا بە لۆقە بڕۆن و چالاکی و هێزی خۆیان نیشانی دوشمن بدەن، تاچاو ترسێنیان بکەن، بەڵام لەنێوانی دوو ڕوکنە یەمانییەکانا بەڕۆیشتنی ئاسایی بڕۆن، هەتا لەو ماوەیەدا کەمێ بحەسێنەوە، چونکە لەوێدا لە بتپەرستەکانەوە دیار نەبوون! بۆیەیش فەرمانی پێنەدان کەهەر حەوت جارەکەی تەواف بەلۆقە بڕۆن، نەبادا بەهۆی ئەوەوە تەواو شپرزەیان بکا).

لەگێڕانەوەیەکی تاجا: جا هاوەڵ پەیداکەرەکان گوتیان: بەمانەتان دەگوت: گوایە لەرزوتای مەدینە کەنەفتی کردوون، چاکی کەنەفت نەکردوون، خۆئەوەتانێ لە هەمووکەس ئازاو نەبەردترن ! تاج/٢/١٨٤ ز/٩٤- ش/د/ت/ن).

٧٧١- عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حِينَ يَقْدَمُ مَكَّةَ، إِذَا اسْتَلَمَ الرُّكْنَ الْأَسْوَدَ، أَوَّلَ مَايَطُوفُ: يَخُبُّ ثَلاثَةَ أَطْوافٍ مِنَ السَّبْعِ. (الحديث ١٦٠٣ – أطرافه في: ١٦٠٤، ١٦١٦، ١٦١٧، ١٦٤٤)[177]:

ئیبنوعومەر -رەزای خوایان لێ بێ- فەرمووی: بەچاوی خۆم پێغەمبەرم دیوە، دەستووری وابوو، کە دەچوو بۆ حەج و عەمرە، یا کە دەچووە ناو

(١٧٧) أخرجه مسلم في الحج، باب: استحباب الرمل في الطواف: رقم: ١٢٦١.

مەككـەوە، كـە دەگەيـشتە مەككـە، لەپێـشا تـەوافی بـەيتی دەكـرد، بـەم شێوەيە: ڕۆيـشتە نـاو مزگـەوت و دەسـتی هێنـا بـە حەجەرولئەسوەدا، لـە سەرەتای تەوافەكەيەوە، لە پاش ماچكردنی بەردە ڕەشەكە: بەنەرمە غـار، سـێ تـەوافی لەحـەوت تەوافـەكان ئـەنجام دا). (تـاج/٢/١٨٢ز — ٩٤-ش/د/ت/ن).

٧٧٢- عَنْ عُمَرَ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ أَنهُ قَالَ: فَمَا لَنَا وَلِلرَّمَلِ، إِنَّمَا كُنَّا رَأَيْنَا بِـهِ الْمُشْرِكِينَ، وقَدْ أهَلَكَهُمُ اللهُ، ثُمَّ قَالَ: شَيْءٌ صَنَعَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلا نُحِبُّ أَنْ نَتْرُكَهُ (الحديث ١٦٠٥)[١٧٨]:

پێشەوا عومەر (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: هـەقمان چـیيە بەسـەر رەملـەوە لەكاتی تەوافا، كە ئەوەيە لە سێ سەری يەكەمی حەوت سەرەكانی تەوافـدا بە نەرمە لۆقە بـڕوا، ئـەوەی كاتی خـۆی كـە لەخزمـەتی پێغەمبـەردا، لـە تـەوافا ردەملمـان ئـەنجام دەدا، لەبـەر ئـەوەبوو: هێـزو بـاهووی خۆمـان پێشانی هاوبەش پەيداكەرەكان دەدا، تاوا نەزانن كە ئێمـە مانـدووو بێهێـز بووين و ئەگەر بچن بەگژماندا دەرەقەتمان دێـن، بـەڵام خـۆ ئـەوە تـاخودا ئەوانی لەناوداوەو ترسی ئەوانمان نەماوە، كەواتە: ئێستا كارمان بـە ڕەمڵ نـەماوە لـەكاتی تـەوافا، لـە پاشا عومـەر لـەم بۆچوونەی پەشيمان بـۆوەو فـەرمووی: (ئەمـە شتێكە سوننەتی پێغەمبـەرە، چونكە كارێكـە كـە ئـەو زاتە ئەنجامی داوە، لەبەرئەوە حەزناكەين كە وازی لـێ بهێنين).

## ڕاڤەو ڕوونكردنەوە:

ئيمامی عومەر (رەزای خوای لێ بێ) كەسايەتييەكی زۆر هۆشيارو بليمـەت بـوە،

(١٧٨) لاحظ ماجاءَ في خاتمة كتاب الحج في الفتح (٣/٥٩٦) — المترجم).

خاوەنی عەقڵێکی داهێنەری اجتهادیی بووە، لەساڵی ریمادەدا کە وشکە ساڵێکی ئێجگار سەخت بوو، دەستی دزی هەژاری نەدەبڕی، ماوەیێ پشکی (مؤلفة القلوب) لە پشکەکانی زەکات بڕی، بە مەهانەی ئەوەی کە ئیسلام بەهێز بووە، پێویستیی بەپشتگیریی ئەوان نەماوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەیشا لەئاستی سوننەتی پێغەمبەرو فەرمانی شەرع دا ملکەچ بوو، بە موو لە سوننەتی پێغەمبەر لای نەدەدا. وەمەبەستی سەرەکیی ئیمامی عومەر لەم جۆرە فەرمایشتانە لەپلەی یەکەمدا ئەوەیە: کە سەرنجی مسوڵمانان ڕابکێشێ بۆلای سوننەتی پێغەمبەرو اتباعیو دوورکەوتنەوە لە خۆدزینەوە لەجێبەجێ کردنی شەریعەتی خوا، بەهۆی بیانووی لاوازەوە!

٧٧٣- عن ابن عمر رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ قال: مَاتَرَكْتُ اسْتِلاَمَ هذَينِ الرُّكْنَينِ، في شِدةٍ وَلا رَخاءٍ مُنذُ رأيتُ النبي صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَسْتَلِمُهُما (الحديث ١٦٠٦- طرف فى ٦١١١) [١٧٩]:

ئیبنوعومەر (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەوکاتەوە کە بەچاوی خۆم پێغەمبەرم دیوە، لەکاتی تەوافی بەیتا، دەستی هێناوە بەم دووگۆشە یەمانیەی بەیتاو ماچی کردوون، لەوکاتەوە منیش لەکاتی تەوافی بەیتا، وازم لە دەست پێداهێنان و ماچ کردنی ئەم دوو گۆشە یەمانیانە نەهێناوە.).

٧٧٤- عَنِ ابنِ عباسٍ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ قَالَ طافَ النبيُّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ في حَجَّةِ الوَداعِ عَلى بَصيرٍ يَسْتَلِمُ الرُّكْنَ بِمِحْجَنٍ. (الحديث ١٦٠٧- أطرافه فى: ١٦١٢، ١٦١٣، ١٦٣٢، ٥٢٩٣) [١٨٠]:

---

(١٧٩) اخرجه مسلم في الحج، باب: استحباب استلام الركنين اليمانيين رقم: ١٢٦٨.

(١٨٠) اخرجه مسلم في الحج باب: جواز الطواف علي بعير.. رقم: ١٢٧٢.

ئیبنو عەباس (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەحەجی مالآوەییدا پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێ. بە سواری و وشترێ تەوافی بەیتی دەکرد، هەمووجارێ کە دەگەیشتە ئاستی گۆشەی بەردە ڕەشەکە، گۆچانێکی بەدەستەوە بوو، گۆچانەکەی دەهێنا بە بەردە ڕەشەکەدا). لەگێڕانەوەیەکی پێشەوا موسلیم دا دەفەرموێ: (بە گۆچانێ ئیستیلامی حەجەرولئەسوەدی دەکردو پاشان گۆچانەکەی ماچ دەکرد).

٧٧٥- عَنِ الزبير بن عَرَبِي رَحمه الله تعالى قَالَ: سَأَلَ رَجُلٌ ابنَ عُمَرَ رَضِي اللَّهُ عَنْهُما عَنِ استِلامِ الحَجَرِ، فَقَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَسْتَلِمُهُ وَ يُقَبِّلُهُ. قَالَ: قُلْتُ: ارأيتَ إنْ زُحِمْتُ، أَرَأيتَ إِنْ غُلِبْتُ؟ قَالَ: أجْعَل أَرَأَيْتَ بِاليَمَنِ، رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَسْتَلِمُهُ وَيُقَبِلُهُ) (الحديث ١٦١١)[١٨١]:

زوبەیری کوڕی عەرەبی ڕەحمەتی خوای گەورەیان لێبێ. فەرمووی خۆم لە ئیبنوعومەرم پرسی: لەبابەت دەستهێنانو ماچ کردنی بەردە ڕەشەوە فەرمووی: (کارێکی ڕەوایە، چونکە بۆ خۆم پێغەمبەرم بینیوە دەستی هێناوە بەبەردە ڕەشەکەداو ماچی کردووە). عەرزیم کرد: ئەری پێم بڵێ: ئەگەر لەبەر جەنجاڵیو قەرەباڵغی دەستم نەپەرژا بەم کارە هەستم؟ یا ئەگەر کەسانی تر زۆریان بۆم هێناو بەزاندمیان بۆم نەکرا چۆن؟ ئیبنوعومەر فەرمووی: (ئەوە چۆن قسەیەکە، من پێت دەڵێم پێغەمبەر وادەفەرموێ، کەچی تۆ بڕو بیانوو دەهێنیتەوە، لەکاتی وادا پەیڕەوی ڕێبازی پێغەمبەر بکە، ڕای جیاوازی خۆت تووڕدە بۆ وولاتی خۆت کە یەمەنە !).

(١٨١) لاحظ خاتمة كتاب الحج (فتح / ٣ / ٥٩٦ - المترجم)

٧٧٦- عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللّٰهُ عَنْها أَنَّ أَوَّلَ شَيءٍ بَدَأَ بِهِ حِينَ قَدِمَ النبيُّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ تَوَضَّأَ ثم طَافَ، ثُمَّ لَمْ تكُنْ عُمْرَةٌ. ثمَّ حَجَّ أبوبكر وَعُمَرُ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُما مِثْلَهُ (الحديث ١٦١٤ - طرفه في: ١٦٤١)[١٨٢]:

عائیشه (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەحەجەکەیدا، کاتێ هاتەناو مەککەوە، یەکەم شت کەکردی، طەوافی قودوم بوو لەپێشدا بۆ تەوافەکەی دەستنوێژێکی گرت، ئەوجا تەوافی قودومی ئەنجامدا، وەئەمەیش بە عەمرە دانەنرا. لەپاش پێغەمبەریش ئەبوبەکر لەسەردەمی جێنشینیی خۆیدا عومەر لە سەردەمی جێنشینی خۆیدا (رەزای خوای لێ بێ) لەسەر ئەم شێوەیەی پێغەمبەر حەجیان کرد). (تاج/١٨٢/٢ -ب).

٧٧٧- عَنْ عَبْدِاللهِ بْنِ عُمَرَ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُمَا: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إذَا طَافَ فِي الحجِ أَوِ العَمْرِةِ، أَوَّلَ مَايَقْدَمُ سَفى ثلاثَة أطْوَافٍ، وَمَشى أَرْبَعَةً، ثمَّ سَجَدَ سَجْدَتَيْنِ ثُمَّ يَطُوفُ بَيْنَ الصَّفَا والمرْوَةِ (الحديث ١٦١٦ - طرفه: ١٦٠٣ وأطرافه)[١٨٣]:

عەبدوڵلای کوڕی عومەر (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەچاوی خۆم پێغەمبەرم دیوە، کاتێ دەچوو بۆ حەج یا بۆ عەمرە، کاتێ دەگەیشتە ناو مەککە، لەپێشا تەوافی قودومی لەسەر ئەم شێوەیە ئەنجام دەدا: سێجار بەهەڕاکردن دەسووڕایەوە بەدەوری بەیت داو چوار جاریش بەڕۆیشتنی ئاسایی، ئینجا دوو ڕکات نوێژی سوننەتی تەوافی دەکرد، ئینجا تەوافی نێوانی صەفاو مەڕوەشی دەکرد). (تاج/١٨٢/٢ز-٩٤ف-٢-ش/د/ت/ن).

٧٧٨- عَنْ ابْنِ عباس رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ: أَنَّ النبي صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَرَّ وَهُوَ يَطُوفُ بالكَعْبَةِ بِإنْسانٍ رَبَطَ يَدَهُ إلى إنْسَانٍ بَسيْرٍ أَوْ بخَيطٍ أَوْ بِشَيءٍ غَيْرَ

---

(١٨٢) اخرجه مسلم في الحج (صم/٢١٩/٨) - المترجم).

(١٨٣) أخرجه مسلم (صم/٧٠/٩استحباب الرمل في الطواف..) - المترجم).

ذِلكَ، فَقَطَعَهُ النَبيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِيَدِهِ، ثُمَ قَالَ: (قُدْهُ بِيَدِهِ) (الحديث ١٦٢٠– أطرافه في: ١٦٢١، ٦٧٠٢، ٦٧٠٣)[١٨٤]:

ئیبنوعەباس (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) تەوافی کەعبەی دەکرد، مرۆڤێکی بینی بە سیرمەیێ، یا بە هەودایێ، یا بە شتێ‌تر، دەستی خۆی بەستبوو بە مرۆڤێکی ترەوە، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) پەتەکەی قرتاند، ئەوجا پێی فەرموو: (دە ئەمجار دەستی بگرەو رایکێشە !).

٧٧٩– عَنْ أبي هريرة رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ أَبَابَكْرٍ الصّديق رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، بَعَثَهُ – في الحَجةِ التي أَمَّرَهُ عَلَيْهَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَبْلَ حَجةِ الَوداعِ – يَوْمَ النَّحْرِ، في رَهْطٍ يُؤَذِّنُ في النَّاس: ألا، لا يَحُجُّ بَعْدَ العامِ مُشْرِكٌ، وَلاَ يَطُوفُ بِالبَيْتِ عُرْيانٌ). (الحديث –١٦٢٢)[١٨٥]:

ئەبو هورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەو حەجەدا کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) ئەبوبەکری کردبوو بە سەرداری سەر حەج، کە بەر لەحەجی ماڵاوایی بوو، لەو حەجەدا ئەبوبەکر منی لەگەڵ دەستەیەکی تردا نارد، ڕۆژی جەژن جارماندا: ئیتر لەم ساڵ بەدواوە بتپەرستو هاوبەشپەیداکەر نەیەن بۆ حەج، وەکەسیش نابێ بە ڕوتی تەوافی بەیت بکا. (تاج/٢/١٨٨-ش/ت).

٧٨٠– عَنْ عبداللهِ بْنِ عباسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَدِمَ النبيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَكْةَ، فَطَافَ وَسَعَى بَيْنَ الصَّفَا وَالَمْروةِ، وَلَمْ يَقْرَبِ الكَعْبَةِ بَعْدَ طَوافِهِ بَها

(١٨٤) لم يوافقه مسلم علي تخريجه حسب خاتمة كتاب الحج في الفتح الباري).. المترجم)

(١٨٥) أخرجه مسلم في الحج، باب: لايحج بالبيت مشرك. رقم: ١٣٤٧.

حَتَّى رَجَعَ مِنْ عَرَفَةَ (الحديث ١٦٢٥)[١٨٦]:

**عەبدوڵڵای کوڕی عەباس** (ڕەزای خوای ل بێ) **فەرمووی: لە حەجی ماڵاوایی‌دا، پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **کاتێ هاتە ناو مەککە تەوافی قودومی کرد، وەسعی نێوان صەفاو مەڕوەی ئەنجام دا، پاش ئەوەی کەتەوافی کەعبەی کرد، ئیتر نزیکی کەعبە نەکەوتەوە تا لە چیای عەرەفات گەڕایەوە).**

## ئاو دان بەحاجیان

٧٨١- عَنِ ابنِ عمر رَضِيَ اللَّهُ عَنهُما قال: اسْتَأذَنَ العَبّاسُ بْنُ عَبْدِالمطلب رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ رَسُولَ الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَنْ يَبيتَ بِمَكَةَ، لَيالِيَ مِنىً، مِنْ أَجْلِ سِقَايَتِهِ، فَأذِنَ لَهُ). (الحديث ١٦٣٤ - أطرافه: ١٧٤٣، ١٧٤٤، ١٧٤٥)[١٨٧]:

**ئیبنو عومەر** (ڕەزای خوای ل بێ) **فەرمووی: عەبباسی کوڕی عەبدولموطەلیب، کە مامەی پێغەمبەر بوو، ڕێخوازی لە پێغەمبەر کرد، کەڕێگەی بدا، شەوەکانی مینا لە مەککە بمێنێتەوە، لەبەر ئاودان بەحاجیان ئەویش ڕێگەی مانەوەی پێدا). (تاج/٢/٢١٠ز-١٠٦-ش/د/ن)**

٧٨٢- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أنَّ رَسُولَ الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جاءَ إلى السِّقَايَهِ فاستَسْقى، فَقَالَ العَبّاسُ: يا فَضْلُ اذهبْ الى أمِكَ فَأْتِ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِشَرَابٍ مِنْ عِندِهَا. فَقَالَ، (أسْقِني). قَالَ: يارسول الله، إنَّهُمْ يَجْعَلُونَ أَيْدِيَهُمْ فيهِ، قَالَ: (اسقِني). فَشَرِبَ مِنْهُ، ثُمَّ أتى زَمْزَمَ، وَهُمْ

---

(١٨٦) قال العلامة العيني – عليه الرحمة -: (هذا الحديث من افراد البخاري (ج/٩/٢٦٨) – المترجم).

(١٨٧) أخرجه مسلم في الحج، باب: وجوب المبيت بمني،.. رقم: ١٣١٥.

يَسقُونَ وَيَعْمَلُونَ فيها، فَقَالَ: (اِعْمَلُوا، فإنَكُم عَلى عَمَلٍ صَالِحٍ) ثُمَّ قَالَ: (لَوْلا أنْ تُغْلَبُوا لَنَزَلْتُ، حَتَّى أَضَعَ الحَبْلَ عَلى هذِهِ). يَعْني: عاتِقَهُ، وَأَشَارَ إلى عَاتِقِهِ). (الحديث ١٦٣٥)[188]:

ئیبنو عەبباس (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- هات بۆ سەرچاوەکەو داوای ئاوی خواردنەوەی کرد، عەبباسیش بەفەزڵی کوڕی فەرموو: ئەی فەضل بڕۆ لە لای دایکت خواردنەوەی باش بهێنە بۆ پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- پێغەمبەریش -درودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: ئاوم بدەرێ لەم ئاوەی دەیدەی بەم خەڵکە. عەبباسیش فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودائاخر مەردومەکە دەستی تێدەخەن؟ فەرمووی: بم دەرێ قەیناکا، خۆ من ئاغاو پاشا نیم تاخۆم لەیەکەیەکی نەتەوە جیابکەمەوە.

ئنجا لێی خواردەوەو چوو بۆ سەر زەمزەم، لەوکاتەدا ئاویان هەڵدەگۆست و دەیاندا بەخەڵك، فەرمووی: ئاو هەڵگۆزن، بەڕاستی ئیشەکەتان ئیشێکی گەلێ چاکە). لەپاشا فەرمووی: (نەبادا خەڵکەکەی تریش چاو لە من بکەن و، کەڵکەتان لێ بکەن و لە ئەنجاما زۆرتان بۆ بهێنن و مەوداتان نەدەن کارەکەتان ئەنجام بدەن، ئەگینا منیش لەوڵاخەکەم دادەبەزیم و وەك ئێوە گوریسی سەتڵەکەم دەنایە سەر ئێرەم و خۆشم لەگەڵ ئێوەدا ئاوم لەگەڵتانا هەڵدەگۆزی و دەم دا بەحاجیان! وە ئامازەی بۆ سەرشانی کرد، لەوێدا کە فەرمووی: گوریسی سەتڵەکەم دەنایە سەر ئێرەم. (تاج/٢/٢٦٧ز — ١٣٣ — ب).

٧٨٣- عَنْ عَاصِمٍ عَنِ الشعبيِّ: أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ حَدَّثَهُ قَالَ: سَقَيْتَ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ زَمْزَمَ فَشَرِبَ وَهُوَ قَائِمٌ قَالَ

(١٨٨) هذا الحديث من أفراد البخاري (عيني/٩/٢٧٦) — المترجم).

عَاصِمٌ: فَحَلَفَ عِكْرِمَةُ: مَاكَانَ يَوْمِئِذٍ إلاَّ عَلى بِعَيرٍ. (الحديث ١٦٣٧ – طرفُهُ فى: ٥٦١٧)[١٨٩]:

عاصيم له شەعبی یەوە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئیبنوعەبباس قسەی بۆ کردم، فەرمووی: بەدەستی خۆم لەئاوی بیری زەمزەم ئاوی خواردنەوەم پێشکەش بە پێغەمبەر کرد، بەڕاوەستانەوە خواردیەوە. عاصیم فەرمووی: عەکرەمە سوێندی خوارد: کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) لەوکاتەدا کە ئەو ئاوەی نۆش کرد، بە سواریی وشترێ بوو). (تاج/٢/٢٦٥ز-١٣٢).

٧٨٤- عَنْ عُرْوَةَ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ رَضِي اللّٰهُ عَنْها فَقلتُ لَهَا: أَرَأَيْتِ قَوْلَ الله تعالى: إنَّ الصَّفَا وَالمَرْوَةَ مِنْ شَعَائِرِ اللهِ فَمَن حَجَّ البَيتَ أَو أعْتَمَرَ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِ أنْ يَطوَّفَ بِهِمَا) فَوَاللهِ مَا عَلى أحدٍ جُناحُ أنْ لايَطُوفَ بالصّفَا وَالمَرْوَةِ قالَتْ عَائشة رَضِي اللّٰهُ عَنْها بئسَ مَا قُلْتَ يا ابْنَ أُخْتِي، إنَّ هذاِهِ لَوْ كانت كَمَا أَوَّلْتَهَا عَلَيْهِ، كَانَتْ: لاَجُنَاحَ عَلَيْهِ أنْ لايَتطَوَّفَ بِهِمَا، وَلكنَّها أُنْزِلَتْ في الأنْصار، كَانُوا قَبْلَ أَنْ يُسْلِمُوا، يُهِلُّونَ لِمَنَاةِ الطَّاغِيَةِ الَّتِي كَانُوا يَعْبُدُونَهَا عِنْدَ المُشَلَّلِ، فَكَانَ مَنْ أَهَلَّ يَتحَرَّجُ أنْ يَطُوفَ بالصَّفَا والمَرْوَةِ، فَلَمَّا أَسْلَمُوا، سَأَلُوا رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ ذلِكَ، قَالُوا: يَارَسُولَ الله إنَّا كُنَّا نَتحَرَّجُ أنْ نُطُوفَ بَيْنَ الصفا وَالمَرْوَةِ، فَأنزَلَ اللهُ تَعالى: (إنَّ الصَّفَا وَالمَرْوَةَ مِنْ شَعَائِرِ اللهِ) الآية. قالَتْ عَائشَةُ رَضِي اللّٰهُ عَنْها: وَقَدْ سَنَّ رَسُولَ الله صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الطَوافَ بينهما، فَلَيْسَ لأحَدٍ أنْ يَتْرُكَ الطَّوافَ بَيْنَهُمَا). (الحديث ١٦٤٣ – أطرافة فى: ١٧٩٠، ٤٤٩٥، ٤٨٦١)[١٩٠]:

عورووەی کوڕی زوبەیری خوشکەزای حەزرەتی عائیشە (رەزای خوای لێ بێ)

---

(١٨٩) أخرجه مسلم في الأشربة، باب: في الشرب من زمزم قائماً، رقم: ٢٠٢٧.

(١٩٠) اخرجه مسلم في الحج باب: بيان أن السعي بين الصفا والمروة ركن لايصلح الحج إلا به رقم: ١٢٧٧.

فەرمووی: لە عائیشەی پوورمم پرسی، پێم گوت: پووری بەخودا وادەزانم ئەگەر کەسێ لەکاتی حەج و عەمرەدا نەیش گەڕی لەناوەندی صەفاو مەڕوەدا گوناهی ناگا؟ فەرمووی: بۆ؟ عەرزیم کرد: چونکە خودای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِنْ شَعَائِرِ اللهِ فَمَنْ حَجَّ الْبَيْتَ أو اعتَمَرَ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِ أَنْ يَطَّوَّفَ بِهِمَا – واتە: صەفاو مەروە لە دروشمەکانی خودان، جا هەرکەسێ حەجی کرد، یا عەمرەی کرد، گوناهی لەسەرنییە کە بگەڕێ لە نێوانی ئەم دووەدا﴾. دەی ئەمە بەڵگەی ئەوەیە کەکردنەکەی تاوان نییە، نەك بەڵگەی ئەوەبێ کەکردنەکەی پێویستە. کەواتە: نەکردنی دروستەعائیشە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەی خوشکەزای شیرینم !

ئەمەی تۆ دەیڵێیت قسەیەکی زۆر ناپەسەندە، چونکە ئەم ئایەتە، ئەگەر وەك تۆ تەئویلی دەکەیت وابێ، دەبوو نەظمەکەی ئاوا بوایە:

﴿لاجُنَاحَ عَلَيْهِ أَنْ لايَطوَّفَ بِهِمَا: تاوانی لەسەر نییە ئەگەر تەوافی نێوانی ئەم دووە نەکا﴾. لەبەرئەوە هەرکەسێ لەناوەندی صەفاو مەڕوەدا هاتوچۆ نەکا، لەسەر شێوەی بڕیاردراو، ئەوە خودا نەحەجی تەواو دەکاو نە عەمرەی.

دەزانی بۆچی ئەم ئایەتە لەسەر ئەم شێوەیەی کەهەیە هاتە خوارەوە: چونکە لەپێشا یاریدەدەران (ئەنصار) لە سەردەمی نەزانیدا، لەپێش ئیسلام بوونیاندا، جاران ئیحرامی حەجیان بۆ بوتێ دەبەست کە ناوی مەنات بوو، کە مسوڵمانان ناویان نا: مەناتی طاغیە، واتە: مەناتی سەرکەش، چونکە خەڵکێکی ئێجگار زۆری گومڕاکردبوو، ئەم بتە لەلای موشەللەلا بوو، کە ناوی شوێنێکە وا لەنزیکی قەدیدەوە، لەڕووی دەریاوە، لەوێدا دەیانپەرست، جا ئەوانەی کەئیحرامی حەجیان بۆ ئەم بتە

سەرکەشە دەبەست، ئیتر دوورە پارێزیان لەتەوافی صەفاو مەڕوە دەگرت، هەتا توخنی بتەکانی خەڵکی مەککە نەکەون، کە ناویان ئیساف‌و نائیلە بوو، ئیساف لەسەر تەپۆڵکەی صەفا بوو، وە نائیلە لەسەر تەپۆڵکەی مەڕوە بوو، جاکاتێ کەیاریدەدەران ئیسلام بوون، لەم بارەیەوە پرسیاریان لە پێغەمبەر کرد، عەرزیان کرد:

قوربان! ئێمە جاران ئاقاری ڕاکردنی نێوانی صەفاو مەڕوە نەدەکەوتین، جا ئایا ئێستا ئەرکی سەرشانمان لەم بارەیەوە چییە؟

ئیتر بەم بۆنەیە خودای گەورە، یەزدانی مەزن، ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِنْ شَعَائِرِ اللَّهِ. البقرة: من الآية ١٥٨﴾ تا کۆتایی ئایەت.

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: وەکی تریش ئەوەتا پێغەمبەر خوای -درودی خوای لەسەر بێ- بەکردارو بە گوتار، تەواف‌و هەڵسووڕانی نێوانی سەفاو مەڕوەی کردووە بە دەستوور، کەواتە: هیچ کەسێ مافی ئەوەی نییە کە واز لە هەڵسووڕانی نێوانی ئەم دوانە بهێنێ بەهیچ مەهانەیێ. (تاج/٢/١٨٩٨ز-٩٧).

## ڕاڤەو ڕوونکردنەوە:

عوروەی کوڕی زوبەیر کچەزای حەزرەتی ئەبوبەکری صەدیقە، فەقێی عائیشەی پووری بووە، هەمیشە لەگەڵ کۆمەڵێ زانای تردا، ئامادەی کۆڕی زانستی عائیشە دەبوون، کە لە ماڵی خۆیدا لە مەدینە دەیبەست، بۆ پەخشی زانست‌و ڕاگەیاندنی فەرموودەکانی پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ-.

عووروە یەکێکە لەپێشەوا هەرە ناوادارە ڕێزدارە مەزنەکانی پەیڕەوان

کە پێیان دەگوترێ: (تابعین: چینی دووەمی مسوڵمانان) یەکێکە لە حەوت مەلا گەورەکانی جیهانی ئیسلامی، کە لە زاراوی شەرعدا ناودارو ناسراون بە (فوقەهای سەبعە = حەوت شەعزانەکان).

کە ئەم زاتانەن:

١. عووروە.

٢. سەعیدی کوڕی موسەییب.

٣. عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عوتبە.

٤. قاسمی کوڕی موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکری صەدیق.

٥. سلێمانی کوڕی یەسار.

٦. خاریجەی کوڕی زەیدی کووڕی ثابیت.

٧. سالمی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر.

هەندێ دەڵێن: حەوتەم: ئەبوبەکری کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی حاریثە، هەندێ تر دەڵێن: حەوتەم: ئەبوسەلەمەی کوڕی عەبدوڕڕەحمانە.

ناوی دایکی ئەسمای کچی ئەبوبەکری سەدیقە، کە خوشکی باوکی عائیشەیە خاوەنی ئەم شانازییانەیە: پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- زاوایەتی، ئەبوبەکر باپیرەتی، زوبەیر باوکیەتی، ئەسماو دایکیەتی، عائیشە پوریەتی خوشکی دایکیەتی، ساڵی بیستی کۆچی لەدایك بووە، لە نەوەدو چوارا مردووە، کۆمەڵەی فەرموودە زانەکان فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە،

واتە: جێگەی متمانەی ئەوانە، کەواتە: لە پیاوانی صەحیحی بوخاری

و صەحیحی موسلیمیشە، لەشەش کتێبە ناودارەکانی فەرمووودەدا جگە لە خۆی عوروەی کوڕی زوبەیر ناوی تریان تیادا نییە، لەناو هاوەڵانیشدا عوروەی زوبەیر ناویان تیادا نییە، بۆ زێدە بەهرەو شارەزابوون بڕوانە: (تاج/٧٩/٥ز-١٠- مەزناهی زوبەیری کوڕی عەوام + ژمارە/٣ لەم پەڕاوە پیرۆزە، کەوا لەبەرگی یەکەمیدا + ژ/٦٠٢/٣٤٩ + ژ/٧٥ + تاج/١٥٢/٥ ز/٣٧ + ریاض/١٨٦/١ ز/٢٠٢ ز/٢٥ + تاج/٢٥٤/١٠ ز/٩٧).

٧٨٥– عن ابنِ عمر رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُما قال: كانَ رَسولُ الله صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إذا طَافَ الطَوَافَ خَبَّ ثَلاثاً وَمَشى أَرْبَعاً، وَكَانَ يَسْعى بَطْنَ المَسيلِ إذاَ طَافَ بَيْنَ الصَفَا وَالمَرْوَةِ (الحديث ١٦٤٤)[191]:

ئیبنوعومەر ڕەزای خوایان لێ بێ فەرمووی: جاران دەستووری پێغەمبەر درودی خوای لەسەر بێ وابوو کە تەوافی یەکەمی ئەنجامدەدا، کە ناودارە بەتەوافی قودووم -واتە: هەڵسوڕانی هاتنە پێش- سێ سەری یەکەمی لە حەوت سەرەکانی تەواف بە نەرمەغار ئەنجامدەدا، وەچواریشیانی بەڕۆیشتنی ئاسایی ئەنجام دەدا، وەکاتێ تەوافی نێوانی سەفاو مەروەی دەکرد، بەنێو شیوەکەی نێوانی سەفاو مەروەدا ڕای دەکرد).

## ڕوونکردنەوە:

شێخی عەینی ڕەحمەتی خودای لێبێ دەفەرموێ: (مەسیل -کە بە واتا ئاورێژگەیە -شیوێکە وا لەنێوانی گردی صەفاو گردی مەروەدا، برێتییە لە ئەندازەیەکی زانراو، لەپێش ئەوەی کە بگەیتە میلە سەوزەکەی کە بەگۆشەی مزگەوتەکەوە هەڵواسراە، هەتا دەگاتە ئاستی دوو میلە

(١٩١) يُنظرُ رَقمُ: ١٦١٦/٧٧٧ الذي سَبَقَ – المترجم).

سەوزەکەی کەوان لە بەرابەی یەکتری، کە یەکێکیان وا لەحەوشەی مزگەوتاو ئەوی تریان وا لەخانووەکەی عەبباس دا (رەزای خوای لێ بێ)).

٧٨٦- عَنْ جَابِرِ بْنِ عبداللهِ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ قَالَ: أَهَلَّ النَبِيّ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هُوَ وَأَصْحَابُهُ بالحِجِ، وَلَيْس مَعَ أحَدٍ مِنْهُم هَدْىٌ غَيْرَ النبِيّ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَطَلْحَةَ، وَ قَدِمَ عَلِيٌّ مِنَ اليَمَنِ وَمَعَهُ هَدْىُ، فَقَالَ: أَهْلَلْتُ بِما أَهَلَّ بِهِ النَبِيُّ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَأمَرَ النَبِيُّ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَصْحَابَهُ أنْ يَجْعَلُوهَا عُمْرَةَ وَيَطوفُوا، ثُمَّ يُقصِرُوا وَيَحلّوا إلاّ مَنْ كَانَ مَعَهُ الهَدْىُ، فَقَالُوا: نَنْطَلِقُ إلى مِنى وَذَكَرُ أَحَدِنَا يَقْطُرُ، فَبلَغَ النبِيَّ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: (لَوِ أستَقْبَلْتُ مِنْ أَمْرِ مَا اسْتَدْبَرْتُ مَا أَهْدَيْتُ، وَلَولاَ أَنَّ مَعي الهَدْيَ لأَحْلَلْتُ) (الحديث: ١٦٥١)[١٩٢]:

جابری کوڕی عەبدوڵڵا (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەحەجی ماڵاواییدا، پێغەمبەرو هاوڕێکانی ئیحرامی حەجیان دابەست، جگە لە پێغەمبەرو طەلحە، کەسیان دیاری بەیتیان پێ نەبوو، عەلیش لە یەمەنەوە هات بۆ حەج ئاژەڵی دیاری لەگەڵ خۆی هێنابوو، عەلی فەرمووی: منیش کاتی ئیحرام دابەستن گوتوومە: ئەوا ئیحرامم دابەست ڕێك وەك ئیحرام دابەستنی پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- جا لەمەککە پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- فەرمانی کرد بەهاوڕێکانی، کە حەجەکەیان بکەن بە عەمرە، لەسەر ئەم شێوەیە: تەوافی بەیت بکەنو توافی نێوانی صەفاو مەڕوەیش بکەنو ئەوجا مووی سەریان کورت بکەنەوە، ئیتر ئیحرام بشکێنن، هەتا ڕۆژی تەروییە (بڕ: ژمارە/٧٥٦) بەڵام ئەوانەیان کە ئاژەڵی دیاری بەیتیان واپێ بابەردەوام بن لەسەر حەجەکەیانو ئیحرام نەشکێننو نەیکەن بە

(١٩٢) ينظر رقم: ٧٥٦ — المترجم.

عەمرە.

هاوڕێیانی پێغەمبەریش -درودی خوای لەسەر بێ- وەك سەرسام بوونێ، فەرموویان: شتی وا سەیرە! چونکە سەردەکێشی بۆئەوە، کاتێ ئیحرام ببەستینەوەو بکەوینە ڕێ لە مەککەوە بەرەو میناو عەرەفات، چووك (زەکەر) مان مەنی لێ بتکێ، کە ئیحرام بشکێنین، لەگەڵ ژنیش کۆدەبینەوە، شتی وایش لەگەڵ باری حەج دا ڕێ ناکەوێ.

جا کاتێ ئەم قسەیەیان گەیشتەوە بەپێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (لەدەستم چوو ! دەنا ئەگەر ئێستام ئەوسا بوایە، منیش ئاژەڵی دیاری بەیتم لەگەڵ خۆم نەدەهێنا، وەلەبەر ئەوەیش نەبێ کەدیاری بەیتم واپێ منیش ئێستا دەمکرد بە عەمرەو ئیحرامم دەشکاند).

٧٨٧- عَنْ عَبْدِ العَزيز بن رُفَيْعٍ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ قَالَ: سَأَلْتُ أَنسَ بْنِ مَالِكٍ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ قُلْتُ: أَخْبِرني بِشَيْءٍ عَقَلْتَهُ عَنِ النَبي صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: ايْنَ صَلي الظُهْرَ وَالعَصْرِ يومَ التَّرْوِيَةِ؟ قَالَ: بِمني، قلتُ: فَأَيْنَ صَلَّى العَصْرَ يَوْمَ النَّفْرِ؟ قَالَ: بالابْطَحِ، ثُمَّ قَالَ: افْعَلْ كَمَا يَفْعَلُ أُمَرَاؤُكَ). (الحديث ١٦٥٣- طرفاه في: ١٦٥٤، ١٧٦٣)[١٩٣]:

عەبدولعەزیزی کوڕی ڕوفەیع فەرمووی: لە ئەنەسی کوڕی مالیکم پرسی، گوتم: شتێکم پێ بفەرموو: کە خۆت لەبیرت مابێ‌و لە پێغەمبەرەوە وەرتگرتبێ لەم بارەیەوە: ڕۆژی تەرویە، کە ڕۆژی هەشتەمی مانگی قوربانە، پێغەمبەرو مسوڵمانانی حەجکار لەکوێ نوێژی نیوەڕۆو عەصریان کرد؟؟ فەرمووی: لەمینا گوتم: ئەی ئەو ڕۆژەی کە ناوداره بەڕۆژی نەفر، کە ڕۆژی سیازدەی مانگی قوربانە، کە حاجیان لە

(١٩٣) اخرجه مسلم في الحج، باب: استحباب طواف الأفاضة يوم النحر رقم: ١٣٠٩.

میناوه دەگەڕێنەوه بۆ مەککە، یغەمبەرو هاوڕێیانی نوێژی عەصریان لەکوێ کرد؟ ئەنەس فەرمووی: لە ئەبطەح (بڕ: ژمارە: ١٥٥٩/٧٤٨) ئەوجا ئەنەس (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: (گرنگ ئەوەیە لەکاتی ئەنجامدانی حەجو عەمرەدا پەیڕەویی فەرمانڕەواکانت بکەی‌و ئەوان چی دەکەن تۆیش وا بکەو بەمەهانەی هەندێ وردەکاری جیاوازی و دووبەرەکی لەناو ڕیزی کۆمەڵەی حاجی‌یان دا بەرپامەکە). (تاج/٢/٢٢٥ز/١١٥ -ش).

٧٨٨- عَنْ أُمِ الفَضْلِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْها قالَتْ: شَكٌ النَّاسُ يَوْمَ عَرَفَةٌ في صَوْمِ النبي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَبَعَثْتُ إلى النَّبي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِشرابِ فَشَرِبُهُ). (الحديث ١٦٥٨ – اطرافه فی: ١٦٦١، ١٩٨٨، ٥٦٠٤، ٥٦١٨، ٥٦٣٦)[١٩٤]:

ئوممول فەضل (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژی عارفە، کەڕۆژی نۆهەمی مانگی قوربانە، کەحاجیان لەو ڕۆژەدا لەچیای عەرەفە سەرگەرمی ئەنجامدانی کردارەکانی حەجن، مەردومەکە کەوتنە گومانەوە کە ئایا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەم ڕۆژەدا بەڕۆژوە یانا؟ جا منیش جامێ شیرم بۆی نارد، تابزانین بەڕۆژووه یا نا، جا حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) شیرەکەی خواردەوه، ئیتر زانیمان کە بەڕۆژوو نییە). (بڕ: تاج/٢/١٣٤ ز/٦٦ - ش/د/ت).

ئوممول فەضل، ناوی لوبابەی کچی حاریثە، لەپێش کۆچ دا ئیسلام بووه، فەرموودەی زۆری لە پێغەمبەرەوه گێڕاوەتەوه، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (چوار خوشکە مسوڵمانەکە: مەیموونەی کچی حاریث‌و ئوممول فەضل‌و سەلماو ئەسماء). مەیموونەیان هاوسەری پێغەمبەر بوو،

(١٩٤) اخرجه مسلم في الصيام، باب: استحباب الفطر للحاج يوم عرفة، رقم: ١١٢٣.

کەخوشکی هەقی ئوممول فەضلە. جارێ خەوێ دەبینێ، دەیگێڕێتەوە بۆ پێغەمبەر، عەرزی دەکا: قوربان! لەخەونمدا بینیم ئەندامێ لەئەندامەکانی تۆ لەماڵی مندا بوو، پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (فاطیمەی کچم کوڕێکی دەبێ، تۆ شیری پێ دەدەی، زۆری پێنەچوو حوسەین لەدایك بوو).

گەلێ جار پێغەمبەر بۆ ڕێزلێنانی دەچوو بۆ ماڵی ئوممو فەضلی ئامۆژنی.

ئوممو فەضل لەپێش ئیمامی عەباسی مێردیدا لە سەردەمی جێنشینی عوسماندا دەمرێ. ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێبێ.

٧٨٩- عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِـي اللّـهُ عَنْـهُ أَنَّـهُ: جَـاءَ يَـوْمَ عَرَفَـةَ حِـينَ زالَـتِ الشَّمْسُ، فَصَاحَ عِنْدَ سُرادِقِ الحَجّاج، فَخَرَجَ وَعَلَيْـهِ مِلْحَفَـةٌ مَعَـصْفَرةٌ، فَقَـال: مَالَكَ يَا أَبَا عِبْدِ الـرحمنِ؟ فَقَـالَ: (الـرَّوَاحَ إنْ كُنْـتَ تُرِيـدُ الـسُّنَّةَ) قـالَ: هـذِهِ السَّاعَةَ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: فَأَنْظِرني حَتَّى أُفيضَ على رَأسي ثم أَخْرُجُ، فَنزَلَ حَتَّـى خَرَجَ الحَجَّاجُ، فَسَارَ بَيْنِي وَبَيْنَ ابي، فَقُلْتُ: إِنْ كُنْتَ تُرِيدُ السُّنَّةَ فَاقْصُرِ الخُطبَةَ وَعَجِلِ الوُقُوفَ، فَجَعَلَ يَنْظُرُ إلى عبداللهِ فلّما رَأى ذلـك عبـدالله قـالَ: صَـدَقَ، وكانَ عَبْدُالَملِكِ قَدْ كَتَبَ الى الحجاجِ: أنْ لايُخَالِفَ ابْنَ عُمَرَ في الحَجِ (الحـديث ١٦٦٠ – طرفاه في: ١٦٦٢، ١٦٦٣)[195]:

سالمی کوڕی ئیبنوعومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: عەبدول مەلیکی کوڕی مەروان -کە یەکێ بوو لە بەناوجێنشینەکانی ئەمەویەکان- نامەی نووسی بو حەجاجی کوڕی یوسفی ئەل -ثەقەفی-کە والی عەبدولمەلیك

(١٩٥) لمْ يُوَافِقْهُ مسلمٌ علي تخريجهِ (فتح/٣/٥٩٦ –خاتمة) – المترجم).

بـوو لـە مەککـە لەوکاتـەدا، وە مـیر حـەج بـوو: (کـە لـە بابـەتی حـەج دا سەرپێچی لە فەرمانی ئیبنو عومەر نەکات).

جا ڕۆژی عەرەفە کە لە نەمیرە دابەزی بوون، لـەکاتی دەمـی نیوەڕۆدا من خۆم لەگەڵ ئیبنو عومەردا بـووم، کەلـەو کاتـەدا تەشریفی هـات هـەتا گەیشتە لای سەراپەردەکەی حەجاج، لەوێ هاواری لێهەڵسا!!

حـەجاجیش دەرپـەڕی، بـەرکۆش (ازار)ێکـی گـەورەی بەعەصـفەر ڕەنگکراوی گرتبۆوە، گوتی: ئەوە چیتە ئەی بـاوکی عەبـدوڕەحمان! خێـرە چی قەوماوە، بۆ وادەکەی؟ ئیبنو عومەر ـرەزای خوایان لێ بێـ پێـی فـەرموو: (ئێـسا دەمـی ڕۆیـشتنە، کـاتی ئـەوە هـاتووە کەبکەوینـەڕێو بـەزویی بـڕۆین بـۆ ئێستگای عەرەفات، ئەگەر دەتەوێت پەیڕەوی تەواوی سوننەتی پێغەمبەر بکەی لـەم لایەنـەوە) حـەجاج گـوتی: ئێـستا ئـا بـەم قرچەی گەرمایـە؟ باوکم فەرمووی: (بەڵێ). حەجاج گوتی: دە مۆڵەتم بـدە تـا ئـاوێ دەکـەم بەخۆم دا و خۆم دەشۆرمو دەردەچم. جا ئیبنوعومەر دابـەزی تـا حـەجاج ئاوێکی کرد بەسەر خۆیداو ئەوجا دەرچوو وەکەوتـە ڕێ، سالم فـەرمووی: (لە ڕێگە حەجاج لە بەینی منو باوکمـدا دەڕۆیـی، جاپێیم گـوت: (ئەگـەر دەتـەوێت بەتـەواوی سـوننەتی پێغەمبـەر ـدروودی خوای لەسەر بێـ لـەم بارەیـەوە بپێکیـت ئـەوا نوێـژ بـە زوویـی بکـەو وتارەکـە کـورت بکـەرەوەو بـەزوویی بگـەرە ئێـستگای عەرەفـە، هـەتا وەسـتان لـەکێوی عەرەفـە زوو ئـەنجام بدەیت). حەجاجیش تـەماشایەکی استفساو ئامێزی باوکمی کرد، وەك بڵێ ئایا وایە؟ باوکیشم کەوای بینی پێی فەرموو: (بەڵێ سالم ڕاست دەکا).

## ڕوونکردنەوە:

ئەم بەهرانە لەم فەرموودەیە وەردەگیرێن، لەسەر فەرمایشتی ماموستای عەینی و ماموستای عەسقەلانی:

١. نوێژی جەماعەت لەپاش ئیمامی بەدکارو فاسقەوە دروستە، بەلام بە مەرجێ بیدعەتو فیسقەکەی نەگاتە رادەی کوفرو دژایەتی ئیسلام.

٢. زانا ئەگەر بۆ پێویستی کاری مسولمانان هاموشۆی پیاوی دەسەلاتداری ستەمکار بکا قەیدی نییە، وەك ئەم هاتنەی ئیبنوعومەر بۆلای حەجاج، بۆ کەوتنەڕێ لەکاتی دیاریکراوی خۆیدا.

٣. دروستە باشتر لەژێر فەرمانی لەخۆی خوارتردا بێ، وەك ئیبنو عومەر لە ژێر فەرمانی حەجاج دا بوو.

٤. تێگەیشتنو وەرگرتنی زانست بەئامارەیش دەبێ، وەك سەرلەقاندنو بە چاوو دەست ئامارەکردن.

٥. دروستە شاگرد لە حوزوری ماموستای دا فەتوا بدا. وەك سالم لە خزمەت باوکیدا فەتوای دا.

٦. دروستە زیانی کەم لەپێناوی سوودی گەورەتردا قەبوول بکرێ، کە ئەمە لە شەرعی پیرۆزدا پێی دەگوترێ: (احتمال المفسدة القليلة لتحصيل المصلحة الكبيرة).

٧٩٠- عَنْ جُبَيرِ بْنِ مُطعِمٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: أَضْلَلْتُ بَعيراً لي، فَذهبتُ أَطْلُبُهُ يَومَ عَرَفَةَ، فَرَأيتُ النبيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ واقفاً بِحَرَفَةَ فَقُلْتُ: هذا واللهِ مِنَ الحُمْسِ، فَمَا شأْنُهُ هَهُنَا؟ (الحديث ١٦٦٤)[١٩٦].

---

(١٩٦) أخرجه مسلم في الحج، باب: في الوقوف، وقوله تعالي: (ثمَّ أفيضُوا مِنْ حَيثُ أفَاضَ الناس، رقم: ١٢٢٠.

جوبەیری کوڕی موطعیم (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی وشترێکم ون بو بوو، ڕۆژی عارفە بوو چووم بۆی بگەڕێم، بینیم پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) لەخاکی عەرەفات وەستا بوو، کە عەرەفات وا لە دەرەوەی خاکی حەرەم، لەبەرئەوە سەرم سوڕما، چونکە پێغەمبەر قورەیشیە، قورەیشیش بەخۆیان دەگوت: حومس، لەبەر ئەوە لەڕۆژی عەرەفەدا نەدەچوون بۆ عەرەفەو لەخاکی حەرەم دەرنەدەچوون، لەموزدەلیفە دەوەستان، جا عەجایەب مام وگوتم: چ عەجەب پێغەمبەر لێرە وەستاوە، خۆبەخوا ئەویش لە حومسەکانە).

**ڕوونکردنەوە:**

بۆ تێگەیشتنی تەواو لەم فەرموودەیە ئەم فەرموودەیەی تر لەتاجول ئوصوولەوە ڕاگوێز دەکەین، بەرگی دووەم، لاپەڕە (٢٠١):

عائیشە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جاران قورەیش و ئەوانەی لەسەر ئایینی قورەیش بوون، لە موزدەلیفە ڕادەوەستان، لە ڕۆژی عەرەفەدا، وەپێیان دەگوتن: حومس، کەکۆی (أَحْمَس)ی عەرەبیە، واتە: دلێرەکان، عەرەبەکانی تریش لە عەرەفە ڕادەوەستان، جاکاتێ کە ئایینی پیرۆزی ئیسلام هات، خودای گەورەوسەروەر، فەرمانی کرد بەپێغەمبەری خۆی، کە لەخاکی بەست (حەرەم) دەرچێ و وەك خەڵکانیتر بڕوات بۆ خاکی عەرەفات، لەوێ ڕاوەستێ و لەپاشا لەوێوە دایەڕن و بڕۆن بۆ موزدەلیفەو مەشعەرولحەرام و مینا. وەك خودا لەم ئایەتەدا دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ أَفِيضُوا مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ النَّاسُ. البقرة: من الآية١٩٩﴾.

٧٩١- عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أنه سُئِلَ: كَيْفَ كَانَ رَسُولُ الله

صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَسيرُ في حَجَّةِ الوَداعِ حِينَ دَفَعَ؟ قَالَ: كَانَ يَسيرُ العَنَقَ، فَإذا وَجَدَ فَجْوَةً نَصَّ. (الحديث ١٦٦٦ – طرفاه في: ٢٩٩٩، ٤٤١٣)[197]:

عوروه (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆم دانیشتبووم لە خزمەتی ئوسامەی کوڕی زەیددا، کە لێیان پرسی: لەحەجی ماڵاواییدا، ئەوکاتەی کە پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێ- دەرچوو لە عەرەفاتەوە بۆ موزدەلیفە، کە بەم کردارە لە زاراوی شەرعی پیرۆزدا دەگوترێ (دەفع) لێیان پرسی: لە ڕێ چۆن دەڕۆیشت؟ فەرمووی: بە ڕەوت وشترەکەی ژێری لێدەخوڕی، ئەگەر بواریشی دەست کەوتایە تاوی دەدا). (بڕ: تاج/٢/٢٠٦ز-١٠٤ش/د/ن -ڕەحمەتی خودایان لێ بێ-).

## ڕوونکردنەوە:

لەتاج دا دەفەرموێ: (خۆم دانیشتبووم لەخزمەتی ئەنەس دا..تاد). وا دەزانم: ئەنەس هەڵەی نووسیارە، یا سبق القلمە، چونکە لە عەینی و فەتحولباری و سەرچاوەکانی بەردەستم دا، هەموویان هەر ڕیوایەت لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە دەکەن، زۆرینەی کات ئەگەر فەرموودەیێ لەدوو کەسەوە بگێڕنەوە ئامازە بۆ هەردووکیان دەکەن بڕوانە: عمدە القاری بەرگی دەیەم لاپەڕە/٦، فتح الباری فەرموودەی ژمارە/١٦٦٦ ج/٣ص٥١٨، صم، ٩ ص/٣٤ بحث الافاضة من عرفات الی المزدلفة. صم = صەحیحی موسلیم بە شەرحی نەوەوی).

٧٩٢– عَنْ ابْنِ عباسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: أَنَّهُ دَفَعَ مَعَ النَبِيّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَ عَرَفَةَ، فَسَمِعَ النَبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَراءَهُ زَجْراً شَديداً، وَضَرْباً وَصَوْتاً للإِبِلِ فَأشَارَ بِسَوْطِهِ إِلَيْهِمْ، وَقَالَ: (أَيُّها النَّاسُ، عَلَيْكُمْ بِالسّكِينَةِ فإِنَّ البِرَّ

---

(١٩٧) أخرجه مسلم في الحج، باب: الإفاضة من عرفات الي المزدلفة رقم: ١٢٨٦.

لَيْسَ بِاللإِيضَاعِ). (الحديث ١٦٧١) [١٩٨]:

ئیبنو عەبباس (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژی عەرەفە کە لەخزمەتی حەزرەتدا -دروودی خوای لەسەر بێ- لە عەرەفەوە ڕۆیشتین بۆ موزدەلیفە، لەڕێ پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- گوێی لێ بوو، هەندێ کەس، لەدوایەوە، دەییان لە وڵاخەکانیان دەکردو بەتوندی تێیان دەخوڕینو لێیان دەدان، تاخێرا بڕۆن، جا پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێ- بەقامچییەکەی ئاماژەی بۆیان کردو فەرمووی: (ئەی مسوڵمانینەلەسەرەخۆ بن باشی بە پەلە پەل نییە). (تاج/٢٠٦/٢ز – ١٠٤- ب/د).

٧٩٣– عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ ابي بكرٍ رَضِيِ اللّٰهُ عَنْهُ أَنَّهَا نَزَلَتْ لَيْلَةَ جَمْعٍ عِنْدَ الْمُزْدَلِفَةِ، فَقَامَتْ تُصَلي، فَصَلّتْ سَاعَةً ثمَّ قَالَت: يَابُنَيَّ هَلْ غَابَ القَمَرُ؟ قُلْتُ: لا، فَصَلَّتْ سَاعَةً، ثمَّ قَالَتْ: هَلْ غَابَ القَمَرُ؟ قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَتْ: فَارْتَحِلُوا، فَارْتَحَلْنَا وَمَضيْنَا، حَتىَّ رَمَتِ الجَمْرةَ، ثُمَّ رَجَعَتْ فَصَلَّتِ الصَّبْحَ فِي مَنْزِلِهَا، فَقُلْتَ لَهَا: ياهَنْتَاهُ مَا أُرَانَا إلاَّ قَدْ غَلَّسْنَا، قَالَتْ: يَابُنَيَّ، إنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أذِنَ لِلظُّعنِ). (الحديث ١٦٧٩) [١٩٩]:

عەبدوڵڵای مەولای ئەسمای کچی ئەبوبەکری صەدیق -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: شەوی موزدەلیفە، کە شەوی جەژنە، کەپێی دەگوترێ: شەوی جەمع، چونکە نوێژی شێوانو خەوتنان لەوێ کۆدەکرێنەوە، لەخزمەتی ئەسماء دا بوم، خەریکی ئەنجام دانی حەج بوو، لە موزدەلیفە دابەزی بوو، هەستا تاوێك دەستی کرد بە نوێژکردن، پاشان پێی فەرمووم: ڕۆڵەکەم! بزانە مانگ ئاوا بووە؟ گوتم: نەو، دیسان تاوێ تریش دەستی کردەوە بە

(١٩٨) لم يُوَافِقه مسلم علي تخريجه (فتح/٣/٥٩٦ – خاتمة كتاب الحج) – المترجم).

(١٩٩) اخرجه مسلم في الحج، باب: استحباب تقديم دفع الضَعَفَةِن رقم: ١٢٩١.

نوێـژکردن، دیـسان فەرموویـەوە: ئایـا مـانگ ئـاوابووە؟ گـوتم: بـەڵێ، فـەرمووی: کەواتـە بارکـەن بـا بـڕۆین بـۆ ڕەجمـی شـەیتانی گـەورە، جاکەوتینە ڕێگەو ڕۆیشتین هەتا ڕەجمی شەیتانی کرد لەکۆگا بەردەکەی عەقەبە، کەپێی دەگوترێ: (جمرة العقبة: الجمرة الكبرى: کۆگا بەردەکەی عەقەبە) ئینجا ئەسما گەڕایەوە بۆ هەوارەکەی میناى، وەنوێژی بەیانەکی لەشوێنەکەی خۆی لە مینا کرد. منیش پێم گوت: خانم ! وادەزانم: زوو ڕۆشتین لە موزدەلیفەوە بۆ ڕەجمی شەیتان‌و زووهاتین لەموزدەلیفە وەبۆ ئێرە کەمینایە؟ فـەرمووی: کـوڕی شـیرینم ! پێغەمبـەر (درودی خوای لەسەر بێ) مۆڵـەتی ژنـانی داوە، کـە بـە شـەو لـە موزدەلیفـەوە بکەونـە ڕێ بۆ مینـا، وەبەر لە جـەنجاڵی، ڕەجمی شـەیتان ئـەنجام بـدەن‌و نوێـژی بەیانـەکی لـە مینا بکەن (وەك لەم فەرموودەیەدا دەفەرموێ: ئیبنو عەبباس (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: (پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) منی لەگـەڵ لازەبونـەکانی کەسوکاری خۆیـا نـارد، بەشـەو لـە موزدەلیفـەوە بـەرەو مینـا کەوتینـە ڕێ، نوێـژی بەیانیمان لەمینا کردو ڕەجمی شەیتانمان کرد — نەسائی گێڕاویەتەوە).

٧٩٤- عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَتْ: نَزَلْنَـا المزدَلِفَـةَ، فَاسْـتَأذَنَتِ الـنبيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَوْدَةُ: أنْ تَدْفَعَ قَبْلَ حَطَمَةِ النَّاسِ، وَكَانَـتْ امـرأةً بَطِيئَـةً فأذِنَ لَهَا، فَدَفَعَتْ قَبْلَ حَطْمَةِ النَّاسِ، وَأَقَمْنَا حَتَّى أَصْبَحْنَا نَحْنُ، ثُمَّ دَفَعْنَا بدَفْعِهِ، فَلأَنْ أَكُونَ اسْتَأذَنْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ كَمَـا اسـتأذَنَتْ سَـوْدَةُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ مَفروحٍ بِهِ). (الحديث ١٦٨١) [٢٠٠]:

عائیشە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: سـەودەی دایکـی مـسوڵمانان، ئـافرەتێکی

(٢٠٠) اخرجه مسلم في الحج، باب استحباب تقديم دفع الضَعَفَةِ منَ النساء وَغيرِهنَّ.. رقم: ١٢٩٠.

قەبەی گرانە ڕۆ بوو، لەبەرئەوە داوای لەپێغەمبەر کرد، کە ڕێگەی بدا کە بەشەو لە موزدەلیفەوە بڕوات بۆ مینا لەگەڵ لازەبوون و بێ هێزەکانا، بەر لەوە خەڵکەکە بیکەن بە قەرەباڵغی و جەنجاڵی، پێغەمبەریش -درودی خوای لەسەر بێ- ڕێگەی ئەوەی دا، خۆزگەم منیش وەك سەودە بۆ ئەمە، کاتی خۆی، ڕوخصەتم لە پێغەمبەر دەخواست، شت نییە کە وەك ئەوە پێم خۆش بێ). (تاج/٢/٢٠٦ ز/١٠٥ -ش)

## ڕوونکردنەوە:

وەك لە فەرموودەکەی ئێرە دەردەکەوێ: عائیشە لەو حەجەدا، کە حەجی مالاوایی بوە، داوای مۆڵەتی لەپێغەمبەر نەکردووە کە لەگەڵ لا زەبونەکانا، شەو بگرێ بەدەمەوەو لە موزدەلیفەوە بڕوات بۆ مینا، بەڵکوو لەخزمەت پێغەمبەردا لە موزدەلیفە ماوەتەوە، هەتا بەیانی لێ داوە، لەوێ نوێژی بەیانییان زوو بەزوو کردوەو ئەوسا لەگەڵ پێغەمبەردا لە موزدەلیفەوە دەرچووین بۆ مینا.

٧٩٥- عَنْ عبدِالرحمن بن يزيد -رحمه الله تعالى- قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ عَبْدِاللهِ بنْ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ الى مَكَّةَ، ثم قَدِمْنَا جَمْعاً، فَصَلَّى الصَّلاتين، كل صَلاةٍ وَحْدَهَا بأذانٍ وَإقَامةٍ والعُشاءَ بينهُمَا، ثُمَّ صَليَّ الفَجْرَ حينَ طَلَعَ الفَجْرُ، قَائِلٌ يَقُولَ طلعَ الفجرِ، وَقَائِلٌ يَقُولُ: لَمْ يَطْلَعِ الفَجْرُ، ثمَّ قَالَ: إنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إنَّ هاتَيْنَ الصَّلاتَيْنِ حُوْلَتَا عَنْ وَقْتِهِما في هذا المَكَانِ، المغربَ والعِشاءَ، فَلاَ يَقْدمُ النَاسُ جَمْعاً حَتَّى يُعْتِموُا، وَصَلاَةَ الفَجرِ هذِهِ السَّاعَةَ). ثم وَقَفَ حَتَّى أسْفَرَ، ثُمَّ قَالَ: لَوْ أنَّ أميرَ المُؤمِنِينَ افاضَ الآنَ أصَابَ السُنَّة. فَمَا أَدْرِي: أَقَوْلُهُ كَانَ أَسْرَعَ أَمْ دَفْعَ عثمانَ رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ فَلَمْ يَزَلْ يُلبِي

حَتَّى رَمَى جَمْرَةَ العَقَبَةِ يَوْمَ النَّحْرِ). (الحديث ١٦٨٣) أطرافه في: (١٦٧٥، ١٦٨٢) [٢٠١]:

**عەبدو لڕەحمانی کوڕی یەزید** (رەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: لەخزمەتی عەبدوڵلای کوڕی مەسعووددا، لە سەردەمی جێنشینی عوسمانا، لە مەدینە دەرچووین بۆ مەککە بۆ حەج، کاتێ گەیشتینە موزدەلیفە لەوێ عەبدوڵلا نوێژی شێوانو نوێژی خەوتنانی بەجەمع کرد، لەپێشەوە بۆ شێوان بانگو قامەت کرا، ئەوسا بۆ خەوتنانیش بانگو قامەت کرا، وە لەنێونیانا شێوی خوارد، ئەوجا زۆر بەزویی نوێژی بەیانیشی لەموزدەلیفە کرد، زۆر زوو بو، یەکێ دەیگوت شەبەقی داوە، یەکێ دەیگوت شەبەقی نەداوە. ئەوجا ئیبنومەسعوود فەرمووی: پێغەمبەر** (درروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: (ئەم دوو نوێژە – واتە: شێوانو بەیانی – لەم شوێنەدا کە موزدەلیفەیە – کاتەکەیان گۆڕاوە، شێوان دوا دەخرێ تاکاتی نوێژی خەوتنانو لەگەڵ ئەودا بەجەمع دەکرێ، بەیانیش کەمێ لەپێش کاتی ئاسایی خۆیدا دەکرێ، چونکە حەجکاران نایەن بۆ موزدەلیفە، تا تاریك نەکا، لەبەرئەوە شێوان لەگەڵ خەوتنانا، لەکاتی خەوتنانا بەجەمع دەکەن، بەیانیش لەم دەمەدا، کەکەمێ پێش کاتی ئاسایی خۆیەتی). عەبدورەحمان فەرمووی: ئنجا ئیبنو مەسعود لەمەشعەرول حەرام ڕاوەستا، تابەری ڕۆژ زەرد هەلگەڕا، ئەوجا فەرمووی: (بریا ئا ئێستا لەم دەمەدا فەرمانڕەوای مسوڵمانان ئیمامی عوسمان دەستی دەکرد بەڕەوکردن بۆ مینا، دەی ئەگەر وابکا سوننەتی پێغەمبەر** (درروودی خوای لەسەر بێ) **دەپێکی، ئەوەی کە پێغەمبەر خۆی کردوویەتی لەم کاتەدا پەیڕەوی ئەوە دەکا). عەبدوڕڕەحمان فەرمووی: جا نازانم: قسەکەی ئیبنو مەسعوود**

---

(٢٠١) اخرجه مسلم في الحج، باب: استحباب زيادة التغليس بصلاة الصبح يوم النحر.. رقم: ١٢٨٩.

کردی، خێراتر بوو، یارەوکردنی عوسمان، ئیتر ئیبنومەسعوود بەدەم ڕێگەوەو تابەردی فڕەدا بۆ کۆگا بەردەکەی عەقەبە لەیەکەم ڕۆژی جەژندا، هەر لەببەیکەی دەکرد). (تاج/٢/٢٠٦ز – ١٠٤ ف/١+٢+٣+٤+ ٥ + ٦+ ل-٢٠١ز-١٠٧ ف/١+٣)

٧٩٦– عن عمر رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ أَنَّهُ صَلَّى بِجَمْعٍ الصُّبْحَ، ثُمَ وَقَفَ فَقَال: إنَّ الْمُشْرِكِينَ كَانُوا لاَيُفِيضُونَ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، وَيَقُولُونَ: اَشْرِقْ ثَبِيرُ، وَأَنَّ النبِيَّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَالَفَهُمْ، ثُمَّ أَفَاضَ قَبْلَ أَنْ تَطْلُعَ الشَّمْسُ). (الحديث ١٦٨٤– طرفه في: ٣٨٣٨) [٢٠٢]:

عەمری کوڕی مەیموون (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بۆخۆم لەگەڵ عومەری کوڕی خەطابدا بووم، لەکاتی جێنشینیی خۆیدا، لەکاتی حەج کردندا، کاتێ نوێژی بەیانی لە موزدەلیفە کرد، فەرمووی: جاران هاوبەشپەیداکەرەکان -کە لە زاراوەدا پێیان دەگوترێ: موشریکین – تاخۆر نەکەوتایە، لەموزدەلیفەوە ڕەویان نەدەکرد بۆ مینا، لەم بارەیەوە دەیانگوت: (با خۆر لەچیای پەبیر گزنگ بدا ئەوسا دەڕۆین بۆ مینا). (بەڵام پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- پێچەوانەی ئەوانی دەکردو لەپێش خۆرکەوتندا دەڕۆیشت بۆ مینا). (تاج/٢/١٠٨ز-١٠٤ ف/ ٦).

٧٩٧– عن أبي هريرة رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ أنَّ رَسُولَ الله صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَأى رَجُلاً يَسُوقُ بَدَنَةِ، فَقَالَ: (ارْكَبْها) فَقَالَ: إنَّها بَدَنَة، فقال: (إرْكَبْهَا) قَالَ: إنَّهَا بَدَنَة، قَالَ: (إرْكَبْهَا وَيْلَكَ). في الثَالِثَةِ اَوْ في الثَّانِيَةِ). (الحديث ١٦٨٩ – أطرافه في: ١٧٠٦، ٢٧٥٥، ٦١٦٠) [٢٠٣]:

---

(٢٠٢) لم يوافقه مسلم عليتخريجه وهو من افراد البخاري عن مسلم (فتح/٣/٥٩٦– خاتمة، عيني/١٠/٢٢)– المترجم).

(٢٠٣) أخرجه مسلم في الحج، باب: جواز ركوب البَدنَة المُهداة لمَن احتاج إليها، رقم:١٣٢٢.

**ئەبوهورەیرە** (رەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** -دروودی خوای لەسەر بێ- **تەماشای کرد واپیاوێ وشترێ لێ دەخوڕێو خۆی بەپێ دەڕوا، فەرمووی: (سواری بە) پیاوەکە گوتی: ئاخر چۆن سواری بم، ئەمە وشتری دیاری مەککەیە؟ فەرمووی: (سواری بە) گوتی: ئاخر ئەمە وشتری دیاری مەککەیە؟ پێغەمبەر** -دروودی خوای لەسەر بێ- **لە جاری سێیەم دا، یا لەجاری دووەمدا، بۆ تەمێی کابرا پێی فەرموو: (سواری بە ئەی خانە خراب !). بۆ یە پێغەمبەر وای پێفەرموو، چونکە مافی ئەوەی نەبوو، کە فەرمانەکەی جێبەجێ نەکا).**

٧٩٨- عنِ ابن عمر رَضِي اللّهُ عَنْهما قَالَ: تَمتَّعَ رَسُولَ اللهِ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ فِي حَجَّةِ الوَدَاعِ بالعُمْرَةِ إلَى الحَجِ، وَأَهدَى، فَسَاقَ الهَدْيَ مِنْ ذي الحُلَيْفَة، وبَدَأ رَسُولَ اللهِ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ فَأَهَلَّ بالعُمْرةِ، ثُمَّ أَهَلَّ بالحِجِ، فَتمتَّعَ النَّاسُ مَعَ النبيّ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ بالعُمْرةِ إلَى الحَج، فَكَانَ مِنَ النَاسِ مَنْ أَهْدَى فَسَاقَ الهَدْيَ، وَمنهُمْ مَنْ لَمْ يُهْدِ، فَلَمَّا قَدِمَ النبيُّ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ مَكّةَ، قَالَ لِلنّاسِ (مَنْ كَانَ مِنكُمْ أَهْدى فإنَّهُ لايَحِلُّ لِشَيْءٍ حَرُمَ مِنْهُ، حَتَّى يَقْضِيَ حَجّهُ، وَمَنْ لَمْ يَكُنْ منكم أهدى فليَطُفْ بالبَيتِ وَبالصَّفَا وَالمَرْوَةِ، وَلْيُقَصِرْ وليُحَلِلْ، ثم لِيُهِلَّ بالحَجّ، فَمَنْ لَمْ يَجِدْ هَدْياً فليَصُمْ ثَلاثَةَ أيَامٍ في الحَجِ وَسَبْعَةٍ إذا رَجَعَ إلَى أهْلِهِ). (الحديث ١٦٩١)[٢٠٤]:

**ئیبنو عومەر** -رەزای خوایان لێ بێ- **فەرمووی: پێغەمبەری خودا** -دروودی خوای لەسەر بێ- **لە حەجی مالاواییدا، عەمرەو حەجی بەیەکەوە کرد، لەسەرشێوەی قیران، وەئاژەڵی دیاری بەیتیشی لە ذولحولەیفەوە لەگەڵ خۆی برد، پێغەمبەر** -دروودی خوای لەسەر بێ- **لەپێشەوە ئیحرامی بەحەج دابەست، ئەوسا عەمرەیشی**

(٢٠٤) أخرجه مسلم في الحج، باب: جواز ركوب الدبنة: رقم: ١٣٢٢.

تێکەڵ کرد، لەکاتی تێکەڵکردنی عەمرەکە بە حەجەکەوە دیسان دەستی کردەوە بەتەلبییەکردن بەهەردووکیان، جا حەجکاران هەیان بوو ڕێک وەك پێغەمبەر حەج و عەمرەیان کرد، چونکە: هەیانبوو ئاژەڵی دیاری بەیتی لەگەڵ خۆی هێنابوو، وەهەیان بوو ئاژەڵی دیاری بەیتی لەگەڵ خۆی نەهێنا بوو. جاکاتێ پێغەمبەر ـدرودی خوای لەسەر بێـ گەیشتە مەککە، بە مەردومەکەی فەرموو: (هەرکەسێ لەئێوە ئاژەڵی دیاری بەیتی لەگەڵ خۆی هێناوە، ئەوە دەبێ بەردەوام بێ لەسەر ئیحرامەکەی و ئیحرام نەشکێنێ هەتا حەجەکەی تەواودەکا، چونکە هیچ شتێ لەوانەی کەبەهۆی ئیحرام بەستنەکەیەوە لێی قەدەغە بووە، هەتا حەجەکەی تەواو نەکا، ئەو شتانەی بۆ ڕەوا نابێتەوە، بەلام هەرکەسێ لەئێوە دیاری بەیتی لەگەڵ خۆی نەهێناوە با تەوافی بەیت و تەوافی نێوانی صەفاو مەروە بکاو مووی سەری کورت بکاتەوە و ئیتر ئیحرام بشکێنێ، لەپاشا لەڕۆژی تەروییەدا ئیحرامی حەج ببەستێتەوە، بەلام ئەوانەی کە ئیحرام دەشکێنن دەبێ دیاری بەیت سەربڕن، جا ئەگەر ئەمانە دیای بەیتیان بۆ پەیدا نەکرا، ئەوا دەبێ سێ ڕۆژ لەڕۆژانی کاتیکردنی حەجەکە بەڕۆژووبن و حەوت ڕۆژیش کەگەڕانەوە بۆ ناو کەس و کاریان).

٧٩٩- عَنِ المِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ وَمَرْوانَ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُما قالاَ: خَرَجَ النبيّ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنَ المدِينَةِ في بِضْعَ عَشرةَ مائَةً مِنْ أصْحابِهِ، حَتّى إذا كانُوا بِذِى الحليفَةِ، قَلَّدَ النبيُّ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الهَدْىَ وَأَشْعَرَ وَأَحْرِمَ بالعُمرَةِ) (الحديث ١٦٩٤ – اطرافه في: ١٨١١، ٢٧١٢، ٢٧٣١، ٤١٥٨، ٤١٧٨، ٤١٨١). (الحديث ١٦٩٥ – أطرافه في: ٢٧١١، ٢٧٣٢، ٤١٥٧، ٤١٧٩، ٤١٨٠)[٢٠٥]:

---

(٢٠٥) لم يوافقه مسلم علي تخريجه (فتح/ ٣/٥٩٦ – خاتمة كتاب الحج) – المترجم).

میسوەری کوڕی مەخرەمەو مەڕوانی کوڕی حەکەم (رەزای خوای لێ بێ) دەفەرموون: لەکاتی ڕووداوی حودەیبیەدا، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) خۆی و نزیکەی هەزارو چوار سەدکەس لەیارانی، لەمەدینەوە ڕۆیشتن بۆ مەککە، جارۆیشتن هەتا گەیشتنە ذولحولەیفە، لەوێ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) وشترە دیارییەکانی بەیتی دیاری کردو یەکی جووتێ سۆلی کردە ملیانو تیغی دا لە دووگیان، تانیشانە ببن کەئەم ئاژەڵانە دیاری ماڵی خودان، باکەس دەستیان بۆ نەبا، هەتا دەگەنە جێگەی سەربڕینیان، ئەگەر کەسێکیش کاری بەگۆشتەکەیان هەیە باشوێنیان بکەوێ بۆئەوێ. وەپێغەمبەرو هاوڕێیانی لە میقاتی خەڵکی مەدینەوە کە ذولحولەیفە ئیحرامی عەمرەیان بەست). (تاج/٢/٢٤٣ز-١١٩ + تاج/٢/١٦٠ ز/٨١ ف/٢+٢٤٢ ز/١١٨ ف/١ + ل/٢٤٣ ز/١١٩ ف/١).

## ڕاڤەو ڕوونکردنەوە:

میسوەری کوڕی مەخرەمە (رەزای خوای لێ بێ) هاوڕێی پێغەمبەرە، بە دوو ساڵ لە دوا کۆچ لەمەککە لەدایك بووە، لە ریجالی صەحیحەین، واتە: لەپیاوانی بوخاری و موسلیمە، کەپێغەمبەر وەفاتیکرد ئەو تەمەنی هەشت ساڵان بوو، مەلایەکی شەرعزانی گەورە بوو، زۆر بەڕێزو بەدین بوو، لەتەمەنی شەستو دوو ساڵیا، لە حیصارەکەی مەککەدا، لە سەردەمی ئیبنو زوبەیردا، لە شەستو چواری کۆچیدا، لەکاتێکا، لەمەسجیدولحەرام، لەناو حیجردا، نوێژی دەکرد، بەردێ لەمەنجەنیقی گەمارۆ دەرەکانەوە بەری کەوتو شەهیدی کرد، ئیبنو زوبەیر لەحەجون نوێژی لەسەر تەرمەکەی کرد.

مەڕوانی کوڕی حەکەم (رەزای خوای لێ بێ) قوڕەیشییە، ئەمەوییە، دەڵێن: لەپاش کۆچ بە دوو ساڵ، یا بە چوار ساڵ لە دایك بووە، چەسپاوە کە پێغەمبەری بە منالّی دیوە، بەڵام نەچەسپاوە کە شتی لە پێغەمبەر بیستبێ، ئەم فەرموودەیە لە مەراسیلی صەحابەیە.

٨٠٠- عَنْ عِائِشَةَ رَضِي اللّٰهُ عَنْها: أنه بَلَغَهَا: أنَّ عبدالله بنَ عباس رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ قال: مَنْ أَهْلَ هَدْياً، حَرُمَ عَلَيْهِ مَايَحْرُمُ عَلَى الحَاجِ، حَتىَّ يُنْحَرَ هَدْيُهُ، فَقَالَتْ عائِشَةُ رَضِي اللّٰهُ عَنْها لَيْسَ كَمَا قَالَ ابنُ عباسٍ، أَنَا قَلاَئِلَ هَدْيَ رَسولِ اللهِ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ بِيدى، ثمَّ قَلّدَهَا رَسولَ الله صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ بَيَديه، ثُمَّ بَعَثَ بِهَا مَعَ أبيض، فَلَمْ يَحْرُمْ عَلَى رِسوُلِ الله صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ شَيئُ أحلّهُ اللهُ حَتىَّ نُحرِ الهَدْى). (الحديث ١٧٠٠- اطرافه في: ١٦٩٦، ١٦٩٨، ١٦٩٩، ١٧٠١، ١٧٠٢، ١٧٠٣، ١٧٠٤، ١٧٠٥، ٢٣١٧، ٥٥٦٦)[٢٠٦]:

گەیشتەوە بەعائیشە (رەزای خوای لێ بێ) کە عەبدوڵلای کوڕی عەباس (رەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: گوایە هەرکەسێ ئاژەڵی دیاری بنێرێ بۆ مەککە، ئەوەی لە حاجی لەکاتی حەج کردندا، حەرام دەبێ لەویش حەرام دەبێ، هەتا ئاژەڵە دیارییەکەی لە کاتو جێگەی خۆیدا سەردەبڕڕێ، ئەوسا چی لێ قەغەدە بووە، بۆی ڕەوادەبێتەوە. عائیشە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەمە وا نییە وەك ئیبنوعەباس دەڵێ، چونکی من بەدەستی خۆم ملوانکەکانی ئاژەڵە دیارییەکانی پێغەمبەرم هۆنیوەتەوە، یپێغەمبەریش بەدەستی خۆی ئەو ملوانکانەی کردە مل وشترە دیارییەکانیو، ئەوجا لەو ساڵەدا

---

(٢٠٦) أخرجه مسلم في الحج، باب: استحبا بعث الهدي الي الحرم لمن لايريد الذهاب بنفسه، رقم: ١٣٢١.

کەئەبوبەکری باوکم میر حەج بوو، بە باوکما ناردنی بۆ هەژارانی مەککە، وەپێغەمبەر خۆشی لەو ماوەیەدا بەهۆی ناردنی ئەو دیارییەوە، ئەوەی خوا بۆی حەلاڵ کردبوو، لێی قەدەغە نەبوو).

٨٠٠ (مكرر –١)– وَعنها رَضِي اللّٰهُ عَنْها في رِواية، قالَتْ: أَهْدَى النبيُّ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَرَّةً غَنَماً. (الحديث ١٧٠١ – اطرافه تقدمت قبله):

لەگێڕانەوەیەکی تریدا عائیشە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ساڵێ پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێ ئاژەڵی وردەی بەدیاری نارد بۆ مەککە.

٨٠٠ (مكرر – ٢) وَفي رِواية عنها رَضِي اللّٰهُ عَنْها قالَتْ: كُنْتُ أَفْتِلُ القَلائِدَ للنبِي صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَيُقَلِدُ الغَنَمَ، وَيُقيمُ في أهْلِهِ حَلالاً. (الحديث ١٧٠٢):

لەگێڕانەوەیەکی تریدا: خۆم ملیوانکەم دەهۆنییەوە بۆ پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێ بۆ دیاریکردنی ئاژەڵی دیاریخانەی خودا، پێغەمبەریش دروودی خوای لەسەر بێ بەدەستی خۆی دەیکردە ملی بزنو مەڕو دەیناردن بەدیاری بۆ بەیت، وەخۆشی لەناو ماڵو منداڵی خۆیدا دەمایەوەو نەدەچوو بۆ حەج، وە لەو ماوەدا حاڵی بێ ئیحرام بوو، نەوەك حاڵی ئیحرامدار) (تاج/٢/٢٥٧ ف/٤+٥).

٨– (مكرر/٣)– وَفي رِواية عنها رَضِي اللّٰهُ عَنْها قالَتْ: فَتَلْتُ قَلائِدَهَا مِنْ عِهْنٍ كَانَ عِنْدِي. (الحديث ١٧٠٥):

لەگێڕانەوەیەکی تردا عائیشە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ملیوانکەی ئاژەڵە دیارییەکانم لەهەندێ خوری بادا، کەهی خۆم بوو.

٨٠١– عَنْ عَليّ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ قَالَ: أَمَرَني رَسُولُ اللهِ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أنْ أتَصَدَقَ بِجِلالِ البُدْنِ الّتي نَحَرْتُ وَبِجُلُودِهَا (الحديث ١٧٠٧ –

اطرافه في: ١٧١٦و ١٧١٦م، ١٧١٧، ١٧١٨، ٢٢٩٩)[٢٠٧].

پێشەوا عەلی کوڕی ئەبوطالیب (رەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمانی پێکردم کە ڕابوەستم بەسەر وشترە قوربانییەکانیەوە، وەگۆشتو پێستو جلو کۆپانەکانیان ببەخشمەوە، وەهیچیان لێنەدەم بەقەسابەکە، لەباتی کرێی سەربڕین، بەڵام لەجیاتی پشك قەیناکات، فەرمووی: خۆمان شتێکیتری لە باتی ئەوە دەدەینێ) (تاج/٢-٢١٦-ش/د/ن) + (تاج/٢/٢٥٦ ف/٢) + (بڕ: ژمارە/٨٠٥).

٨٠٢- عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِخَمْسٍ بَقِينَ مِنْ ذِي الْقَعْدَةِ، لانُرى إلاّ الحَجَّ، فَلَمَّا دَنَوْنَا مِنْ مِكَّةِ، أَمَرَ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَنْ لَمْ يَكُنْ مَعَهُ هَدْىٌ إذا طَافَ وَسَعى بَيْنَ الصَّفَا وَالمرْوَةِ أنْ يَحِلَّ، قَالَتْ: فَدُخِلَ عَلَيْنَا يَوْمَ النَّحْرِ بِلَحْمِ بَقَرٍ فَقُلْتُ: مَا هذا، قَالَ: نَحَرَ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ أَزْوَاجِهِ (الحديث ١٧٠٩)[٢٠٨].

عائیشە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەت پێغەمبەردا -دروودی خوای لەسەر بێ- لەمانگی ناوجەژنان پێنج شەوی مابوو، لەمەککە دەرچووین بۆ حەج، لەساڵی حەجیماڵاواییدا، جا کاتێ نزیکی مەککە بووینەوە، پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمانی کرد بەوانەی کە ئاژەڵی دیاریی خانەی خودایان پێ نییە، تەوافی بەیت بکەنو سەعی نێوانی سەفاو مەروە بکەنو ئەوجا سەرکورت بکەنەوەو ئیحرام بشکێنن، عائیشە فەرمووی: لە ڕۆژی جەژندا گۆشتی گایان بۆ هێنایین. من پرسیم: ئەمە چییە؟ وتی: پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- قوربانی کردووە بۆ هاوسەرەکانی).

---

(٢٠٧) أخرجه في الحج، باب: في الصدقة بلحوم الهدي وجلودها وجلالها رقم: ١٣١٧.

(٢٠٨) أخرجه مسلم في الج (عيني/١٠/٤٧) — المترجم).

٨٠٣- عَنْ عبدِاللهِ بْنِ عُمَرَ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُما أَنَّهُ كَانَ يَنْحَرُ فِي الْمَنْحَرِ، يَعْنِي: مَنْحَرَ رَسُولِ الله صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (الحديث ١٧١٠)[٢٠٩]:

**نافیع** (رهزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: دەستووری عەبدوڵڵای کوڕی عومەر** رهزای خوایان لێ بێ **وابوو، لەوجێگەیەدا کەپێغەمبەر ئاژەڵی دیاری تیادا سەردەبڕی، ئەویش ئاژەڵی دیاری خۆی لەوێدا سەردەبڕی).**

٨٠٤- عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُما: أنه أَتَىَ عَلى رَجُلٍ قَدْ أَنَاخَ بَدَنَتَهُ، يَنْحَرُهَا، قَالَ: أبْعَثْها قِياماً مُقَيَّدَةً، سُنَّةَ محمدٍ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. (الحديث ١٧١٣)[٢١٠]:

**ئیبنو عومەر** رهزای خوایان لێ بێ **پیاوێکی دی، وشترێکی قوربانی یـیخ دا بـو، خەریکبو سەری دەبڕی دەیکرد بەقوربانی بۆخۆی، ئیبنوعومەر پێی فەرموو: هەڵیسێنە سەر پێو، دەستی چەپی لە ئەژنۆیا بچەمێنەوەو بەپەتێ بیبەستە بە قۆڵیەوە، چونکە یاساو دەستووری پێغەمبەر** دروودی خوای لەسەر بێ **وابوو، لەسەر ئەو شێوەیە وشتری قوربانی و دیاری بەیەتو وشتری تری سەردەبڕی (تاج/٢/٢١٥-ش/د/ن).**

## ڕوونکردنەوە:

**لە عەرەبیدا (نەحر) و (زەبح) جیاوازییان هەیە، بۆ ڕوونکردنەوەو تێگەیشتنی تەواو لەم بابەتە، ئەم دەقە لە پەڕاوی (٣- بڕیارەکانی سەربڕینو سەربڕاوەکان) ڕاگوێز دەکەم، لەزنجیرەی ڕۆشنبیری تەندروستی، لە ڕوانگەی دەستوورەکانی ئایینەوە، کە ڕێکخراوی**

(٢٠٩) قال العيني: (وهذا الحديث من أفراد البخاري) — المترجم).

(٢١٠) أخرجه مسلم في الحج، باب: نحر البُدْنِ قِيَاماً مُقَيَّدَة، رقم: ١٣٢٠.

تەندروستی جیهانی دەری کردوون بە عەرەبی، وەبەندە حەوت ژمارەیانم وەرگێڕاوەتە سەرزمانی شیرینی کوردی، وە لەساڵی (١٩٩٩) چاپکراون، لەلایەن ڕێکخراوی ناوبراوەوە:

**١- چەند بنەمایەکی گشتی:**

١- حەڵاڵ کردنی ئەو گیانلەبەرانەی کەگۆشتیان دەخورێ، لەسەر شێوەی شەرعی، جۆرە خواپەرستیەکە، بەلای مسوڵمانانەوە، وەبەیەکێ لەم شێوە شەرعیانەی دواوە تەواو دەبێ:

أ- سەربڕین، لە شەرعا بڕێتییە لەوە کە قورقوڕاچکەو سوورێنچکەو دووشا دەمارەکانی ئەم دیوو ئەو دیوی قورقوڕاچکە بەتەواوی ببڕێن، ئەم جۆرە بەزۆری بۆ بزن‌و مەڕو ڕەشەوڵاخ‌و باڵندە دەبێ، بۆ شتی تریش دروستە بەکاربهێنرێ.

ب- سەربڕین لە بۆتەقەی مل دا، لە دەم سەرووی سینگەوە، کە (ئەم جۆرەیان) بەعەرەبی پێی دەگوترێ: (النحر). شێوەی (أ) بەعەرەبی پێی دەگوترێ: (الذبح). جیاوازی ئەم دوو شێوازە ئەوەیە:

یەکەمیان لەلای سەروی ملەوە ئەنجام دەدرێ (جێگەی سەربڕینەکە لەلای سەرەوە نزیکە) دووەمیان لەلای خوارووی ملەوە ئەنجام دەدرێ، (واتە: لەچەڵەمەی سینگەوە نزیکە). ئەم شێوەی (ب)یە، بەزۆری بۆ وشترو شتی ملدرێژی وەکوو وشتر بەکاردەهێنرێ، دروستە بۆ ڕەشەوڵاخیش بەکار بهێنرێ.. (بڕوانە: پەڕاوی ناوبراو، لاپەڕە/٦) وەکی تر گوتەی هاوڕێی پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- کە بفەرموێ: (سوننەتی پێغەمبەر لەم بارەیەوە وا وایە، یا یاساو دەستووری پێغەمبەر، سەبارەت بەم کارە وایە) یان بفەرموێ: (ئەم شتە لە سوننەتدا وایە) ئەم گوتەیە

دادەنرێ بە فەرموودەی بەرزەوە بوو، واتە: بە حەدیسی مەرفووع، لەلای هەردوو پیر، کە شێخی بوخاری و شێخی موسیلمن، ڕەحمەتی خودایان لێبێ، چونکە ئەوەتا ئەم دوو زاتە، ئەم فەرموودەیەیان کردووە بەبەڵگە لەسەریەکێ لە سەرباسەکانی صەحیحەینەکەیان.

٨٠٥- عَنْ عَليّ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ قَالَ أَمَرَني النبيُّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ أَقُومَ عَلَى البُدْنِ، وَلاَ أُعْطِيَ عَلَيْهَا شَيْئاً في جِزَارَتِهَا(الحديث ١٧١٦ مكرر)[٢١١]:

وەرگێڕاوی ئەم فەرموودەیە بەتەواوی لەژمارە/٨٠١دا ڕابوورد.

٨٠٦- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِاللهِ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ قَالَ: كُنَّا لاَنَأْكُلُ مِنْ لُحُوِ بُدْنِنَا فَوْقَ ثَلاَثِ مِنىً، فَرَخَصَ لَنَا النبيُّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (كُلُوا وَتَزَوَّدُوا) فَأَكَلْنَا وَتَزَوَّدْنَا (الحديث ١٧١٩ - أطرافه في: ٢٩٨٠، ٥٤٢٤، ٥٥٦٧)[٢١٢]:

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەپێشدا بەس لەماوەی سێ ڕۆژەکانی مینادا، کە لەکاتی حەج دا لەوێ دەماینەوە، لەگۆشتی قوربانی خۆمان دەخوارد، هەروا لەگۆشتی ئاژەڵی دیاریخانەی خوداو گۆشتی تری لەم بابەتانە، لەپاشدا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ڕێگەی داین و فەرمووی: (لێی بخۆن و توێشوویشی لێ بەرن بۆ ڕێگەتان، ئیتر ئێمەیش لەوە دوا هەم لێمان دەخواردو هەم توێشووشمان لێدەکرد). (تاج/٢/٢١٦-ش).

---

(٢١١) حسب قول الشيخ العسقلاني في خاتمة كتاب الحج الحديث من أفراد البخاري وحسب قول الشيخ العَيني الحديث طرف من حديث طويل رواه مسلم - المترجم).

(٢١٢) أخرجه مسلم في الاضحي، باب: بيان ماكان من النهي عن اكل لحوم الاضاحي رقم: ١٩٧٢.

٨٠٧- عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُما قال: حَلَقَ رَسُولُ الله صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي حَجَّتِهِ. (الحديث ١٧٢٦ – طرفاه في: ٤٤١٠، ٤٤١١)[٢١٣]:

ئیبنوعومەر رەزای خوایان لێ بێ فەرمووی: پێغەمبەر درودی خوای لەسەر بێ لەحەجەکەیدا، کە لەساڵی حەجی ماڵاوایی‌دا ئەنجامی‌دا، لەپاش تەواوکردنی کردارەکانی حەج، بۆ ئیحرام شکاندن سەری خۆی تاشی). (تاج/٢/٢١٦ ز/١١١ بەتایبەتی فەرموودەی ژمارە/٢)

٨٠٨- وَعنه رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (اللهُمَّ ارْحَمِ المحَلِّقِينَ). قَالُوا: وَالمقَصِّرِينَ يَا رَسُولَ الله، قَالَ: (اللهُمَّ أرْحَمِ المحَلِّقِينَ) قَالُوا: وَالمقَصِّرِينَ يارسولَ اللهِ، قَالَ: (وَالمقَصِّرِينَ). (الحديث ١٧٢٧)[٢١٤]:

دیسان ئیبنوعومەر رەزای خوایان لێ بێ فەرمووی: حەزرەت درودی خوای لەسەر بێ بۆئەوەی مسوڵمانان حاڵی بکا، کە لەپاش حەج و عەمرە، سەرتاشین باشترە لە سەر کورتکردنەوە، فەرمووی: (ڕەحمەتی خودا لەو کەسانەبێ کە لەپاش تەواوکردنی حەج و عەمرە، قژەسەری خۆیان دەتاشن). یارانیش عەرزیان کرد: قوربان ئەی پێغەمبەری خوداڕەحمەت بکە لەو کەسانەش کە مووی سەریان کورت دەکەنەوە ؟ بەڵام پێغەمبەر درودی خوای لەسەر بێ دیسان فەرموویەوە: (سۆزو ڕەحمەتی خودا لەو کەسانە بێ، کە سەری خۆیان دەتاشن). دیسانەوە یارانی پێغەمبەر عەرزیان کردەوە: ئەی پێغەمبەری خوداڕەحمەت بکە لەوکەسانەش کە مووی سەریان کورت دەکەنەوە ؟ ئەوجا خۆشەویست درودی خوای لەسەر بێ فەرمووی: (سۆزو ڕەحمەتی خودا

---

(٢١٣) أخرجه مسلم في الحج، باب: تفضيل الحلق علي التقصير وجواز التقصير، رقم: ١٣٠٤.

(٢١٤) أخرجه مسلم في الحج، باب: تفضيل الحلق علي التقصير وجواز التقصر، رقم: ١٣٠١.

لەوكەسانەش بۆ کەمووی سەریان کورتدەکەنەوە). (تاج /٢/ ٢١٧ ف-١-ش/د).

٨٠٩- عَنْ أبي هريرة رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قال: قال رَسُولُ الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (اللَّهُمَ أغْفِرْ للمحلِقِينَ). قَالُوا: وَللمقصِّرين. قَالَ: (اللهم أغْفِرْ لِلْمُحَلِقِين) قالُوا: وَ للمُقَصِّرِينْ، قالَهَا ثلاثاً، قَالَ: (وَللمُقَصِّرِين) (الحديث ١٧٢٨)[٢١٥]:

واتاو مەبەست لەم فەرموودەیە لەژمارە/ ٨٠٨دا لێك درایەوە.

٨١٠- عَنْ مُعِايَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَصَّرْتُ عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمِشْقَصٍ. (الحديث ١٧٣٠)[٢١٦]:

موعاوییە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر درودی خوای لەسەر بێ جارێ عەمرەی کرد، لەپاش تەواوکردنی عەمرەکە، من بەدەمە پەیکانێکی پانکۆڵە، مووی سەریم کورت کردەوە.

٨١١- عَنْ وَبْرةَ -رحمه اللهِ تعالى- قَالَ: سَأَلْتُ ابْنَ عُمَر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما: مَتَى أَرْمِي الجِمَارَ؟ قَالَ: إذاَ رَمَى إِمَامُكَ فَارْمِهِ، فَاعَدْتُ عَلَيْهِ المسئَلَةَ، قَالَ: كُنَّا نَتحيَّنُ، فإذا زالَتِ الشَّمْسُ رَمَيْنَا. (الحديث ١٧٤٦)[٢١٧]:

وەبرە رەحمەتی خودای لێ بێ فەرمووی: لە ئیبنوعومەرم پرسی: لەڕۆژەکانی پاش یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربانداچ حەڵێ ڕەجمی شەیتان بکەم ؟

---

(٢١٥) اخره مسلم في الحج، باب: تفصيل الحلق علي التقصير وجواز التقصير، رقم: ١٣٠٢.

(٢١٦) اخرجه مسلم في الحج، باب: التقصير في العمرة، رقم: ١٢٤٦.

(٢١٧) لم يُوَافقه مسلم علي تخريجه، علي ماذكره العسقلاني بصدد هذا الحديث في خاتمة كتاب الحج، بقوله: (وحديث جابر في رمي جمرة العقبة ضحي وبعد ذلك بعد الزوال، وحديث ابن عمر في هذا المعني..).

فەرمووی: میرحەجەکەت کەی ڕەجمی شەیتانی کرد، تۆش ئەوکاتە بیکە، با نەبێ بەتێکەولێکەو هەرکەسێ بۆ خۆی. منیش دووبارە پرسیارەکەم لێی دووبارە کردەوە، فەرمووی: (جاران ئێمە کاتمان ڕادەگرتو چاوەنوارمان دەکرد: کەی خۆر لەناوەڕاستی ئاسمان لای دەدا، ئیتر دەستمان دەکرد بە ڕەجمی شەیتان).

٨١٢- عَنْ عبدالله بن مسعود رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: أنه رَمى مِنْ بَطْنِ الوادى، فقيل له: إنَّ نَاساً يَرْمُونَهَا مِنْ فَوْقِهَا؟ فَقالَ: وَالذي لا إلهِ غَيْرُهُ، هذا مَقَامُ الذي أُنْزِلَتْ عَلَيْهِ سُورَةُ البَقَرَةِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. (الحديث ١٧٤٧- اطرافه فى: ١٧٤٨، ١٧٤٩، ١٧٥٠)[218]:

جارێ عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود (رەزای خوای لێ بێ) لەناو شێوەکەوە، لەخوارەوە بۆ سەرەوە، بەردی فڕەدا بۆ کۆگا بەردەکەی عەقەبە، عەرزیان کرد: هەندێ کەس لەلای سەرووی شیوەکەوە بەردی بۆ فڕە دەدەن؟ فەرمووی: (بە تاقە خواکە، ئائێرەکە من ڕەجمی شەیتانم لێیەوە کرد، جێگەی پێغەمبەر خۆیەتی، کە سوورەتی بەقەرەی بۆ هاتۆتە خوارەوە، کە ئەو سوورەتەیە زۆربەی یاساو دەستوورەکانی حەجو عەمرەی واتیادا، پێغەمبەر خۆشی ئا لەمێدا بەردی فڕەدا بۆ ئەم کۆگا بەردە).

٨١٢ مكرر- وَعنه رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: انه انْتَهي إلَى الجَمْرةِ الكُبرى، جَعَلَ البَيْتَ عَنْ يَسَارِهِ، وَمِنىً عَنْ يَمينِهِ، وَرَمى بِسَبْعٍ، وَقَالَ: هكذا رَمَى الذي أُنْزِلَتْ عليه سُورَةُ البَقَرَةِ. (الحديث ١٧٤٨ - اطرافه سَبَقَتْ فى رقم: ٨١٢/ ١٧٤٧)[219]:

---

(٢١٨) اخرجه مسلم في الحج، باب: رمي جمرة العقبة من بطن الوادي رقم ١٢٩٦٠.

(٢١٩) م / اخرجه مسلم في الحج، رقم: ١٢٩٦.

عەبدوڕەحمانی کوڕی یەزید (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خوای لێ بێ) چوو بۆ ڕەجمی شەیتان، ڕۆیشت هەتا تەشریفی گەیشتە کۆگا بەردە گەورەکە، کەلەزاراوی یاسانامەی پیرۆزی خوادا ناوداره بەجەمره تولکوبرا، ئیتر لەوێدا ڕاوەستاو خانووی بەیتی خستەلای شانی ڕاستیو میناى خستەلای شانی چەپیو ڕووی کرده میلەکەو حەوت بەردی بۆ فڕەدا، ئەوجا فەرمووی: پێغەمبەری خودا، کەسوورەتی بەقەرەی بۆ هاتووە لەسەر ئەم شێوەیە ڕەجمی ئەم کۆگا بەردەی کرد. (اج/٢/٢١٠ف١).

٨١٣- عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُما: أَنَّهُ كَانَ يَرْمِي الجَمْرَةَ الدُّنْيا بَسَبْعِ حَصَياتٍ، يُكَبِّرُ على إثرِكُلِ حَصَاةٍ، ثُمَّ يَتَقَدَّمُ حَتى يُسْهِلَ فَيَقومُ مستقبلَ القِبلَةِ فيقومُ طويلاً، وَيَدْعُوا وَيَرْفعُ يَدَيْهِ، ثُمَّ يرْمِي الوُسْطى ثُمَّ يأخُذُ ذاتَ الشِمالِ فَيُسْهِلُ، وَيَقوُمُ مُسْتَقبِلَ القِبلَةِ، فيقومُ طَويلاً وَيَدعُوا وَيَرْفَعُ يَدَيْهِ وَيقوم طويلاً، ثم يَرْمي جَمَرَةَ ذاتَ العَقَلَةِ مِنْ بَطْنِ الوادي ولاَيَقِفُ عِنْدها، ثُمَّ يَنْصَرِفُ، فَيَقولُ: هكذا رَأيتُ النبيّ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَفعَلُهُ. (الحديث ١٧٥١ — طرفاه في:١٧٥٣، ١٧٥٢)[٢٢٠]:

سالی کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: باوکم فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) کە ڕەجمی شەیتانی دەکرد، لەڕۆژی دووەمی جەژندا، لەسەر ئەم شێوەیە دەیکرد: یەکەم جار حەوت بەردی فڕێ دەدا بۆ کۆگا بەردەکەی ئەولای مزگەوتەکەی میناوە، کەوا ڕێکەوتووە لەهەموو کۆگاکانی تر لەمیناوە نزیکترەو لەمەککەوە دوورترە، لەپاش هەڵدانی هەموو بەردێ ئەڵلاهو ئەکبری دەکرد دەیفەرموو:

(٢٢٠) قالَ العيني: هذا الحديث من أفراد البخاري (عيني/١٠/٩١) — المترجم).

(الله أكبر، الله اكبر، لاإله إلا الله، والله اكبر، الله اكبر ولله الحمد) ئینجا دەچووە پێشەوە هەتا دەگەیشتە دەشتایی، لەوێ بەرەو ڕووگە ڕادەوەستاو، هەردوو دەستی لەکاتی پاڕانەوەو نزاکردندا بەرزەوە دەکرد، وە بەپێوە لەوێدا زۆر دەپاڕایەوە، ئنجا دەڕۆیشت بۆ کۆگا بەردەکەی دووەم، واتە: بۆ کۆگا بەردی ناوەڕاست (الجمرة الوسطى) وە حەوت بەردی تری فڕە دەدا بۆ ئەو میلەیش، وەلەپاش تێگرتنی هەموو بەردێ ئەڵڵاهو ئەکبەری لەسەر شێوەی پێشوو دەکرد، ئنجا بەلای چەپا لەلای شیوەکەوە دادەپەڕی، هەتا دەگەیشتە ناو دەشتایی‌و لەوێ ماوەیەکی دوورودرێژ بەپێوە ڕاوەستاو هەردوو دەستی بەرزەوە دەکردو زۆر زۆر نزای دەکردو دەپاڕایەوە، ئەنجا دەڕۆیشت بۆ کۆگا بەردەکەی کن عەقەلە، لەناو شیوەکەوە، لەخوارەوە بۆ سەرەوە، حەوت بەردی فڕەدەدا بۆ ئەم میلەش، لەوەپاش تێگرتنی هەر بەردێ لەسەر شێوەی پێشوو ئەڵڵاهوئەکبەری دەکرد، ئیتر دەگەڕایەوەو لەوێ نەدەوەستا). (تاج/٢/٢٢٤ ز/١١١٤- ب/د).

## ڕوونکردنەوە:

کە دەچینەوە سەر صەحیحی بوخاری لەم شوێنەدا دەبینین، پێشەوا بوخاری لەم شوێنەدا بەرودوا ئەم فەرموودەیەی کردووە بە بەڵگە بۆ سێ بابەت، وە بە سێ لەفز (بێژە)ی کەمێ جیاجیا وە بە سێ ڕشتەی جیاجیا، کە ژمارە/١٧٥١و١٧٥٢،١٧٥٣ ێن لەفەتحولباری لەم شوێنەدا، گێڕاویەتیەوە. بەندە لەکاتی وەرگێڕانی فەرموودەکاندا سوود لەم لایەنە، وەردەگرم، لەگەڵ گێڕانەوەکانی تاج الاصول دا، وەتەرجەمە کوردییەکە لە ژمارە/١٧٥٣وە نزیکترە.

ئەم گێڕانەوەی ئێرە دەفەرموێ: ئیبنوعومەر ڕەزای خوایان لێ بێت خۆی

وایدەکرد، وە لەکۆتاییدا، کەلە ڕەجم کردنی هەرسێ کۆگاکان دەبێتەوە دەفەرموێ: (بە چاوی خۆم پێغەمبەرم دی ئاوا لەسەر ئەم شێوەیە ڕەجمی ئەم سێ میلەی ئەنجامدا).

٨١٤- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: أُمِرَ النَّاسُ أَنْ يَكُونَ آخِرُ عَهْدِهِمْ بالبَيْتِ إلاّ أَنَّهُ خُفِفَ عَنِ الحَائِضِ). (الحديث ١٧٥٥) (تاج/٢/٢٤٨ز-١٢١) [٢٢١].

ئیبنوعەبباس (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: فەرمان کراوە بەحاجیان کە ئاخر شت دەیکەن تەوافی مالاوایی خانەی خودابێ، کەناوداره بەتەوافی وەداع، بەلام بۆ ئافرەتی بێنوێژ چاوپۆشی لەم تەوافە کراوە، هەروایش بۆ زەیستانیش چاوپۆشی لەم تەوافە کراوە).

٨١٥- عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: أَنَّ النبيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صلَى الظُّهرَ وَلعَصْرَ والمَغْرِبَ وَالعِشاءَ، ثُمَّ رَقَدَ رَقْدَةً بِالمَحصَّبِ، ثمَّ رَكَبَ إلى البيتِ فَطَافَ بِهِ). (الحديث ١٧٥٦ - طرافه في: ١٧٦٤) (تاج/٢/٢٢٦) [٢٢٢].

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- نوێژی نیوەڕۆو عەصرو شێوانو خەوتنانی کرد، ئەوجا لە موحەصەب کە پانایییەکە وا لەنێوانی مەککەو مینادا، سەرخەوێکی شکاند، ئەوجا سواربوو ڕۆیشت بۆ بەیت، لەوێ تەوافی مالاوایی کرد).

٨١٦- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: رُخِّصَ لِلحَائِضِ أَنْ تَنْفِرَ إذا

---

(٢٢١) أخرجه مسلم في الحج، باب: وجوب طواف الوداع وسقوطه رقم: ١٣٢٨.

(٢٢٢) والحديث من أفرادهِ (عيني/١٠/٢٩٥ — المترجم).

أَفَاضَتْ (الحديث ١٧٦٠) قَالَ: وَسَمِعْتَ ابْنَ عُمَرَ يَقولُ: إِنَّهَا لاتَنْفِرُ، ثُمَّ سَمِعْتُهُ يَقُـولُ بَعْـدُ: إِنَّ الـنبِيَّ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ- رَخَّـصَ لَهُـنَّ. (الحـديث ١٧٦١)[٢٢٣]:

تـاووس لـه ئيبنوعەباسـەوە (رەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی: ڕێگـەی ئـافرەتی بێنوێژ دراوە: کە بگەڕێتەوە بۆ وڵاتی خۆی‌و تەوافی ماڵاوایی نەکا، ئەگەر لەوەپێش بەپاکی تەوافی ئیفازەی کردبوو، تەوافی ئیفازە فەرزە.

تـاووس -ڕەحمـەتی خـودای لێ بـێ- فـەرمووی: وە لـە ئیبنوعومـەرم بیسـت، لـە سـەرەتاوە ئـاوا فـەتوای دەدا، دەیفـەرموو: ژنـی بێنوێـژ نابـێ بگەڕێتـەوە بـۆ وڵاتـی خـۆی، دەبـێ چاوەڕوان بکـا، لـە مەککـە، هـەتا لـە بێنوێژی پاك دەبێتەوە، ئەوسا بەپاکی تەوافی ماڵاوایی ئەنجام بـدا ئـەوجا بگەڕێتـەوە. بـەڵام لـەوە پـاش لـەم فەرمایشـتەی خۆی پـەشمیان بـووەوەو بەگوێی خـۆم لێـیم بیسـت دەیفـەرموو: (پێغەمبـەر -دروودی خوای لەسەر بێ- ڕێگـەی بـەم جـۆرە ژنانـە داوە کـە بگەڕێنـەوە بـۆ وڵاتـی خۆیـان بـا تـەوافی وەداعیشیان نەکردبێ).

٨١٧- عن ابن عباس رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: لَيْسَ التَّحْصِيبُ بِشَيْءٍ إِنَّمَـا هُـوَ مَنْزِلٌ نَزَلَهُ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. (الحديث: ١٧٦٦)[٢٢٤]:

ئیبنو عـەبباس (رەزای خوای لێ بێ) بـۆ مەسـەلەی دابـەزین لـە موحەصـصەب، کاتێ حاجی لە مینا ڕەو دەکا بەرەو مەککە، بۆ تەوافی مـاڵاوایی فـەرمووی ئەو وچان گرتن‌و سەرخەوشکاندنە لە موحەصصەب، لـە یاسـاو ڕێساکانی حەج نییە، بەڵکوو ئەوە کاتی خۆی هەوارێ بوو، پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- لـەوێ دابـەزی و، وچـانێی گـرت‌و سـەرخەوێکی شـکاند، چـونکە ئـەوەبوو بەهۆی ئەوە کە دەرچونیان بۆ مەدینە ئاسانتر بکات).

---

(٢٢٣) لاحظ خاتمة كتاب الحج في الفتح الباري، يشعر بانه من المتفق عليه. المترجم).

(٢٢٤) أخرجه مسلم في الحج، باب: استحباب النزول بالمحصب يوم النفر، رقم ١٣١٢.

٨١٨- عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: أَنَّهُ كَانَ إذا أَقْبَلَ بَاتَ بِذِي طُوًى، حتى إذا أصْبَحَ دَخَلَ، وَإِذَا نَفَرَ مَرَّ بِذِي طُوىً وَبَاتَ بِهَا حَتَّى يُصْبِحَ، وَكَانَ يَذْكُرُ أَنَّ النَبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَفْعَلُ ذَلِكَ (الحَديث ١٧٦٩ فى فَتْح البَارِي شرح صَحِيح البخارى للإمام إبن حَجَرِ العَسقَلاني رَحِمَهُ اللهُ تَعَالَى)[٢٢٥].

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

## پایانێ

ماموٚستای عەسقەلانی ڕەحمەتی خودای لێبێ دەفەرمووێ: نامەی حەج لەسەرەتایەوە، هەتا ئێرە کەنامەی عەمرەیە، سێسەدو دوازدە فەرمودەی لەخۆ گرتووە، بێ ڕشت (تەعلیق)ەکانیان پەنجاوحەوت فەرمودەن، ئەوانی تریان کە دووسەدو پەنجاوپێنج فەرموودەن- گشتیان پەیوەست (موصول)ن، دووبارەبوەکانیان - واتە: ئەوانەیان کە لەچەند شوێنێکا، لە سەرەتای پەڕاوەکەوە، هەتا ئێرە کەکۆتایی نامەی حەجە - دووبارەبووەکانیان سەدو نەوەدو یەك فەرموودەن، پوختەکەیان: (٣١٢-١٩١=١٢١) سەدو بیستو یەك فەرمودەن، پێشەوا موسلیمیش – پڕگۆڕی پیرۆزی لەنوور بێ– هەموو فەرمووده پاڵفتەکانی گێڕاوەتەوە، بێجگە لەم فەرمودانەی دواوە، کە ئاماژەیان بۆ دەکەین، نەوەدو یەك فەرموودەیان لە تەجریدەکەدا هەن، لە ژمارە (٧٢٨) وە هەتا ژمارە (٨١٨)ئاوا: ٨١٨–٧٢٧ =٩١.

ئەو فەرموودانەی کە لە ئەفرادی بوخارین، واتە: ئیمامی موسلیم - ڕەحمەتی خوای لێ بێ- نەیگێڕاونەتەوە ئەمانەن:

---

(٢٢٥) لاحظ خاتمة كتاب الحج، حيث أشار العسقلاني إلي أن هذا الحديث من المتفق عليه بين الشيخين، إذ لم يحكم فيه بافراد البخاري فيه عن مسلم – المترجم).

١. فەرمودەکەی جابیر، ژمارە (١٥١٥، لەفەتحولباریدا، لەتەجریدەکەدا نییە.

٢. فەرمووودەکەی ئەنەس، ژمارە (٧٣٠ ت = ١٥١٧ف).

٣. فەرمووودەکی عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) (لكن أفضل الجهاد حَجٌ مَبْـرُور) (٧٣١ت = ١٥٢٠ ف).

٤. فەرمووودەکەی ئیبنوعەبباس (وَتزوَّدُوا فإنَّ خَيرَ الزَّادِ التقوى) (١٥٢٣ ف) لە تەجریدەکەدا نییە.

٥. فەرمووودەی (حدَّ لأهل نَجْدٍ قرناً. ١٥٢٢/ف) لەتەجریدەکەدا نییە.

٦. فەرمووودەکەی عومەر: (وَقُلْ: عُمْرةً فی حَجَةٍ). (٧٣٦ت = ١٥٣٤).

٧. فەرمووودەی ابن عباس (انطلق من المدينة بعدما ترجَلَ وادهن). (٧٤٣ت = ١٥٤٥ف).

٨. وَحَدِيثُهُ أَنَّهُ سُئِلَ عَنْ مُتْعةِ الحج، ئەگەر مەبەست لەم فەرمووودەیە ژمارە (٧٥٥ت = ١٥٦٧ف) بێ، ئەوا ئەم فەرمودەیەیش ئیمامی موسلیم گێڕاویەتیەوە، بڕوانە پەراوێزی ژمارە (٧٥٥ ت = ١٥٦٧ف).

٩. فەرمووودەی ئەبو سەعیدی خودری: (لیحجنَّ البَیْتُ وَلَیُعْتَمُرنَّ بَعْدَ خَرُوج يأجوجَ وَمأجُوجَ) (٧٦٥ ت=١٥٩٣ف).

١٠. فەرمووودەکەی ابن عباس (لەبارەی ڕووخاندنی کابەوە) (٧٦٦ ت-١٥٩٥ ف).

١١. فەرمووودەی ژمارە (٧٦٩ت = ١٦٠١ف).

١٢. فەرمووودەکەی ئیبنوعومەر لەبارەی دەستهێنانو ماچکردنی حەجەرول ئەسوەدەوە (٧٧٥ت = ١٦١١ف).

١٣. فەرمووودەی ئیبنو عەبباس (٧٧٨ت = ١٦٢٠ف).

١٤. فەرمودەی عائیشە (تطوف حجرةً مِنَ الرجال). (١٦١٨ف) لەتەجریکەدا نییە.

١٥. فەرموودەی زوهری (لم يطف النبي إلاصلى ركعتين). (ژمارەی نییه وا لـه پێش ژماره/١٦٢٣ لەفەتح دا.

١٦. ئیبنو عەباس (قَدِمَ النَبِىّ صَـلّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلّمَ مَكَـة فَطـافَ وسـعى= ١٦٢٥ ف) له (ت) نییه.

١٧. عائشه (كراهة الطواف بعد الصبح = ١٦٢٨ف) له (ت) نییه.

١٨. ئیبنو عەبباس (في الشرب من سقاية العباس) (١٦٣٥ف= ٧٨٢ت).

١٩. ابن عمر (تعجيل الوقوف بعرفة). (٧٨٩ ت = ١٦٦٠ف).

٢٠. فەرموودەی (ليس البر بالإيضاع). (٧٩٢ت = ر١٦٧١ف).

٢١. ئیبنو عەباس (تقديم الضعفة..). (١٦٧٨ف) له (ت) نییه.

٢٢. عومەر (إفاضة المشركين من مزدلفة). (٧٩٦ت = ١٦٨٤ت).

٢٣. فەرموودەکەی میسوەرو مەڕوان (في الهدى). (٧٩٩ت—١٦٩٤ف).

٢٤. ئیبنوعوەمەر (النحر فى المنحر). (٨٠٣ت = ١٧١٠ف).

٢٥. جابیر (في السؤال عن الحلق قبل الذبح = ١٧٢١ف). لەتەجریدەکەدا نییه.

٢٦. فەرموودەی ئیبنوعومەر (حَلَقَ في حَجَّتِهِ). (٨٠٧ت = ١٧٢٦ف).

٢٧. حەدیسی ئیبنو عەبباس (اخـر الزِيـارَةَ إلَـى اللَيْـلِ). بێ ژمارەیه وا لەپێش ژماره (١٧٣٢ف)ەوە.

٢٨. فەرموودەی جابیر (فى رَمْي جمرة العقبة ضحى وبعد ذلـك بَعْـدَ الـزوال) تەعلیقه، ژمارەی نییه وا لەپێش ژماره/١٧٤٦ف. لەتەجریدەکەدا نییه.

٢٩. فەرموودەی ئیبنو عومەر (٨١١ت = ١٧٤٦ف).

٣٠. فەرموودەی ئیبنوعومەر (كان يرمي الجَمْرَة الدنيا بسبع..). (٨١٣ت = ١٧٥١ف).

٣١. فــەرموودەی ئیبنوعومــەر (فـــی نـــزول المحـــصب). (١٧٦٧ف) لــە تەجریدەکەدا نییە.

٣٢. فەرموودەی ئیبنو عەبباس (كَانَ ذُو المجاز وعكـاظ). لـە تەجریدەکەدا نییە لەفەتح دا ژمارەکەی (١٧٧٠ف).

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

## ٣٣- باسەکانی عەمرە (أبواب العمرة)

٨١٩- عَنْ أبي هُرَيْرَة رَضِي اللَّهُ عَنْهُ: أنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وسلم قالَ: (العُمْرَةُ إلى العُمْرةِ كَفَارَةٌ لَما بَيْنَهُمَا، والحَجُّ المَبْرُورُ لَيْسَ لَهُ جَزاءُ إلاَّ الجَنَّةَ). (الحديث: ١٧٧٣)[٢٢٦]:

ئــەبو هــورەیرە (رەزای خــوای لێ بــێ) فــەرمووی: پێغەمبــەر -دروودی خــوای لەســەر بــێ- دەفــەرموێ: (ئــەم عــەمرە هــەتا ئــەو عــەمرە برێتــی گونــاهی نێــوانی هەردووکیان دەکەوێ، حەجی قەبوولێش هەر بەهەشتە پاداشیو بەس). (تاج/٢/١٤٩ ز/٧٨ + ریاض/٣/٩٣٣ ف/٥ ز/٢٣٣).

٨٢٠- عن ابن عمر رَضِي اللَّهُ عَنْهُ: أنه سُئِلَ عَنِ العُمْرَةِ قَبْلَ الحج؟ فَقَالَ: لابَاسَ وَقَـالَ: اعتَمَـرَ النبي صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ قَبْـلَ أن يَحُـجَّ (الحـديث ١٧٧٤)[٢٢٧]:

لە ئیبنوعومەر پرسیار کرا: ئایا لەپێش حەج دا، کەسێ لە ژیانیدا

---

(٢٢٦) اخرجه مسلم في الحج، باب: فضل الحج والعمرة ويوم عرفة، رقم: ١٣٤٩.

(٢٢٧) والحديث أخرجه مسلم (عيني/١٠/١١١) — المترجم).

حەجی نەکردبێ، دروستە عەمرە بەتەنها بکا؟ فەرمووی: (قەیدی نییە، چونکە پێغەمبەر خۆی دروودی خوای لەسەر بێ لەپێش ئەوەدا، کە حەج بکا، چەند عەمرەیەکی کرد، ساڵی عەمرەتولقەضاو عەمرەی جەعرانە).

٨٢١- عن مجاهدٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قال: دَخَلْتُ أَنَا وَعُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ الْمَسْجِدَ، فَإِذَا عَبْدُاللهِ بْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، جَالِسُ إِلىٰحُجْرةِ عَائِشَةَ، وَإِذَا نَاسٌ يُصَلُّونَ فِي الْمَسْجِدِ صَلاَةَ الضُّحَى قَالَ: فَسَأَلْنَاهُ عَنْ صَلاَتِهِمْ، فَقَالَ: بِدْعَةٌ. ثُمَّ قَالَ لَهُ: كَمِ اعْتَمَرَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ قَالَ: أَرْبَعاً: إِحْدَاهُنَّ فِي رَجَبَ فَكَرِهْنَا أَنْ نَرُدَّ عَلَيْهِ (الحديث ١٧٧٥ - طرفه في: ٤٢٥٣)[٢٢٨].

موجاهید (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: مـن و عـوروەی کوڕی زوبەیر چوین بۆ مزگەوت، کە چووینە ژورەوە تەماشامان کرد ئیبنوعومەر دانیشتووە، پشتی داوە بەهۆدەکەی عائیشەی هاوسەری پێغەمبەرەوە، کە تەماشامان کرد وا کۆمەڵێ لەناو مزگەوتەکەی پێغەمبەردا نوێژی چێشتەنگاو دەکەن. فەرمووی: لەبارەی ئەم نوێژکردنەی ئەم کۆمەڵەوە لەئیبنوعومەرمان پرسی: ئەمە حوکمی چییە؟ فەرمووی: بیدعەتە، کاری تازە قەڵلایە، لەپاشان عوروە لە ئیبنو عومەری پرسی: قوربان! پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێ چەند عەمرەی کردووە؟

فەرمووی: چوار عەمرە، یەکێکیان لەڕەجەبا بوو، ئیتر حەزمان نەکرد کە ڕەدد لەئیبنوعومەر بدەینەوە. فەرمووی: گوێمان لەدەنگی سیواك کردنی عائیشە بوو، کە لەژوورەوە لەهۆدەکەی خۆیدا، کەدەرگاکەی لەسەرماڵی مزگەوت بوو، بەسیواکێ سیواکی دەرکرد، جا عوروەی خوشکەزای عەرزی کرد: پووری:

(٢٢٨) أخرجه مسلم في الحج، باب: بيان عدد عمر النبي ﷺ وزمانهن رقم: ١٢٥٥.

ئەی دایکی ئیمانداران! خۆ گوێت لێیە ئەبوعەبدوڕەحمان - واتە: ئیبنوعومەر- چی دەفەرموێ ؟

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: چی دەفەرموێ:

فەرمووی: دەفەرموێ: (پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- چوار عەمرەی کردووە، عەمرەیەکیان لە مانگی ڕەجەبا بووە).

فەرمووی: ڕەحمەتی خودا لە باوکی عەبدوڕەحمان، چ زوو وا لە بیری چوو، خۆ پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- چەند عەمرەی کردبێ ئەوی لەگەڵ دا بووە، بەڵام پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- هەرگیز لە ڕەجەبدا عەمرەی نەکردووە).

٨٢٢- عَن انس بْنِ مالك رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ أَنَّهُ سُئِلَ: كَمْ اعْتَمَرَ النبيُّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ؟ قَالَ: اَرْبَعاً: عُمْرَةُ الحيبيَّةِ فى ذِى القَعْدَةِ حَيْثُ صَدَّهُ المُشرِكُونَ، وَعُمْرَةُ مِنَ العَامِ المقْبِلِ في ذِي القَعْدِةِ، حَيْثُ صَالَحَهُمْ، وَعُمْرَةُ الجِعْرانَة، إِذْ قَسَمَ غَنيمَةَ ـ أُراهُ ـ حُنَيْنٍ، قُلْتُ: كَمْ حَجَّ؟ قَالَ: وَاحِدَةً (الحديث ١٧٧٨ – أطرافه في: ١٧٧٩، ١٧٨٠، ٣٠٦٦، ٤١٤٨) + (تاج/٢/٢٤٢ ز/ ١١٨)[٢٢٩]:

پرسیارکرا لەپێشەوا ئەنەسی کوڕی مالیك: پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- چەند عەمرەی کردووە؟

فەرمووی: (چوار عەمرە: عەمرەکەی ساڵی ڕێکەوتنەکەی حودەیبیەیە، کە لەمانگی ناوجەژناندا بوو، کە هاوبەشەیداکەرەکان نەیان هێشت کە تەواوی بکا، وە عەمرەکی ساڵی ئایندە، کەئەویش هەر لەمانگی ناو جەژنان دابوو، کە لەسەر ئەوە ڕێك کەوتبوون، کە

(٢٢٩) اخره مسلم في الحج باب: بيان عدد عُمَر النبي ﷺ وزمانهن رقم: ١٢٥٣.

پێغەمبەرو یارانی ئەو ساڵە بگەڕێنەوە و لەساڵی ئاییندەدا بێن بۆ عەمرە، وەعەمرەکەی جیعرانە، کە لە ساڵی ئازادکردنی مەککەدا بوو، کە لەوکاتەدا ئەم عەمرەیەی کرد، کە غەزای حونەین لەساڵی هەشتی کۆچیدا، لەمانگی شەشەڵاندا ڕوویدا، کە لە پاش سەرکەوتن بەسەر دوشمنـدا، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) تاڵانییەکەی دابەشکرد بەسەر جەنگاوەرەکاندا. عەرزیم کرد: ئەی لەپاش فەرزبوونی حەج لەسەر مسوڵمانان، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) چەند حەجی کردووە؟

فەرمووی: (یەك حەج کەحەجی ماڵاوایی بوو، کە لەگەڵ ئەم حەجەیدا عەمرەیەکیشی کرد، ئەوەبوو بە چوار عەمرە).

٨٢٣- عَنِ البراءِ بن عازب رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قال: أعْتَمـرَ رَسُـولُ الله صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: أعْتَمرَ رَسولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ في ذي القَعْدَةِ قَبْـلَ أنْ يَحُجَّ مَرَّتَيْنِ. (الحديث ١٧٨١ – اطرافه في: ١٨٤٤، ٢٦٩٨، ٢٦٩٩، ٢٧٠٠، ٣١٨٤، ٤٢٥١)[٢٣٠]:

بەرائی کوڕی عازیب (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەمانگی ناوجەژنان (زیلقەعدە) دا، لەپێش ئەوەدا کەحەج بکا، دوو عومرەی کردووە.

٨٢٤- عَنْ عبدالرحمن بن أبي بكر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أنَّ النبي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ أَمَرَهُ أَنْ يُرْدِفَ عَائِشَةَ وَيُعْمِرَهَا مِنَ التنعيمِ. (الحديث ١٧٨٤ – طرفه في: ٢٩٨٥)[٢٣١]:

عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبوبەکری صەدیق (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمانی پێ کردم، کە عائیشەی خوشکم لە پاشکۆی

---

(٢٣٠) لم يوافقه مسلم علي تخريجه (خاتمة كتاب العمرةج/٣/٦٢٤ فتح خاتمة – المترجم).

(٢٣١) أخرجه مسلم في الحج، باب: بيان وُجُوهِ الإحرام. رقم: ٢١٦.

خۆمـەوە سوار بكـەم و بـچم لـە تـەنعيم ئيحرامـى عـەمرەى پـێ ببەسـتم و عەمرەيـەكى پـێ تـەواو بكـەم، منـيش وامكـرد (تـاج/٢/١٧٩ ز/٩٢ + تـاج/٢/١٩٨ ز/١٠٠ ف/١ + بڕوانە: ژمارە/٧٤٩ كە لە پێشەوە لەم بەرگەدا ڕابورد).

٨٢٥- عَن جابر بن عبدالله رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ: أَنَّ سُراقَةَ بْنَ مالِكِ بن جُعْشُمٍ لَقِيَ النبيَّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ بالَعَقَبَـةِ وَهُـوَ يَرْمِيهـا، فَقـالَ: أَلَكُـمْ هـذِهِ خاصَّةً يارَسُولَ الله؟ قالَ: (لا، بَلْ لِلأَبَدِ). (١٧٨٥)[٢٣٢]:

جابيرى كوڕى عەبدوڵلا (ڕەزاى خواى لێ بێ) فەرمووى: سوراقەى كوڕى مـاليكى كوڕى جوعشوم، لەحەجى ماڵاواييدا، لەعەقەبە گەيـشت بەپێغەمبەر -درودى خواى لەسەر بێ- پێغەمبەر -درودى خواى لەسەر بێ- خـەريكى ڕەجمـى شـەيتانەكەى عەقەبـە بـوو، سوراقە عـەرزى كـرد: ئـەى پێغەمبـەرى خـودا! ئەمـەى كـە عـەمرە لەمانگەكانى حەج دا دروستە، يا ئەوەى كە عەمرەو حەج تێكەڵ بكرێن‌و لەسەر شـێوەى قـيران بكـرێن، هـەر بـۆ تـۆ وايـە بەتايبـەتى، يـا بـۆ هـەموو مسوڵمانان وايە هەتا هەتايە؟

فەرمووى -درودى خواى لەسەر بێ-: (نـەء، هەر بۆ من بەتايبـەتى وانييـە، بـەڵكوو بۆ هەموو نـەتەوەى ئيسلام وايە هەتا هەتايە).

٨٢٦- عَنْ عائِشَةَ رضي الله عنها قالَـتْ: خَرَجْنَـا مَـعَ رسـول الله صـلى الله عليه وسلم مُوافِينَ لِهِلالِ ذي الحِجَّةِ، فَقَال رسولُ الله صلى الله عليه وسـلم: (مَـنْ أَحَبَّ أَنْ يُهِلَّ بِعُمْرَةٍ فَلْيُهِلَّ، وَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يُهِلَّ بِحَجَّةٍ فَلْيُهِلَّ، وَلَـوْلا أَنـي أَهْـدَيْتُ لاهْلَلْتُ بِعُمْرَةٍ). فمنهم مَنْ أَهلَّ بِعُمْرَةٍ، وَمنهم مَنْ أَهَلَّ بِحَجَّةٍ، وَكُنْتُ مِمَّـنْ أَهْـلَّ بِعُمْرةٍ، فَحِضْتُ قَبْلَ أَنْ أَدْخُلَ مَكَّةَ، فَأَدْرَكَني يَوْمُ عَرَفَةَ أَنـا حـائِضُ، فَـشَكَوْتُ إلى رسولِ الله صلى الله عليه وسلم فَقَالَ: (دَعي عُمْرَتَكِ، وانقَضي رأْسَكِ وَامْتَـشِطي،

---

(٢٣٢) اخرجه مسلم في الحج، باب: بيان وجوه الإحرام.. رقم: ١٢١٦.

وَأَهلي بالحَجِ). فَفَعَلْتُ، فَلَمَّا كانَتْ لَيلَةُ الحِصْبَةِ، أرْسَلَ مَعيَ عَبدالرحمنِ إلى التَّنعيم، فَأرْدَفَها فَأَهَلَّتْ بِعُمْرَةٍ مَكانَ عُمْرَتِها، فَقضى الله حجَّهَا وَعُمْرَتَهَا، وَلَم يَكُنْ في شَيءٍ مِنْ ذلِكَ هَدْيٌ وَلاَ صَدَقةٌ وَلاَ صَوْمٌ. (الحديث ١٧٨٦)[٢٣٣]:

عائيشه (رەزای خوای لێ بێ) هاوسەری پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: لەحەجی ماڵاواییدا، لەگەڵ پێغەمبەردا، لەمەدینە دەرچووین بۆ مەككە بۆ حەج، مانگی ناوجەژنان (ذولقعدة) پێنج شەوی مابوو، لەرێ مانگی نوێی قوربانمان لێ هەڵهات، لە رۆژی چواری نۆمینەدا هەڵڕژاینە ناو مەككەوە، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەركەسێ حەزدەكا بائیحرامی عەمرە ببەستێ، وە هەركەسێ دەیەوێ با ئیحرامی حەج ببەستێ، وەمن خۆم لەبەرئەوە نەبێ كە ئاژەڵی دیاریخانەی خودام لەگەڵ خۆم هێناوە، دەنا منیش ئیحرامی عەمرەم دەبەست).

جا حەجكاران هەیانبوو ئیحرامیان بەعەمرە بەست، وە هەیانبوو ئیحرامیان بە حەج بەست، عائیشە فەرمووی: من خۆم یەكێك بووم لەوانەی كە ئیحرامیان بە عەمرە بەستبوو، بەڵام پێش ئەوەی كە بچمە ناو مەككەوەو عەمرەكەم لەوێ تەواو بكەم، كەوتمە سەر بێنوێژی، رۆژی عارفە من بێنوێژ بووم، كاتێ سكاڵای ئەم حاڵەم بۆ پێغەمبەر كرد، فەرمووی: (واز لە عەمرەكەت بهێنەو قژەكەت هەڵوەشێنەوەو شانەی بكەو ئیحرامی حەج ببەستە). منیش ئاوام كرد، جا كاتێ حەجمان تەواوكرد، شەوی حەصبە (بڕ: ژ/٧٤٩) گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەم خەڵكە هەموو حەجو عەمرەیان كردووە، تەنیا من نەبێ، كەهەر حەجم بۆ كراوە؟ جا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی بە ئەوڕەحمانی برام،

(٢٣٣) وافقه مسلم علي تخريجه علي قول العسقلاني (رحمه الله تعالي) في خاتمة كتاب العمرة (ج/٣/ ٦٣٤) + (صم/٨/١٤٥ – مذاهب العلماء في تحلل المعتمر) – (المترجم).

ئـەویش لەپاشـکۆی وشـترەکەی خۆیـدا. بردمـی هـەتا چـووینە تـەنعیم، جالەویّ ئیحرامی عەمرەم دابەست، لەباتی ئـەو عەمرەیـەی کـە خەڵکەکـە کردبوویان، ئاوا خودا حەجو عەمرەی لەچارەی عائیشە نووسی، وەبـەهۆی ئەوەوە کە عەمرەکەی تێکەڵ بـە حـەج کـردو، هـەروا بـەهۆی ئـەوەوە کـە عەمرەیەکی سەربەخۆی لە تەنعیمەوە دامەزرانـد نـە ئاژەڵی دیاریکەوتـە سەر، نەخێرو نـەڕۆژوو). (تـاج/٢/١٧٩ ز/٩٢ ف/١ + تـاج/٢/١٩٨ ز/١٠٠ ف/١ + ژ/٧٤٩/١٥٦٠ لەپێشەوە ڕابوورد).

٨٢٦ مكرر– وَعنها رَضِي اللّٰهُ عَنْهـا قالَـتْ: يارَسُـولَ اللهِ، يَـصْدُرُ النَّـاسُ بِنُسُكَيْن وَأَصْدُرُ بِنُسُكٍ؟ فَقيلَ لَهَا: (انتظرى، فإذا طَهُرتِ فـاخْرُجِي إلى التنعيم فأهِلّي، ثُمَّ ائتينَا بِمَكانِ كَذا وَلكنَّهَا عَلـى قَـدْرِ نَفَقَتِـكِ أَوَ نَـصَبِكِ). (الحـديث ١٧٨٧)[٢٣٤]:

دیسان عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! هـەموو حەج کارەکان حەجوعەمرە لەگەڵ خۆیان دەبەنـەوە بۆخۆیان،کـە حـەج و عەمرە دوو پەرستشی جیاجیا، بەس من بەیەك عیبادەتـەوە دەگەڕێمـەوە کە حەجە؟

پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسەر بێ) پێـی فـەرمووم: (چاوەڕوان بکـە هـەتا لـە بێنوێژی پاك دەبیتەوە، ئەوجا بڕۆ بـۆ تـەنعیم، لـەوێوە ئیحرامی عـەمرە دابەستەو کە تەواوت کرد، بێرەوە بۆلامان بۆ فیسارە شوێن. بەڵام ئـەوەش بزانـــە، کـــە خێروفـــەڕی عەمرەکـــەت بـــەپێی خەرجیەکـــەتو ماندووبوونەکەتە لەم عەمرەیەدا). (بڕ: ژ/٧٤٩/١٥٦٠).

٨٢٧– عَنْ أَسْماءِ بِنْتِ أَبي بكر رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ أَنَّهـا كَانَـتْ كُلَّمَـا مَـرَّتْ

---

(٢٣٤) (مكرر)// لم يوافقه مسلم علي تخريجه خاتمة كتاب العمرة المترجم.

بالحَجُون تَقُولَ: صَلَّى اللهُ على محمدٍ، لَقَدْ نَزَلْنا مَعُهُ هاهُنَا وَنَحْنُ يَومَئِذٍ خِفافٌ، قَليلٌ ظَهْرُنا، قَلِيلَةٌ أزْوادُنا، فاعْتَمَرَتُ أنَا وأختِي عَائِشَةُ والزبيرُ وفُلانٌ وَفُلانٌ، فَلما مَسَحْنَا البَيْتَ أحْلَلْنَا، ثُمَّ أَهْلَلْنَا مِنَ العَشي بِالحَجِ. (الحديث ١٧٩٦)[٢٣٥].

ئەسمای کچی ئەبوبەکری صەدیق (رەزای خوای لێ بێ) هەمووجارێ، کە دەگەیشتە حەجوون، کەناوی کێوێکی ناسراوە وا لەمەککە، دەیفەرموو: (صَلَ اللهُ علی محمد = دروودی خودا لەسەر موحەممەد، ئا لەم شوێنەدا لەخزمەتیدا، دابەزین و وچانمان گرت، ئەو ڕۆژگارە بارمان سووك بوو، شمەکی کەممان پێ بوو، ولاخی سواریشمان کەم بو، نان و ئاوو توێشوویەکی سووکەڵەمان پێ بوو، من و عائیشەی خوشکم و زوبەیری هاوسەرم و فیسارو ئەو فیسار، پاش ئەوە حەجەکەمان پووچ کردەوە لەبەرئەوە ئاژەڵی دیاریمان پێ نەبوو، عەمرەمان ئەنجامدا، جاکاتێ لەو عەمرەیەدا، تەوافی بەیتمان کردو سەعی نێوانی صەفاو مەڕوەمان تەواوکردو سەرمان کورت کردەوە ئیتر لەئیحراما نەماین و بووینەوە بەبێ ئیحرام، جا لە پاشا، ڕۆژی تەروییە کە هەشتی مانگی قوربانە، تاقی ئێوارێ، ئیحرامی حەجمان دابەست).

٨٢٨- عَنْ عَبْدِاللهِ بْنِ عُمَرَ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ: أنَ رسولَ الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إذا قَفلَ مِنْ غزْوٍ أوْ حجٍ أَوْ عَمْرَةٍ يكَبرُ عَلى كُلِ شَرَفٍ مِنَ الأرضِ ثَلاثَ تكبيرات، ثم يَقولُ: (لا إلـه إلا الله وَحْدَهُ لاشَريكَ لَهُ، لَهُ المُلْكُ وَلَهُ الحَمْدُ، وَهُوَ عَلى شيءٍ قَديرٌ آيبُونَ تَائِبُونَ عَابِدُونَ ساجِدُونَ لِرَبّنَا حَامِدُونَ، صَدَقَ اله وَعْدَهُ، وَنَصرَ عَبْدَهُ وَهَزَمَ الأَحْزابَ وَحْدَهُ). (الحديث ١٧٩٧ - أطرافه في: ٢٩٩٥، ٣٠٨٤، ٤١١٦، ٦٣٨٥)[٢٣٦].

---

(٢٣٥) أخرجَهُ مُسلِمَ في الحج باب: مايلزم من طافَ بالبيت وَسَعي، رقم: ١٢٣٧.

(٢٣٦) وأخرجه مسلم أيضا في الحج (العيني/١٠/١٣١) - المترجم.

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کاتێ لەغەزا، یا لە حەج، یا لە عەمرە، دەگەڕایەوە، لەڕێ لەسەر هەموو بەرزاییەكو قوتکە و فۆقزایی و تەپۆڵکەیێ کە سەردەکەوتە سەری، بەدەنگێکی بیسراو، لەپێشا سێ جار ئەڵڵاهو ئەکبەری دەکرد، ئەوجا دەیفەرموو: (لا إله إلا اله وحده لاشريك له، له الملكُ ولَهُ الحَمْدُ وَهُوَ عَلى كلِ شيءٍ قَديرُ آيبون تائِبُونَ عابدونَ ساجدون لربنا حامدون، صَدَقَ الله وَعْدَهُ وَنصرَ عَبْدَهُ وَهَزَمَ الأحْزابَ وَحدَهُ). (رياض/٣/٧٩٦ ف/٣) + (تاج/٩/٢٢٠ ف/٤ ز/٧٣).

٨٢٩- عَنِ ابْنِ عباس رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ قالَ: لَمَّا قَدِمَ النبيُّ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَكَّةَ، اسْتَقْبَلَتْهُ أُغَيْلِمَةٌ بَني عَبْدِ المطَّلِب، فَحَمَلَ وَاحِداً بَيْنَ يَدَيْهِ وَآخَرَ خَلْفَهُ (الحديث ١٧٩٨ – طرفا في: ٥٩٦٥، ٥٩٦٦)[٢٣٧].

عەبدوڵڵای کوڕی عەباس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەوکاتەی کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) تەشریفی هات، لەساڵی ئازادکردنی مەککەدا، هات بۆ مەککە، کۆمەڵێ منالانی نەوەی عەبدولموتەلیبی باپیرەی، چوون بەپیریەوە، ئەویش دوانی لێیان هەلگرت، یەکێکیانی لەبەردەمیەوە هەلگرتو ئەوی تریشیانی لەپاشکۆیەوە).

٨٣٠- عَنْ أنس رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ قَالَ: كَانَ النبي صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لايَطْرُقُ أهْلَهُ لَيْلاً، كَانَ لا يَدْخُلُ إلاّ غُدْوَةً أوْ عَشِيَّةً (الحديث ١٨٠٠)[٢٣٨]:

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) وا بوو، کە لە سەفەر دەگەڕایەوە، بەشەو لەناکاودا نەیدەدا بەسەر ماڵو

(٢٣٧) لم يوافقه مسلم علي تخريجه (فتح/٣/٦٣٤ – خاتمة كاب العمرة) – المترجم).

(٢٣٨) أخرجه مسلم في الإمارة، باب: كراهة الطروق.. رقم: ١٩٢٨.

منالّيدا، بەلّكوو ياسەر لەبەيانى، ياسەر لەئێوارێ دەهاتەوە) (رياض/٣/٨٠٢ ف/١ ز/١٧٦).

٨٣١- عن جابرِ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ قَال: نَهى النبيُّ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ أنْ يَطرُقَ أَهْلَهُ ليلاً (الحديث ١٨٠١)[239]:

جابير (رەزاى خواى ل بێ) فـەرمووى: پێغەمبـەر -دروودى خواى لەسەر بێ- رێگەی ئـەوەی نەدەدا كە پياو بە شـەو لـەناكاوا خـۆی بكا بـەمالا، مەبەستی ئـەوەبێ كە ژنەكەی تاقی بكاتەوە ئايا ناپاكی دەكا يا نا، يا لەهەلّەو سـەرسمی خێزانـی خۆی بگەڕێ). (رياض الصالحين /٣/٨٠٢ ف/١).

٨٣٢- عَنْ أَنَسٍ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ قَـالَ: كَـانَ رَسُـولُ اللهِ صَـلّى اللّٰـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ إذا قَدِمَ مِنْ سَفَرٍ، فأبْصَرَ دَرَجاتِ المدينةِ أوضَـعَ ناقَتَـهُ، وَإنْ كانَـتْ دَابَّـةً حَرَّكَهَا. وَزَادَ فِي رِوَايَةٍ: مِنْ حُبِهَا). (الحديث: ١٨٠٢) طرفه في: ١٨٨١ [240]:

ئەنـەس (رەزاى خـواى ل بـێ) فـەرموی: جـاران پێغەمبــەر -دروودى خـواى لەسـەر بێ- كـە لەسەفەر دەهاتـەوە، كە چاوی بـەقات قاتـەكانی (واتـە: پلـەكانی) ڕێگەكـەی مەدينـە دەكـەوت، لـە خۆشەويـستی مەدينـە وشـتريی خێـرا لێ دەخـوڕێ، ئەگـەر بەسـواريی ولاخـی تـريش بوايـە، ولاخەكـەی تيـژ لێـدەخوڕی، ئەوەندەی مەدينە خۆش دەويست). (تاج/ ٢/٢٨٨ — ز —١٤٢).

٨٣٣- عَنْ ابي هريرة رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ عن النَبِيّ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (السَّفَرُ قِطْعَةٌ مِنَ العَذابِ، يَمْنَعُ أحَدَكُمْ طَعَامَهُ وَشَرابهُ وَنَوْمَهُ، فإذا قَضى نَهْمَتَـهُ فَلْيُعجِلْ إلى أَهْلِهِ). (الحديث ١٨٠٤ – طرفاه فی: ٣٠٠١، ٥٤٢٩)[241]:

ئەبوهورەيرە (رەزاى خواى ل بێ) لە خۆشەويستەوە -دروودى خواى لەسەر بێ- دەفەرمووێ:

---

(٢٣٩) اخرجه مسلم في الإمارة، باب: كراهة الطروق وهو الدخول ليلا.. رقم: ٧١٥.

(٢٤٠) والحديث انفرد به البخاري (عيني/١٠/١٣٥) — المترجم).

(٢٤١) أخرجه مسلم في الأمارة، باب: السفر قطعة من العذاب.. رقم ١٩٢٧..

(سەفەر پارچەیێ سزاو مەینەتەو، کۆڵێ ئەرکو ئازارە، ئەوەتا نان و ئاوو خەوو خۆراکتان لێ هەراسان دەکا، دەی کەواتە، هەرکاتێ کە مەبەستی سەفەرەکەتان هاتە دیی، ئیتر بێ درەنگ بگەڕێنەوە بۆلای کەس و کارتان). (ریاض/٨٠١/٣ ز-١٧٥- ش. بەشی کوردی).

## پایانێ

مامۆستای عەسقەلان رەحمەتی خودای لێبێ دەفەرموێ: (باسەکانی عەمرەو باسەکانی دەستوورەکانی گەڕانەوە لە سەفەر، کەوا لەپاش ئەم باسانەی عەمرەوە، چل فەرموودەی بەرزەوە بوی لەخۆی گرتووە، چواریان بێ ڕشتەن، ئەوانەی تریان پەیوەستن، بیستو یەکیان دووبارەن، موسلیمیش رەحمەتی خودای لێبێ هەموویانی گێڕاوەتەوە، جگە لەم فەرموودانە:

١. (١٧٧٤ف) لە (ت)دا نییە.
٢. (أعتمار النبى قبل الحج – حديث البراء فيه) (٨٢٣ت = ١٧٨١ف).
٣. فەرموودەی عائیشە: (العمرة على قدر النصب). (١٧٨٧ف = ٨٢٦ م ت)
٤. (٨٢٩ت = ١٧٩٨ف) حديث ابن عباس فى إرداف اثنين.

هەروا مامۆستای عەسقەلان دەفەرموێ: پێنج بیسراوی مەوقووفیشی وا تیادا، سیانیان پەیوەستن، لەزیمنی حەدیسەکەی بەڕادان. لەتەجریدەکەدا (١٥) یان هەیە ئاوا: (٨٣٣ – ٨١٨ = ١٥).

**تێبینی**:

١. باسی حەج و عەمرە بە دوورو درێژی وا لە بەرگی دووەمی تاج الاصول دا، وەرگێراوە کوردییەکەی، لە لاپەڕە/ ١٤٩ وە هەتا لاپەڕە/٢٩٥. واتە: لە زنجیرەی حەفتاو هەشتەوە، هەتا زنجیرەی/١٤٤.

٢. باسی حەج و عەمرە لە (ریاض الصالحین)دا، وەرگیراوە کوردییەکەی، وا لە بەرگی/٣ م /٩٣١ ز/٢٣٣.

٣. لە فیقهی ئاسان دا، وەرگیراوە کوردییەکەی، وا لەبەرگی یەکەم دا، لاپەڕە/٣٥١ هەتا لاپەڕە/٤٢٨. واتە: لەزنجیرە/١٥٧ هەتا زنجیرە/١٨٤.

بەپشتی خودا موتالاکردنی ئەم شوێنانەش بۆ کەسی خۆی بێ بەهرە نابێ.

وەرگێڕ
نوری فارس حەمەخان
سلێمانی/ مامۆستایان
٢٠٠٢/١٠/٢٥

